19

د. ئەردەشیر خودادادیان

# ئارییەکان و مادەکان



وەرگێڕانی بۆ کوردی
عەلاء نوری بابە عەلی

سلێمانی
2003

# وەزارەتی رۆشنبیری

## بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

www.roshnbiri. org
khanaywargeran@yahoo.com

- ناوی کتێب: ئارییەکان و مادەکان
- نووسینی: د. ئەردەشیر خودادادیان
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: عەلاء نوری بابە عەلی
- تایپ: بەهرە عیزەدین
- نەخشەسازیی کۆمپیوتەری: مەهدی ئەحمەد
- نەخشەسازیی بەرگ: ستار قادر
- زنجیرە: ١٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردنی ( ٢٣٤ )ی ساڵی ( ٢٠٠٣ )ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە
- چاپ: چاپخانەی بەدرخان
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٣- سلێمانی

# پێشەکی دانەر:

دەوروبەری سەدەیەك لەمەوپێش لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوانەی کە لەبواری دێرینناسی، زماننناسی، تاووتوێکردنی مێژوویی دیکە لەلایەن پیترودلاواله، شاردن، نیێبوور، نیلسن دوبواز، راولینسون و چەند کەسێکی دیکەوە نراون، چەند بەرهەمێك لەبواری مێژوو، ژیارو کەلتووری ئێران لەپێش ئیسلامدا نووسراون و دانراون لەلاسەرووی هەموویانەوە دوو دانراوی بەرجەستەیە، یەکێکیان(ئێرانی دێرین) لەنووسینی حەسەن پیرینا (مشیر الدولة)، ئەوی‌دی کتێبی بەنرخی(ئێران لەسەردەمی ساسانی‌یەکاندا) دانراوی ئارتور ئەمانوئیل کریستێن سن، وەرگێڕانی رەشید یاسەمی، کەخزمەتێکی بەرچاوی لەبواری توێژینەوەی مێژوویی بەمامۆستایان و خوێندکارانی زانکۆ گەیاندوە. با شاراوەش نەبێ کە دووکەسایەتی کارا لەمێژوو وکەلتووری ئێراندا، خوالێخۆشبوو عەلی سامی و دکتۆر محەمەد جەواد شکوور بەنووسینی چەند دانراوێکی بەنرخ لەبواری مێژووی ئێرانی دێریندا کۆمەکێکی گەورەو زۆریان بە پەیوەندیدارانی مێژووەوە کردوە. بەڵام بەرهەمەکانی ئەم دوو زانایە هەرگیز لەئاستی گشتگیری(ئێرانی دێرینی پیرنیا) و (ئێرانی لەسەردەمی ساسانییانی کریستن سن)دا نین.

ئەزیش بەدانانی مێژووی ئارییەکان و مادەکان کەهەرگیز بێ‌خەوش و دوور لەکەم و کووڕی‌نییە کەوتمە سەر ئەوڕێیەی کە بە بەهرەوەرگرتن لەئەزموون و توێژینەوە نوێکان لەسنووری مێژووی ئێرانی دێریندا هەنگاوێکی کورت بنێم.

پێویستە ئەوەش لەیاد نەکرێ کەئەز بەبیرو رێنماییەکانی بیرمەندان پشتم بەستوە بەڵکو بەهەندوەرگرتنی بۆچوون و بەهرەوەرگرتن لەوان لە

لێکۆڵینەوەی ئەمەودوا بتوانم چەند دانراوێکی کەم خەوشتر پێشکەش بەئارەزوومەندان بکەم.

ئەردشیری خودا دادیان
مانگی ئەسفەندی ١٣٧٥

# بەشی یەکەم
# ئارییەکان و پێشینەیان

لەم بەشەدا دەربارەی ئاریاکان، پێش هاتنیان بۆ دەشتی بەرینی ئێران(بان ئێران، پشتەی ئێران)، سەرزەمین یا نیشتمانی یەکەمی ئەوان، هۆکارو مەبەستەکانی کۆچکردنیان، شێوەی کۆچ و ڕاڕەوەکانی کۆچیان، دەگەڵ ڕەگەزیان دەدوێم.

چەمکی وشەی(ئاریا) بەچەند جۆرێکی جیاواز لێکدراوەتەوە کە ڕەسەن، خانەدان، میواندۆست وئازاد چەند نموونەیەکن لەواتای وشەکە.

ئاریایی بەکارهێنانی زانستی- مێژوویی یە کەلەلایەن مێژوونووسان وزمان و نەتەوەو ڕەگەز ناسانەوە بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنرێ کە کۆچیان کردوە بۆ هیندۆ ئێران دوای ئەو ناولێنانە میللەتە خزمەکانیان وەك یۆنانی، ڕۆمی و سلاڤی و ئەڵمانی و کلت(سلت) بەناوی (هیندۆ ئەڵمانی)یەوە لای زانایان و توێژەران ناسراون. بەگوزارشتێکی دیکە دەتوانرێ بوترێ کەئێرانییەکان و هیندییەکان لەبەرئەوەی کەلەیەکرەگەزن خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوایەتی و کولتووری هاوبەشی دێرینن. لەگوزارشتی زانستیدا ئەوان گرووهی یا لکی هیندۆ ئەڵمانی خۆر هەڵاتی کەئاریاییشیان پێدەوترێ پێکدێنین.

لەمەڕ سەرەتای کۆچی هەریەك لەم دوولکە بۆچوونی جیاواز هەیە. شوێنێ کەنەتەوەی خۆیی(ئەسڵی) یا ئارییەکان لەسەردەمێکی زۆر دێریندا لێی نیشتەجێبوون بەتەواوی نەزارنراوە. هەندێ ئەو شوێنە بەباکووری کێوەکانی هیندوکوش یاکەمێ لەوە فراوانتر لەرووسیادا، لەدەوروپشتی دەریاچەی ئاراڵ و ڕووباری جەیحوون(Oxus) وسەیحوون(Jexartees)

هەتا درێژایی باکووری خۆرهەڵاتی ئەفغانستانی ئەمڕۆ دەزانن. دەستنیشان نەکردنی نیشتمانی ئەسڵی ئاریەکان لێکۆڵینەوەی لەمەڕ رێگاکانی کۆچکردنیان بۆ وڵاتە جیاجیاکان لای توێژەران دژوارکردوە.

توێژینەوەکانی ئەم دواییە ئەوە نیشان دەدەن کەلەهەزارەی دووەمی پێش زاییندا بەشێ لەئاریاکان، یا باشتر بڵێین لکێ لەئاریاکان یا هیندییەکانی دواتر دەچنە دەڤەرێکەوە پاشتر بەهندستان ناوبراوە. لکێدی دیسان لە خۆرئاواوە دەچنە دەشتێکی بەرزەوە کە ئاریانا(Aryana)یا (Iran)ی پێدەڵێن. لکی پێشوو هیندیان و لکی دوایی ئێرانییانی. دوای ئەم کۆچ و جێنیشتەبوونە چەند سەرزەویی‌یەکی دیکە پێشوازییان لەئارییەکان کردوە وخەڵکانی خانەخوێ لەم زەوییانەدا نەتەوەو زمانی ئەوانیان بە(هیندۆ ئەڵمانی) ناوبردوە. سێ‌نیوەی دورگەی گەورە لەدەریای سپیدا(میدیترانە) واتە فەرەنساو جەزائیرو بەریتانیا، هەروەها زەوییەکانی باکووری ئەسکەندناڤی و نیوەی باکووریی رووسیا بەشێکن لەو سەرزەوییانە. چەند بەشێکیش لەئاسیای بچووك و ئاسیای ناوەندی کەبایەخێکی ئەوتۆیان نییە.

لەم رووەوە لێکۆڵینەوەکان وای نیشان دەدەن کەئەم باسە باشووری رووسیاش دەگرێتەوە. هەروەها ناوبردنی هیندو ئەڵمانی پەیوەندی بەوەوە هەیە. لەتوێژینەوەی کەلتووری و کۆمەڵایەتی هاوبەشی ئەو خەڵکە لەمێژدا، شوێنەوارناسان گەلێ وشەی هاوواتایان دیوەتەوە کەبۆنموونە دەوترێ: وشەی خودا لەفارسی ئێرانی پێشین دا ((دئوا deava))، لەیۆنانیدا(( تئووس theos))و((زیئووس Zeus)) لەلاتینیدا ((دئووس deus)) لە لیتوانیدا((دیو dev)) ولەفارسی ئەمڕۆدا ((دیو div))ە. پێویستە ئەوە وەبیر بهێنرێتەوە کە لەزمانەکانی ئێراندا بەواتای دێوو شەیتان وەلە

زمانەکانی یۆنانی، لاتین، سانسکریت– هتد بەواتای (خودا)ن و لەزمانەکانی فارسی کۆنی سەردەمی هەخامەنشی (دیوا) بە واتای بتە.

لەسەرچاوە ئەفسانەیی و ئایینی‌یەکانی ئێرانی پێشیندا سەرزەوی ((ئێریانم واژو Airyanem Veajo)) کە بەپەهلەوی (( ئیران ویج .Eran Vas)) یا ئێران وەژ Eran. Eež و بەفارسی ئەمڕۆ( ئیران ویج .Eran Viğ)ە بەنیشتمانی ئارییەکان ناسراوە.

# بەشی دووەم
# لکەکانی ئاریانی ئێران و هیندۆ ئەوروپاییەکان

لەمەوبەر دەربارەی کۆچی چەند لکێ لەئارییەکان بۆ باکووری ئەورووپا، لەدوای کۆچی لکەکانی هیندو ئێرانی، دواین پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کەبڕێ لەکۆچی ئەم لکانەی دوایی بۆ باکووری ئەمەریکایان، بەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین لەقەڵەم داوە.

بێگومان ڕەوی لکی هیندیو لکی ئەورووپایی هەر بەرەویەك لابوە، چونکە وەك وتمان: لکی هیندی لەڕێی گوزەرگاکانی زنجیرە کێوی هیندوکوش بەرەو ڕووباری سیند(indus) ملیان ناوەو لەو ڕووبارەش تێپەڕیون و لەدەوروبەری پەنجاب جێنیشتەبوون و شارستانییەتی تایبەتی خۆیانیان لەوێدا بنیات ناوە. هەندێ کەوتنەڕێی لقی هیندی ئاریاکان لەگەڵ کەوتنەڕێی هاوبەشی لقی هیندو ئێرانی ئاریاکانیان بەدەوروبەری دووهەزار ساڵ پێش زایین زانیوە. شوێنەوارو دۆکیۆمێنتە مێژوویییەکان نیشان دەدەن کەهاتنی ئاریاکان بۆ ئاسیای خۆرئاوا لەسنووری سەدەی چواردەهەمی پێش زاییندا بووە. ئەمە هەر ئەو کەوتنەڕێیەیە کەئاریاکان لە دووهەزار ساڵ پێش زاییندا دەستیان پێکردوە.

گەشتنی ئاریاکان بۆ ئاسیای خۆرئاوا بەیەك جار نەبوەو هەموو ئارییاییەکان لەیەك کاتدا نەهاتوونەتە ئەم ناوچەیە. ئدواردمایەر (Edward Mayar)ی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی لەو باوەڕەدایە کە لەسەدەی حەڤدەهەمی پێش زایین توخمەگەلی ئاری لەئاسیای بچووك و سووریادابوون و هەندێ لەمیرانی فەلەستینی چەند ناوێکیان بەشێوەی

ئـــاری هـــەبووە. ئاشـــکرایە کەئەمـــە ئـــەوە ناگەیـــەنێ کەســـووری و فەلەستینی یەکان ئاریڕەگەز بوون یاهـەن. گریمـان ڕۆژهەڵاتناسـی نـاوبراو گەیشـتبێتە ئـەو بڕوایـەی کـەبوون و بـەکارهێنانی نـاوی ئاریـایی لـەناو فەرمانڕەوایی فەلەستیندا بـاوبوە وەلێ هێشـتا ئـەوە بـەهیچ جـۆرێ لەگـەڵ پێوەرەکانی ڕەگەزناسی و نەتەوەناسی و توێژینەوەی مێژووییدا ناگونجێ.

خاڵـێ کەهـەندێ لەمێژوونووسانی پێشوو کەمتر بایـەخیان پێـداوە وەلێ توێژەرانی ئەم سەردەمە بەبایەخەوە لێی کۆڵیونەتەوە، لەیەك جیاکردنەوەی لکـەکانی ڕەگـەزی ئاریایی یـە، خوالێخۆشـبوو (پیرنیـا) لـە نووسـینەکانیدا دەربارەی ڕەگەزی لکی هیندۆ ئەوروپاییەکانی لەگـەڵ ڕەگـەزی ئاریـایی وەك یـەك نـاوزەدکردوەو دەڵـێ: ((هینـدو ئـەوروپایی بـەواتای گشـتی وەك لەمەوپێش ئاماژەی بۆکراوە، لقێکن لـەئاریاکان کـەچوون بۆ ئـەوروپاو هـەر بەوبۆنەوەیە کە زمانەکانی هیندی، ئێرانی و زۆربەی زمانەکانی ئەوروپا وەك یۆنـانی، ئـەڵمانی، ئینگلـیزی و روسـی- هتـد نـاوی وەك (هینـدۆ ئـێرانی و هینـدۆ ئـەڵمانی و لەهـەمووی گرنگـتر هینـدۆ ئـەوروپایی) یـان بـۆ دانـاون. لەلاپەڕەکانی ئەمەودوادا لەم روەوە زیاتر دەدوێین.

# بەشی سێیەم

## ئارییەكان و بان ئێرانی ئارییەكان و خاكی ئێران

لەلاپەڕەكانی پێشوودا ئاماژەمان بۆ وشەكانی ئاریاو ئاریاناو ئێریانم وێژوكرد. هەنووكە ئەم خاڵە جێی باسەكە وشەی دوایی واتە ئیریانم ویژو Aryana- Vaejo تاچ ئەندازەیەك دەتوارێ بەنیشتمانی ئارییەكان دابنرێ؟ وشەی ئاریانا Aryana كەهەمان وشەی (ئیرینا Airyana)یە، بەواتای سەرزەمینی (ئاریاكان Ariar land)ە كەبەفارسی ئەمڕۆ(ئێران Iran) دەگرێتەوە. هەنووكە دیسان باسمان لەپاشبەندی وێژا(Vaeja)یە كەلەتەك وشەی ئیرینا Airyana لەشێوەی (ئێریانم ویژو)دا دەبێ بەنیشتمانی ئاریاكان. پاشبەندی ویژا Vaeja وەك باسكرا لەپەهلەویدا وەز Ves یا وەژ Vež، Vej دەگرێتەوە. (وەز) یا (وەژ) لەپەهلەویدا وەك پاشبەندی كات پاشوێن بەواتای (كۆتایی، لەوێدكۆتایی هاتوو، هەروەها بێخ (بن) هاتوە. لەزمانەكانی سلاڤی و باڵكانیدا ئەم وشەی (Vage)ە بەواتای (وۆج) یا(ویج) بەكار دەهێنرێ كەبەواتای بێخ و بن وكۆتایی دێ.

دگەل سەرنج لەوەی كە(ئیریانم ویژو) دەڤەرێكە بەگوێرەی سەرچاوە، دێرینەكان خاوەنی زستانێكی دوورو درێژە بۆ ماوەی نزیكەی دەمانگ لەساڵداو وەرزی فێنك تیایدا تەنها دوو مانگ تەمەنی هەیە. بەبۆچوونی پسپۆڕانی زانستی جوگرافیاو دەڤەرناسان دەبێ ئازربایجان هەتا دامێنی كێوەكانی قەفقاز بێ چونكە هەلومەرجی ناوچەیی ناوبراو بۆ ئەوە

دەسازێ. پاشبەندی(ویژو) بەواتای (کۆتایی هاتووی)ی سەرزەمینی ئارییەکان یا باکوورترین خاڵی سەرزەمینی ئارییەکانە کە ئێرانە.

پێداچوونەوەی بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتی کۆن ئەوە نیشان دەدەن کەئەو تایبەتمەندییانەی پەیوەندییان هەبوە بەبارودۆخی ناوچەیی وابەستە بە(ئیریانم ویژو)وەوە بەتەواوی بۆ بارودۆخی جوگرافیو ناوچەیی سەرزەمینی ئازربایجان دەست دەدەن، تەنانەت لەهەندێ لەو بەڵگەنامانەدا هەلومەرجی ژیانی سەختو سەرماو سوڵەی بێئەندازە کەژیانی دانیشتوانی دەڤەرەکەی دژوارکردبێ باسکراوەو وشەی دێرینی(ئاودار Aodar ) بەواتای سەرماو سەرمای لەوزەبەدەر بەکارهێنراوە. بائەوەش بوترێ کەتاماوەیەك لەمەوپێش زمانناسان(ئیریانم ویژو)یان بەوڵاتی خۆماڵیو نیشتمانی ئارییەکان ناسیوە کەئەم بۆچوونە جێی پشتگیری نییە لەم بەشەماندا دەست دەکەین بەباسی ژیانو هەلومەرجی گشتی ژینگەو شێوەی هەڵسووڕاندنی بژێوی ئاریاکان لەپێش کۆچکردنیان بۆ ئێرانو هیندو رێڕەوو کاتی کۆچیانو چۆنیەتی جێگیربوونیان لەدەشتەکانی ئێراندا.

لە دوانووسینەکانی بەشی پێشوودا بۆ هەلومەرجی ناوچەییو بارودۆخی جوگرافی وڵاتیئاریاکان کەپێدەچێ ناوچەکانی باشووری دەریاچەی ئاراڵبوو بێئامارەمان کرد(٤) لکی لەئاریاکان لەدەوروبەری ساڵی ١٦٥٠ پ.ز چوونەتە باکووری رۆژهەڵاتی دەشتەکانی ئێران. نیشانەکانی بوونی ئارییەکان لەدوای ساڵی ١٦٠٠ لەبەشی باشووری ئاسیای بچووکدا وان لەبەردەستدا.

توێژەران گومانیان لەوەدا نییە کەئەم لکە لەئارییەکان بەلکی بنەڕەتی یالکی هیندۆ ئێرانی یا بەگوزارشتێکی دیکە لکی هیندو ئەڵمانی ناوبراوە.

پێش هاتنی ئاری حووری و کاسی یەکان لەدەشتەکانی ئێراندابوون و لەوێدا ژیانیان بەسەربردوە. کەبەچوونی ئارییەکان بۆ ئەو شوێنە ناچاربوون بە بەجێهێشتنی دەشتەکانی ئێران و شوێنەکانی خۆیان دابەئارییەکان. لەپێشچوونی شارەزایی توێژەران لەپێش چوونی ئارییەکان بۆ دەشتەکانی ئێران، بە شێوەیەکە کە لەخوارەوە باسی دەکرێ. ئاشکرایە کەئەم بۆچوونە لەلایەن نەتەوە ناسان و زمانناسان و مێژوو ناسانەوە پشتگیری لێکراوە.

ئەو زانیارییانەی پەیوەندی بەدەشتەکانی ئێرانەوە هەیە لەپێش هەزارەی دووەمی پێش زایین، بەتایبەتی لای رۆژئاوای ئەم دەشتانە بەم جۆرەیە: نزیکەی ۲۲۰۰ ساڵ پێش زایین نەتەوەکانی گۆتی یا گۆتیەکان دەستیان بەسەر بابلدا گرتوە ونزیکەی ۱۷۰۰ ساڵ پێش زایین واتە نزیکەی پێنج سەدە دوای هاتنی گۆتییەکان بۆ بابل، کاسیەکان و حوورییەکان پێش ئەوەی بچنە سەرخاکی بین النهرین(میزۆپۆتامیا) لەبەشی باکووری رۆژئاوای ئێراندا جێگیربوون.

دەسەڵات و چوونەناو وهەندێجار هێرشی ناوبەناوی نەتەوەکانی دیکە لەرێگای کێوەکانی زاگرۆسەوە، وەك لۆلۆبییەکان کە لەهەندێ سەرچاوەدا (لۆلۆبوو)ە لەگەڵ نەتەوەیەکی خۆماڵی نەشارەزا لە میزۆپۆتامیا لەدەوروبەری ۲۳۰۰ ساڵ پێش زاییندا کە زۆربەی شێوە هێرشی سەربازییان هەبوە، دووبارە لەلایەن مێژوونووسانەوە پشتگیری لێکراوە. نەتەوە ناسراوەکانی سەرەوە وەك گۆتیەکان و حووری و کاسیەکان و لۆلۆبییەکان خاوەنی ژیاری بایەخدارو بەرچاوی ئەوها نەبوون کە جێگای سەرنج راکێشان و چاولێکردنی خەڵکی دیکەی ئەو ناوانەبن.

لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەوە دەردەخا کە لەدوای ساڵی(۱٦۰۰ پ.ز) فەرمانڕەوایانی ناوچەکانی باکووری رۆژئاواو رۆژئاوای ئێران (بەوشێوەی

ـە لەوەوپێش باسمان کرد کە ئارییـەکان بەگەیشـتنیان بـۆ ئـەو ناوچانـە کاسی و حووریيـەکانیان وەدەرنا) ناوی ئاریایی (هینـدۆ ئاریـایی، هینـدۆژ ئێرانی) یـان هـەبوە. نـاودارترینی ئـەم حکومەتانـە دەوڵـەتی میتـانیبووە کەدەزانن پاشاکانی میتانی ناوی ئێرانی(ئاریاییان) لەخۆگرتوە.

بەگەیشتنی ئارییەکان بۆ دەشتەکانی ئـێران و وەدەرنـانی دانیشـتوانی خۆمـاڵی ئـەو ناوانـە وەك حـووری و کاسـییەکان، ئاریبوونیـان بـۆ بـوون بەفەرمانڕەواو تەنانەت بۆ مافی ژیان لەناوچەکەدا بەمەرج دانـابوو. هـەروەك لـەدۆکیۆمێنت و بـەردە نووســراوەکانی ســەردەمە دێرینــەکاندا بــەرچاو دەکـەوێ، پێـش ئـەوەی پاشـایەك شـازادەبوونی خـۆی بسـەلمێنێ دەبـوو پـەیوەندی خـۆی بەڕەگـەزی ئاریاییـەوە بســەلماندایە. داریووشـی یەکـەم (٥٢٢-٤٨٦ پ. ز)نموونەیـەکی ئاشـکرایە لـەم روەوە. ئارییـەك لـەتوخمی ئارییەکان(بنەماڵە ئاری) دەیوت: ((من هەخامەنشیم، یەك پارسـی (ئێرانی) کوڕی پارسیم)).

لەهیندی کۆنـدا دیسـان ئـەم جـۆرە هـزرە بەشـێوەیەکیدی لەکۆمـەڵگادا بڵاووبــوەوە. لــەوێ دوای کۆچــی لکــێ لەئارییــەکان بــۆ ســەرزەمینی سیندوپەنجاب، ئـەوان وەك چینێکـی دەستڕۆیشـتوو لـەهینددا دەرکـەوتن. هیندییە ویدادییەکان دیسان خۆیان بەئاری دەزانی و لەژێر نـاوی چینێکـی دەستڕۆیشــتووی ئــاری بــەئاری خۆیــان ناســاندووە. ئــەوە لــەکاتێکدا کەبرەهمەنــەکان خۆیــان بــەچینی (جــەنگی) دەناســاند ئێرانییـە ئــاری رەگـەزەکان خۆیـان بـە(رەسـەن و ئـازاد) لەقەڵـەم دەدا، کەئـەم ناونیشـانە کردبوونـی بـەخاوەنی تایبتمەندییـەکی ئـەوتۆ کـە میللـەتان و خێڵـەکانی دیکەی لێبێبەش بووبوون. لە هینـدی کۆنیشـدا دیسـان ئـەم جـۆرە هـزرە بەشێوەیەکی دیاریی بایەخدارو بەرفراوان لەئارادا بووە.

# بەشی چوارەم

# ژیان و شارستانییەتی ئارییەکان

## (ژیانی کۆمەڵایەتی، بەرهەمهێنانی ئابووری و بژێوو کەلتوورو بیرو بڕوا)

لێرەدا بەو بەشە لەئارییەکان دەست پێدەکەین کەئێرانییەکان لەنەوەی ئەوانن. ئەم بەشە لەئێرانییەکان، تەنانەت دوای هاتنیشیان بۆ دەشتەکانی ئێران، دەست بەرداری شێوە ژیانی سادەی خۆیان کەشوانی بووە نەبوون. بەدەستهێنانی بژێوی لای ئەوان بەشێوەیەك بووەکە ئابووری و بەرهەمەکانی کۆمەڵگای شوانی دابینی دەکا. بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان ئەوان هەمیشە لەکۆچکردندابوون لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.ئەم شێوە ژیانە لەدوای دەستپێکردنی کۆچییە کەمیانەوە لە باشووری روسیا، لەدەوروپشتی دەریاچەی ئاراڵ و لە دەوروبەری رووباری سەیحوون و جەیحوون و بەدرێژایی ئەو ڕەوەیان تا باکووری رۆژهەڵاتی ئەفغانستانی ئەمڕۆ سەقامگیربوون. هەندێ لەتوێژەران ماوەی ئەم کۆچکردنەیان لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی بەنزیکەی یەکهەزار ساڵ دادەنێن و دەسپێکی ئەم ژیانە لەشێوەی ئاژەڵداریدا کەسیستمی بەرهەمهێنان لەشێوە کۆمەڵگای کۆچەری ئاژەڵداریدا بەرجەستە بووبوو، بەکۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایین دادەنێن. بێگومان لەم بزاوت و جێگۆڕکێیەدا جەنگاوەرانی ئاری لەسەرەتادا بەئەسپ و هەندێجار بەعەرەبانەی جەنگی زۆر سادەو سەرەتایی بەرەو باشوور پێشڕەوییان کردووە. ئەوانی دیکەش لەتەك ئاژەڵەکانیاندا لەدوای ئەم جەنگاوەرو سوارانەوە کەوتوونەتە ڕێ و بەوانەوە پەیوەست بوون. ئەمانە هەر ئەولکەبوون دوای هاتنیشیان بۆ دەشتەکانی

ئێران، دانیشتوانی ناوخۆی ئەو دەشتانەیان، وەك حووری و کاسی یەکان ناچارکرد بەدەرپەڕین وەك لەلاپەڕەکانی رابوردوودا باسکرا. وەك باس دەکرێ بەشی بنەڕەتی و کاریگەری ئەم کۆمەڵە خەڵکە کەلەڕاستیدا رابەری ئەم بزاڤە مێژوویەبوون، لە رێڕەوەکانی کێوانی هیندوکوشەوە بەرەو رووباری سیند پێشڕەوییان کردوەو لەدەوروپشتی پەنجابدا جێگیربوون هەندێ لەتوێژەران درێژیی ماوەی کۆچکردنەکەیان گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی کە کۆچەکە یەکسەری نەبوە، بەڵکو لەهەندێ شوێندا بۆ ماوەیەکی کەم یا زۆر نیشتەجێبوون و پاشان دەستیان کردۆتەوە بەکۆچ. ئەمانە هەر ئەولکەن کەئارییەکانی هیند بەنەوەو وەچەی ئەوان دەژمێردرێن. ئەم بەشە لەدواییدا لەلایەن ئێرانییەکانەوە بە((هیندوان ناوبراون)). میتانی یەکان کە لەمەوپێش ناومان بردن و ماوەیەکی دوورودرێژ لەرۆژئاوای ئێران جێگیرو جێنیشتەو فەرمانڕەوابوون، پەیوەندییان بەلکێکی دیکەی ئارییەکانەوە هەیە. رەوی ئەوان لەناوچەی باشووری روسیاو کێوەکانی قەفقازەوە (Kaukasus) لەلایەن مێژوونووسان و جیهانگەروو رۆژهەڵاتناسانەوە پشتگیری لێکراوە. توێژەران شێوەی ژیان و تەنانەت فەرمانڕەوایی و ناونانی کەسەکانی میتانییەکانیان بەیەکجۆردا ناوە لەگەڵ ئارییەکاندا چوونە ناوەوەی میتانی یەکان لە خۆرئاوای ئێرانەوە بۆ قوولایی(میسۆپۆتامیا) پێویستە بەنموونەیەکی بەرجەستەی ئەوان لەدەسەلاتدا دابنرێ. توێژەران دەوڵەتی بەتوانای میتانی یەکانیان بەجۆرێ لەئیمپەراتۆرییەت .Mitanni Raichm Empire ناوبردوە.

### أ- زمان و ئایین و پەرستنی ئارایاییەکان:

لەکەلتووری کاروباری کۆمەڵایەتی و ناولێنانی میتانی یەکاندا چەند پێوەرێکی بەکارهێنراو لەلایەن ئارییەکانەوە بەرچاو دەکەون. گرنگترین

بەڵگەنامە کە بۆ گوزارشت و هەڵهێنجان و پشتگیری کردن لەبوونی توخمەگەلی ئاریایی لەفەرهەنگی میتانییەکاندا هەبێ لەپایتەختی هیتییەکان بەدەست گەیشتوە. ئەم بەڵگەنامەباس لە رێکەوتنی نێوان پاشای هیتییەکان بەناوی شوییلوولیما و مایتوازا(کوریتوازا) پاشای میتانییەکان دەکا. لەم رێکەوتننامەیەدا پاشای میتانی بەجێهێنانی فەرمانەکانی پاشای هیتی رادەگەیەنێ(٣) و بەدوای ئەوەدا ئاشتی نێوان هەردوو حکوومەتەکە دێتە کایەوەو شوییلوولیما پادشای هیتی کچی خۆی لەمایتوازا پاشای میتانی مارە دەکاو وەك ئەوەوپێش لەسەر زەمینی خۆی(میتانی) فەرمانڕەوایی دەکا. بەناوی گەواهی و دەستەبەرکردنی بەستنی ئەم پەیمانەو چەسپاندنی ئاسایش و ئاشتی نێوان هەردوو وڵات، هاواریان بۆ خوداکانی هەردوو سەرزەمین بردوەو ناوی ئەوانیان لەپەیمانەکەدا هێناوە. لەزۆر نامەدا خوداکانی میتانی، ئەو خودایانەی کە لە سرروودەکانی و دایی هیندییەکان بەرچاو دەکەون ناویان هێنراوە. لەوانە میترا- ورونا و ایندرا(indra) و ناستیاکان nasatyas. ئەمە کۆنترین بەڵگەنامەی مێژوویییە دەربارەی خوداکانی کۆنی ئارییەکان لەبەردەستدایە. ناوهێنانی خواکانی ئاریایی لەبەڵگەنامەی سەرەوە یا رێکەوتننامەی ئاشتی نێوان هیتی و میتانییەکان گرنگی و بایەخی خودا جۆراوجۆرەکانی ئارییەکان لەزۆر مێژەوە دەردەخا. لەنێوان ناوی خودایانی کۆن کەلەم جۆرە بەڵگەنامەدا هاتووە ناوی جۆراوجۆری ئەو خودایانەی حوورییەکان(Hurritn) پەرستوویانن یاخواکانی دیکەی بێگانە بەرچاو دەکەوێ کە لەنێوانیاندا خواکانی ئاریایی لەناو توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگادا بەتایبەتی جێی پەرستنی چینی گەورەپیاوان و جەنگاوەرانی ئارییەکان لەنێوان حوورییەکاندا بوون. لەرووی زمانناسیەوە ناوو

وشەکانی ئاریایی کە لەنووسراوە بزمارییەکاندا بەدەست دێن، لەئاسیای بچووك و دەوروبەریدا بەکار هێنراون و لەگەڵ هاوواتاکانیان لەزمانی هیندی کۆندا یەك دەگرنەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم ناوو وشانە بۆ یەکەمجار لەهینددا بەکارهێنراون و لەدواییدا بۆ ناوچەکانی وەك دەشتەکانی ئێران بەتایبەتی بۆ رۆژئاوای ئەم دەشتانە گوازراونەتەوە. لەم گۆشەنیگایەوە کەتاقمی سوارەو عەرەبانە لێخوڕانی ئاریایی کەناومان بردن هێدیهێدی لەولاتی رەچەڵەکی(ئەسڵی) خۆیانەوە بەرەو زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس هاتوون و وردە وردە بەشێ لەوان گەیشتوونەتە میسۆپۆتامیا، دەتوانین بچینەسەر ئەو بڕوایە کە دابەشکردنی زمانی کۆنی ئاریایی بەلای کەمەوە بۆ دوو جۆر شێوەزمان (dialekt)کە یەکێکیان شێوە زمانی هیندی و ئەوی دی شێوە زمانی ئێرانییە سەری هەڵداوە. ئەوەی کە پەیوەندی بەو مەبەستەوەبێ سەردەمێکە کە میللەتی ئاریایی هاوبەش و دیارە هەموو ئەو لقانەش کەلێی جیابوونەتەوە لەشوێنی ئەسڵی خۆیاندا ماوەیەکی دوورودرێژ جێنیشتەبوون. خێڵە ئاریایییەکان کە لەسەرەتاوە بۆ باشووری روسیا ملیان ناوەو لەدواییدا بۆ هیندو ئاسیای بچووك رێیان دۆزیوەتەوە، بەزمانێ یا دیالێکتێ دواون کە کۆمەڵانی زمانناسی و توێژینەوەی مێژوویی و نەتەوە ناسان (ئاریایی کۆن Urarisch) یان پێوتوون. هەر لەو سۆنگەوە زمانی ئەو نەتەوانەی کە لەدەشتەکانی ئێراندا ماونەتەوە لەزاراوەی زمانناسیدا بەزمانەکانی ئێرانی iran- sprachen یا دیالیکتەکانی ئێرانی iranische ناسراون. جیاوازی نێوان کۆنترین زمان و دیالکتەکانی ئێراندا زۆر کەمە. ئەم جیاوازییە کەمە بەتایبەتی لەسنووری رێسای زمانی هەردوو زمانەکەدا کەم بایەخترە. ئەگەر لەبەراوردی دەستووری زمانی ئێرانی کۆن و هیندی کۆندا لەسنووری هەندێ

لەدەنگەکان جیاوازییەك هەبێ، ئەوەندە بێبایەخ و کەمە کە لەنێوان دوو دیالیکت لەدوو ناوچەی دراوسێدا لەوڵاتێکدا ئەو جیاوازییە بەدی دەکرێ. ئێرانییەکان و هیندییەکان نەتەوە یا میللەتانێکن برای یەکترن. ئەوان لەیەك رەگەزو یەك نەتەوە پەیدابوون و بەپێوەرێکی فراوانتر لەکەلەپووری ئایینی و کۆمەڵایەتی و چەند رێبازێکی هاوبەش بەهرەیان وەرگرتووە. هەم خەڵکانی هیندو هەم خەڵکانی ئێران لەژێر یەك ئەدرەسی هاوبەشدا بەناوی(ئاریایی)یەوە ناویان دەرکردوە. تەنها جیاوازییەك کەبەهۆی درەنگ هاتنی ئارییەکانی ئێرانەوە بۆ دەشتەکانی ئێران پەیدابوە ئەوەیە کە، ناوبردنی ئێریانا Airyana بەواتای سەرزەمینی ئاریەکان بەناوی ئێرانەوەیە. ناونانی لکی ئارییەکانی هیند بەم جۆرەیە کە دوای تێپەڕبوونی ئەم بەشە لەئارییەکان لەرێڕەوی کێوەکانی هیندوکوشەوە وگەیشتن بەرووباری سند لەگەڵ کەمێ مانەوە لەم ناوچەدا لەم رووبارەش تێپەڕین و لەدەروپشتی رووباری پەنجاب (پێنج ئاوFunf strom) بۆدواجار مانەوەو شارستانی تایبەتی خۆیان بنیادنا. ئێرانییەکان ئەم خەڵکەیان بەهیندو Hindu لەسەرناوی رووباری سند indus ناوبردوە. هەندێ لە سەرچاوەکان (هیندو) یان بەهیِنداو Hindova نووسیوە بەپێی سەرچاوە پەهلەوییەکان بەوانە هیندوکان(Hindukan) دەوترا. لەجێی خۆیدایە کەمێ لەفەرهەنگی ئەم بەشە لەئارییەکان باس بکرێ. کۆنترین و گرنگترین پاشماوەی وێژەیی هندوان کۆمەڵەی گەورەی سروودە ئایینزاکان(مەزهەبییەکان) (ریگودا Rigvida)یە کەبەواتای وداکان یاسروودە ئایینییەکانە.

شوێنی بەرپابوونی ئەم سروودانە سەرزەمینی پەنجابەو ئەو سەردەمەیان سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین بووە. برێ لە توێژەران

سەردەمی وتنی ئەم سروودانە بەدرێژایی هەزارەی دووەمو هەندێکی دیکە بەکۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایین دادەنێن. چەند پێڕێکی دیکەی ئارییەکان رەنگە لەدەوروبەری نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین(سەدەی شانزەهەم تا حەڤدەهەم- ١٦٠٠-١٥٠٠ پ.ن) دەستەدەستە هابێتنە میسۆپۆتامیا لەوانەوە چەند باسێکی نووسراوی بەرچاو لەبەر دەستدایە.

کەمێ دوای سەدەی حەڤدەهەمی پێش زایین(١٦٠٠) کاسی‌یەکان وەك میللەتێ دەرکەوتن کە بەگوێرەی بەڵگە مێژوویی‌یەکان لەبەرزایی‌یەکانی ئێرانەوە چوونەتە میسۆپۆتامیاو فەرمانڕەوایی( بابل Babylon)یان لێدەگێڕنەوە. ئەوان پێنج سەدە یا وەك دەڵێن نیوەی هەزارەیەك فەرمانڕەوای بابل بوون زمانیان ئاریایی نەبوەو نەزانراوە بۆچی پابەندی زمانەکانی ئەو سنوورە جوگرافییەبوون. تەنها لەیەك بەڵگەنامەی کورتی کاسی‌یەکان(ئەکادی) کە لەوانەوە بەدەست گەیشتووە ناوی بڕێ لەخواکانی کاسی بەرچاو دەکەوێ کە یەکێ لەو خوایانە •شۆریزاش)ە= Šurijaš کە لەوانەیە هاووێنەی شەمس Šamaš خودای خۆری ئەکادی‌و بابلییەکان بێ. گومانی تێدانییە کە شوریزاش لەگەڵ وشەی سوریاس Sûryas بەواتای خۆر لەیەك دەچن‌و هەروەها گومان لەوەدانییە کەئەم ناوە لەلایەن میللەتانی هیندۆ ئاریایی زمانەوە گواستراوەتەوە بۆ کاسی‌یەکان یا کاسی‌یەکان خۆیان چاویان لەوان کردوە. خاڵێکی بەهێز لەم رووەوە بەکارهێنانی ناوی کەسانی ئاریاییە لەلایەن کاسی‌و حوورییەکانەوە. ناوی خواکانی هیندۆ ئاریایی تەنها لەلایەن کاسییەکانەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو حوورییەکانیش ناوی خواکانی هیندۆ ئارییاییان خستۆتە ناو فەرهەنگی خۆیانەوە.

حوورییان کەسانێکن کەلەلای خۆرهەڵاتەوە، واتە دەشتەکانی ئێرانەوە چوونەتە ناو نێوان دوو رووبارەوە(میسۆپۆتامیا) ئەگەری ئەوە لەئارادایە کەزمانیان لەگەڵ زمانی(اورارتوییان) خزم بێ. حوورییەکان نزیکەی ۲۲۰۰ پ.ز لە نیپوور (دەوروبەری بابل) هەبوون و ئەمجا دەستەدەستە چوونەتە ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلە (Tigris) وە. ئەو سەردەمەی کەساڵی ۱۵۰۰ پ.ز ئیمپەراتۆری میتانی دامەزرا، فەرمانڕەوایانی میتانی بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و بەرچاوەوە ناوەکانی هیندۆ ئارییان هەبوە وەکو ئەرتاتاما Artatama کە لەڕەگی هیندییە( rta...dhaman)ئەم وشە بەواتای کەسێکە کەیاساو راستی لەماڵیدا هەبێ. ناوێکی دیکەی پاشاکانی میتانی تووش رەتا(Tušratta)یە کە لەرەگی هیندی(reth- tvesa) یە بەواتای کەسێ کە عەرەبانە جەنگییەکەی لێهاتووانە بەرەو ئامانج لەجووڵەدابێ. هەروەها شاوش شاتر(Šauš Šattar)کە رەگەکەی هیندییە -Sauk Satra بەواتای کەسێ کە فەرمانڕەوایەکی کارامەبێ (پاشای دادپەروەر). ناونانی ئێرانی و هیندی لەیەکچوو بۆ هاوڵاتییان و فەرمانڕەوایان لە فەلەستین، لەو ناوچانەی کە حوورییەکان سنووری حکوومەتی خۆیان فراوان کردبوو، بەکار دەهێنران. حوورییەکان بۆ عەرەبانەی جەنگی وشەی(مەرازانوو Marjannu)یان بەکار دەهێنا کە لەوشەی (جەنگاوەری گەنج). ئەو ئەگەرەش لەئارادایە کە ئەوبەشەی لەئارییەکان بۆ هندستان نەچووبوون لەڕێی ئێرانەوە گەیشتبێتنە میسۆپۆتامیا. میتانییەکان بەهۆی خووی جەنگاوەری و، چەکداری و پرکێشی و هونەرمەندییانەوە، هەروەها کاراییان لەهەموو جۆرە کارێکدا کەلەتوانایاندا بووبێ، چالاکی و دەستڕەنگینییەکی ئاوهایان نیشان داوە کە لەلایەن کاسی و حوورییەکانەوە کاریان پێسپێردراوە. تەنانەت میتانییەکان بەهۆی ئەو

تایبەتمەندییانەی باسکراو لێهاتوویی و زرنگیانەوە شایانی ئەوەبوون کە پەیوەندی لەگەڵ گەورەپیاوان و کاریەدەستاندا پەیدا بکەن و لەناو جەرگەی بنەماڵەو دەستگاو حەرەمسەرای فەرمانڕەوایاندا جێیان ببێتەوە. بائەوەش بڵێین کەبوونی میتانی‌یەکان لەخۆرئاوای ئێرانداو هاتوچۆی دواییان بۆ نێوان دوو رووبار، بەتایبەتی بۆ باکووری ئەوێ کەناوچەی ئۆراتوویی‌یەکان و هیتی‌یەکان بووە هەتا سەردەمی پێش زایین پشتگیری لێکراوە. دووبارە لەبیرمان نەچێ کەبوونی ئارییەکان لەرۆژئاوای ئێران کەبەهۆی ناوەکانیانەوە زانراوەو وەك چەند سەرچاوەیەکی کۆن پشتگیری لێدەکەن لەسەدەی حەڤدەهەمی پێش زاییندا بووە. چەند بەڵگەیەك هەیە لەسەر بوونی کاسی‌یەکان لەوسەردەمەدا کە فەرمانڕەوای بابل بوون نکوولی لێناکرێ. لەوسەردەمەدا میتانی‌یەکان لەناوچەکانی باکووری نێوان دووروبار تا فەلەستین فەرمانڕەوابوون چونکە ناوی میتانی‌یەکان لەسەر بەرد، بەنووسینی بزماری لەو ناوچانەدا بەدەست هێنراوە.

پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کەلەناو فەرمانڕەوایانی کاسی‌یەکاندا، فەرمانڕەوای بابل هەمیشە بەناوی(پاشای چوار هەرێم یا چوار لای جیهان) ناودەبرا Freyer a.a.o.27. لەجێی خۆیدایە کە بەگۆشەنیگای جوگرافی- مێژوویی، کە دەربارەی ئاریاکان خراوەتە روو ئاماژەیەك بکەین. بەگوێرەی توێژینەوە جوگرافیا- مێژوویی‌یەکانی ئێرانی ئەمڕۆ تەنها ئەودەڤەرە دەگرێتەوە کەئێرانییە کۆنەکان (ئارییە ئێرانی‌یەکان) بەدرێژایی مێژوو بەهی خۆیان داناوە چەند سەرزەمینێکی دیکە کە بەڵگەو نیشانە لەسەربوونی ئاریاکان دەسەلمێنن بریتین لەئەفغانستان، باشووری رۆژئاوای پاکستان(بلۆجستان)، تورکستانی رووسی تا ناوچەی(سیردریا)، بەدرێژایی

سنوورەکانی ئارال- کاسپی و دەریای مازندەران و هەروەها بەشێ لەباشووری روسیا تا کەنارەکانی دەریای رەش.

ولاَتی ئێران یا کورتکراوەی ئێران شەهر Iran- Šahr وەك لەوەوپێش وترا. واتە((سەرزەمینی ئاریاکان landder Aryas)) لەپێش گەیشتن و جێگیربوونیان لەم ناوچە، لەتەك هیندییەکانی دوایی یا دانیشتوانی ئەمەو دوای هندستان کە ئەوانیش خۆیان بە ئاریایی ناودەبەن یەك کۆمەڵ پێکدێنن. خزمایەتی و پەیوەندی هاوبەشی ئێرانییەکان و هیندییەکان بەرەگەزی ئاریاییەوە تەنها بوونیان بەئەندامی نێو ئەم کۆمەڵە نییەو بەس بەڵکو ئەم خزمایەتییە لە روانگەی زمانناسییەوە بەهۆی لەیەکچوون و ناوە دێرینەکانی ئێرانی و هیندییەکان، لەیەکچوون و پەیوەندی زمانە دێرینەکانی ئێرانی و هیندی بەتەنها یەك زمانەوە بەناوی هیندۆ ئێرانی یا هیندۆ ئاریاییەوە پەیدابووە. لەروویەکی دیکەوە هاوبەشی ئایینی لەباوەڕە دێرینەکانی ئێرانی و هیندییەکان جێی سەرنجڕاکێشانە.

هەروەك لەمەوپێش ئاماژەی بۆکرا نیشتمانی خۆماڵی (رەچەڵەکی) ئەم هیندی و ئێرانییانە بەتەواوی دیاری نەکراوە. هیندۆ ئێرانییەکان بەناوی لقێ لە میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی، چەند نیشانەو بەڵگەیەکیان بەجێنەهێشتووە کەشوێنی نیشتەجێبوونیان دەربخا. تەنها ئەوەندە دەزانین کە ئەوان لەناوچەی باکووری رۆژئاواوە چوونەتە هندستان و دەوروبەری رووباری پەنجابیان خستۆتە دەستەلاَتی خۆیانەوە. ئەم ناوچەیە بریتییە لەکەنارەکانی رووباری سند Indus و لقەکانی ئەم رووبارە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەتوانرێ ئەمە بەیەکەم جێگیربوونی هیندییە کۆنەکان بەرەوپێش رۆیشتنیان و فراوانکردنی پێشڕەوییانە. بەوتەیەکی دیکە هیندییەکان پێش گەیشتن بەدەوروبەری رووباری گەنگ

Ganges لە دەوروپشتی سندوپەنجاب نیشتەجێبوون و لەدواییدا بەرەو ڕووباری گەنگ کەوتوونەتەرێ و لەشوێنەکانی دیکەی کیشوەری هیندی دێرین Indis Cher Kontinent بلاوەیان لێکردووە بەلام بەچ جۆرێ لکی ئێرانی لەئێراندا جێگیربوون و لەپێشا بۆ ئەم دەشتاییی‌یە ملیان ناوەو ئەوسا لەوێندەرێ نیشتەجێبوون، هیچ کەس ئەوە نازانێ و تا هەنووکە لەئێمە شاراوایە. یەکێ لەوفاکتەرە سەرەکییانەی کە ئێمە لەدیاریکردنی ڕاست و دروستی سەرەتاو ڕێڕەوی ئارییەکان بەتایبەتی بۆ ئێران و هتد ڕووبەرووی بنبەست دەکاتەوە کۆچگەلێکی بەرفراوانی چەند میللەتێکی جۆراوجۆرە لەیەك کاتدا. نەك تەنها سەدەی سیانزەهەمی پێش زایین بەڵکو سەرتاسەری هەزارەی دووەمی پێش زایین بەسەردەمی زۆربەی کۆچکردنی میللەتان دادەنرێ. ئەم کۆچکردنانە ناتوانرێ تەنها نموونەیەك بن لە پێشڕەوی ئیلیریان Illyrier لەئەوروپای ناوەندییەوە بۆ سنوورەکانی دەریای میدیترانە(سپی)، بەڵکو بەپێوەرێکی فراوان لەناوەندی کیشوەری ناوبراوەوە بۆ سەرتاسەری جیهان و شارستانی دێرین و ملنان بەرەو دەوروبەری دەریای سپی(میدیترانە)یە. ئەم پێشڕەوییە خۆرهەلاتی کۆنیش دەگرێتەوەو بەردەوامبوونی ئەم جوولانە وەك پشتێنەیەك ئێران و ناوچەی ڕووباری سند گەمارۆدەدا. ئەوانەی بەم کاری کۆچکردنە هەستاون، بەهیچ جۆرێ(هیندۆ ئەڵمانی indo germanenn) نین بەلام هۆییکە بۆ ئەوەی هندو ژەرمەنەکان بچنەناو مێژووەوە.

**ب/ کەلتورییە هاوبەشەکان، لکەکانی ئاریایی و شێوەی ژیانیان:**

دوای چوونی ئارییەکان بۆ ناوەوەی دەشتەکانی ئێران کە لەسنووری کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم(١٦٠٠ پ.ز)دا بووە، کۆچی حووری و کاسیەکان دەربارەی شێوەی ژیان و سیستمی کۆمەلایەتی ئاریاکان لەدەشتەکانی

ئێران لەنێوان سەدەکانی ئەوەو دوا، شارەزاییەکی ئەوتۆ کەلەسەر بەڵگەو دۆکیۆمێنتی مێژوویی هاتبێتە کایەوە لەدەستدا نییە. تەنها چەند داستانێك وبەشێ لەدەقە ئایینی‌یەکان کەپەیوەندی یان بەسەردەمە پێشووەکانەوە هەبێ لەدەستدان کە لەرووی مێژوویی‌یەوە زۆر پشتیان پێنابەسرێ بۆ نموونە: ئەو خەڵکانە کێن کە بەدڵنیای‌یەوە (برۆنز) یان لەکوردستاندا کەهەندێکی پەیوەندی هەیە بەهەزارساڵ پێش مەسیح دۆزیوەتەوە؟ مەبەست ئەوەیە کە ئاسەواری جۆراوجۆر لەم بابەتە لەدەستدایە کە لەناوچەکانی کرماشان و نەهاوەند بەدەست گەیشتووە. هەندێ لەتوێژەران و دێریننانسان بیر لەوە دەکەنەوە کە مادەکان(ئەسپیان پەروەردەکردوە). هەندێ دەربارەی، کاسی‌یەکان پێش مادەکان بیر دەکەنەوە، هەرچەندە شارستانی نێوان ئێرانی و هیندییەکان لەسنوورێکی تەسکدا، تەنانەت دوای کۆچیشیان لەچەند روویەکەوە لەیەکچووەو ئەم لەیەکچوونە سەلمێنراوە.

ئەم دوو کۆمەڵە لە ئارییەکان خاوەنی بنچینەی کۆمەڵایەتی یەکسان نەبوون وشێوەی ژیانیان لەگەڵ یەکدا جیاواز بووە. هەروەها هەرچەندە دامەزراندنی هاو واتای زمان لەئەدەبی ئێران و هیندیدا وەك بەرونی ئاماژەی بۆکرا بەتایبەتی لە ئاسەواری ئاییندا زانراوو ئاشکرایە، ئێرانی‌یەکان لە تێکەڵبوونی کەلتووریدا لەگەڵ میللەتانی دیکەدا بەشێوەیەك پابەندبوون کە ئەو بەڵگانە بۆ تێکەڵبوونیان لەگەڵ هیندەکاندا لەدەستدا نین. پەیوەندییەکانی ئەم دواییەی ئێرانیەکان لەگەڵ شارستانی دیکەدا وەك پەیوەندییان لەگەڵ دانیشتوان و ژیارەکانی میسۆپۆتامیا و یۆنان و وەرگرتنی یەك لەدوای یەکی لەلایەن ئێرانییەکانەوە لە میللەتانی سامی و ئارامی نەژاد زەمینەی بەرچاوی خۆشکرد بۆ توخمە نائێرانییەکان

بۆ پابەندبوون بەکەلتوری ئێرانەوە، کە بەشێوەیەك بوو وەك لەلاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەی بۆکرا لەیەك هەڵسەنگاندنی گشتیدا دەرکەوتوە کە میللەتانی ئێرانی یا ئێرانییەکان نموونەی زانستیو مێژوویین بۆ زۆر لەمیللەتانو خێڵەکان کە لەرووی زمانو کولتوورەوە لەیەکەوە نزیکن. دیالیکتەکانی ئێرانی هەریەکەیان بەتەنهاو هێدی هێدی چەند شێوەیەکی جیاوازو بڕێکیان ئاوەژوکراویان پەیداکردوە. دەتوانرێ ئەم جیاوازییە تەنانەت لەرێزمانی ئەم دیالیکتانەدا بەدی بکرێ. دەستنیشانکردنی تایبەتمەندییەکانی هەر زمانێ، لەنێوان بەشەکانی دروستبوونی ئەو زمانەدا، چ لەرووی کردارو ئاوەڵناوەوە یا لەبواری تایبەتمەندییە رێساییەکانی دیکەوە، تەنها بەوردبوونەوە لەریشەو بنەما هاوبەشەکانی ئەم زمانانە، لەلایەن زمانناسانەوە، بەدەست دێ. لەم بارەوە باس دەربارەی یەك زمانی (نموونە)یا(دایك) یا بەزاراوەیەکی دروستتر(دێرین) کە بەزمانی ئاریایی ناو براوە. وەك نموونە دەتوانرێ ناوی زمانەکانی ئیتالی، فەرەنسی، ئیسپانیو زمانەکانی دیکەی رۆمانی ببرێ کە بەپێی بەڵگەنامەو بۆچوونی زمانناسان زمانی (لاتین) زمانی دایكو بنچینەی ئەوانە. لەم سۆنگەوە بە کەڵك وەرگرتن لەم جۆرە داڕشتنو تاووتوێکردنەوەوە لەلایەن زمانناسانی زمانە ئێرانییەکان بەتایبەتی زمانەکانی فارسی ناوەڕاست بەزمانەکانی باکووری خۆرهەڵاتی ئێرانیان دەوت(دیالێکتەکان) هەموو ئەم دیالێکتانە لەزمانی فارسی میانە یا ئاشکراتر لەزمانی پەهلەوی وەرگیراون، وەك دیالێکتەکانی سوغدی، سکایی، خوارەزمی، باختەری (باکتەری)و هەراتی- هتد کە لەزمانی پەهلەوی باکوور وەرگیراون. نەتەوەناسانو زمانناسان گەلێ لە میللەتنانی ئەوروپا بەتایبەتی دانیشتوانی باکووری ئەوروپا وەك ئەسکەندەنافییەکان، ئەڵمانییەکان ولەبەشەکانی دیکەی ئەوروپادا

روسەکان و یۆنانی یەکان بەمیللەتانی برادەری ئارییەکانیان ناسیون هەروەها ئارییەکان هەر لەمێژەوە ڕێزیان لە دیاردەکانی سروشتی گرتوە پەرستن و ڕێزگرتنی چوار توخم واتە (ئاوو ئاگر، باو خاك) لەنێوان ئارییەکاندا باوبوە ولەوەودواش ئەم جۆرە ڕێزگرتنە لەنێوان ئێرانی یەکاندا پارێزراوە. ئارییەکان پەی یان بردووە بەرۆشنایی و تاریکی و کاریگەرییان لەژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری مرۆڤداو باشەو خراپەیان پەیوەست بەو دووهێزەوە زانیوە. لە سەرەتادا بۆ لەناوبردن و راکردن لەدەست هێزاە زیانبەخشەکان ونەخۆشی هێنەرەکان، دانەی پیرۆزە(جۆرە بەردێکی بەنرخەکەنگینی ئەمووستیلەی لێ دروست دەکەن وەرگێڕ) و مووررووی جۆراوجۆر لەشاخی گیانداران و گوێ ماسی یان بەگەردنیاندا هەڵدەواسی.

یاوەك بازن بەدەستیاندا هەڵدەواسی. بەبڕوای ئەوان و زۆر لەمیللەتانی دیکە کەهەمان ڕەفتاریان گرۆتۆتەبەر، ئەم مووروانەو وێنەی ئەمانەیان بەجادوویەك(تەلسیم) زانیوە کە لەتوانای گیانی پیس و هێزی زیانبەخش لەسنووری ژیانی مرۆڤ و گیانلەبەرو کێڵگەو کشتوکاڵ کەم دەکاتەوەو کاریگەرییان کۆنترۆڵ دەکا.

چەند نموونەیەك لەم شتە جادووگەرییانە وەك ئاسەوارێکی بەنرخ و فێرکاری لەئارییەکانەوە، لەهەڵکەندنەکانی دەڤەری فارس و لێکۆڵینەوەکانی دیکەی دێرینناسی پەیوەندیدار بەهەمان دەڤەرەوە بەدەست هاتوە. پتر لەمەش لەگۆڕەکانی مرۆڤدا ئامێری خۆجوانکردن و تانانەت کەرەسەو پێداویستەکانی جەنگ و ڕاو کەوتووەتە دەست کە ئەوانە بیرو بۆچوونی ئارییەکان بەزیندووبوونەوەی دوای مەرگ دەردەبڕێ. لەم گۆڕانەدا چەند پارچە قاپ و دەفرێ دۆزراونەتەوە ئەگەری ئەوە رادەگەیەنێ کە ئارییەکان

لەگەڵ مردوەکانیاندا بڕێ خۆراک و خواردنەوەیان لەم قاپانەدا بەخاك سپاردوەو لەو باوەڕەدابوون کەبەم کارە توێشەبەرەی دوای مەرگ بۆ ئەو مردوانە دابین دەکەن. پێویستە وەیاد بهێنرێتەوە کە زۆربەی میللەتانی رۆژهەڵات لەمێژدا، بەتایبەتی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا و میسرییەکان لەگەڵ مردوەکانیاندا قاپی خواردن و خواردنەوە، ئامێری خۆڕازاندنەوەو ئەسپ و کەنیزەك و کەرەسەی راوو جەنگ و تەنانەت کەل وپەلیشیان لەناو گۆڕەکاندا ناشتووە. پێویستە ئەوەش لەیاد نەکرێ کە ئەوکارە، زۆرتری بۆ توێژو چینی پیاوەگەورەکانی کۆمەڵگابووە لەپیاوانی رامیاری و سەربازی، فەرمانڕەوایان و دەسەڵاتداران کی گۆڕی فراوان و شکۆداریان هەبوەو لەناو ئەوشتانە دۆزراونەتەوە. بەڵام لای عیلامی یەکان و زۆربەی میللەتانی سامی و ئارامی خەڵکی ئاسایی و دەست ڕۆیشتووی نێو کۆمەڵگایان بەکۆمەڵ و هەندێجار لەناوچاڵی گەورەدا بەبێ هیچ توێشەبەرەیەك و کەرەسەو ئامێرێکی خۆڕازاندنەوە بەخاك دەسپارد. لەدەڤەری لوڕستان لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی دێریناسیدا چەند نیشانەیەکی بەنرخ و شایستەی توێژینەوە لەنیگاری خوای مانگ و نەخشی میترا(خوای خۆر)، کەپەیوەندی بەسەدەی حەوتەم و شەشەمی پێش زایینەوە هەبوە، واتە سەردەمی حکوومەتی مادەکان بەدەست هێنراوە. دیارە ئەم جۆرە نیگارانە، بەتایبەتی وێنەی نیوەی خۆر لەکاتی تیشك هاویشتن بۆ سەر پەرستگا بەردینەکانی سەردەمی مادەکان پەیوەندییەکی هەیە لەتەك کەلتووری سامی و ئارامی یەکاندا هەندێك لەتوێژەران دەڵێن کە سۆمەرییەکان لەوکارەدا یەکەم بوون. زۆریش لە پسپۆرانی مێژووی ئایینەکان و دێریناسان، سەردەمی دروستکردنی ئەم ئاسەوارە بەسەرەتای ناسینی خۆرو ناهید(هەسارەی زوهرە)و دەستکردن بەپەرستنیان دەزانن.

لەبابلدا شەمشŠamaš بەناوی خوای خۆرەوە، لەمیسر رەع(Ra) هەر بۆخوای خۆرو لەیۆنانی کۆن ئاپولوون Appollon دیسان بەناوی خوای خۆرەوە کە لەهیلیوس(Hellos)بە گۆی خۆرو کارپیسپێردراوی ڕێنمایی سووڕانی خۆرە، ئەوانەیان کە پەرستوە بۆسەر کەلتووری ئارییەکان کاریگەربووە. ئارییە کۆنەکان مانگو خۆریان وەك خوا کەدەبێ بیپەرستن دانەناوە. وەلێ ئەوانیان لەژیانی خۆیاندا، بەتایبەتی لەکاروباری کشتوکاڵو ئاژەڵداریو ژیانی ئابووریو بژێوییاندا بەکاریگەر ناسیوە. ئارییەکان بۆ بەدەستهێنانی بەرهەمی باشو بەپیتی کشتوکاڵو بۆ زیادبوونی ئاژەڵەکانیان باوەڕیان بەتوانای ئەو توخمانە هەبوەو وەهای بۆچوون کەتیشکی خۆرو بارانەکە فەوتانی کشتوکاڵو نەخۆشی ئاژەڵو مرۆڤ دوور دەخەنەوە لێیان. لەسنووری ژیاری پەیوەندیدار بەخەڵکانی دانیشتووی دەوروبەری کێوانی زاگرۆس، بەتایلەتی دەڤەری لوڕستان چەند نیشانەیەك لەسەر بڕوای ئارییەکان بەکۆمەکی سروشتو تووڕەبوونی لەهێنانی دەردوبەلای سروشتی بۆ کشتوکاڵو ئاژەڵداری دەست کەوتووە. ئەم جۆرە هزرە لەوەودوا، لەئێرانی پێش ئیسلامداو هەروەها لە بین النهرین دەستکەوتوە کەبۆتە راگەیاندنو ئامۆژگاری پێشەوایانی ئایینی کە فەلسەفەی ئایینی خۆیان لەسەر بنەمای کشتوکاڵو ئاژەڵداری راگرتبوو ئەم پێشەوایانە بەهاوکاری نێوانیان داونانەوە بۆراوو قوربانیکردن یان بەکارێکی دزێو داناوە. سۆمەرییەکان یەکەمین خودایانی خۆیان لەوێنەی گیانلەبەراندا بەرجەستەکردوەو راوی گیانلەبەرانیان بەگوناە داناوەو بەخێوکردنی ئاژەڵیان بە بەشێ لەکاری باش ژماردوەو بۆ ئەومەبەستە ئامۆژگاری خەڵکیان کردوە. نەخشو نیگارێکی زۆر لەم بوارەدا لەلایەن سۆمەرییەکانو دانیشتوانی دیکەی میسۆپۆتامیا وەك یادگار بەجێماوە.

ئارییەکان دیارە بیریان لەو هێزانە کردۆتەوە کە لەژوور توانای مرۆڤەوەن بۆ پاراستن و داڵدەدان و فرەبوونی گیانلەبەران و رانی ئاژەڵ، ئەم جۆرە فریشتانە یان بەپارێزەری ئاژەڵەکانیان و کارمەندان و ئەسپ و کشت وکاڵی خۆیان هاتۆتە بەرچاو. ئەو نەخشانەی لەسەر دەفرە گلێنەکان دروستیان کردوە، زۆرتری ئەم بۆچوونە لای مرۆڤ دروست دەکەن کە ئارییەکان بڕوایان بە پەرجۆو جادووگەری و ئەفسانە هەبوە. بڕێ لەم وێنەگەرییانە لەسەر شێوەی ئەندازیاری(شکڵی هەندەسی)ن وئەو هێزانەشیان دەدەن کەسروشتین و دەبنە هۆی پەیدابوونی کەش وهەوای باش و بارانی بەکەڵك، یا بەپێچەوانەوە لافاوو تووڕەبوونی سروشت.

ئەوەش دەبێ باس بکرێ کە سۆمەرییەکانیش لافاوو دەردوبەڵای سروشتی و ئاگر کەوتنەوەی سروشتی جەنگەڵەکان کە لەئەنجامی گەرمای زۆری خۆرەوە روویداوە بەتووڕەبوونی خودایان زانیوەو بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم رووداوانەو پێشگیری لە دووبارە بوونەوەیان دەچوونە ناو پەرستگاکانەوەو بەپێشکەشکردنی قوربانی زۆر لەپێناوی خواکانیاندا سەرنجی ئەوانیان راکێشاوە. ئەوەی کەلەم روەوە دەربارەی ئارییەکان دەتوانرێ باسی لێبکرێ بەم شێوەیە کە ئەم نیشانەو نەخشانە لەوێنەی خۆرو تیشکی رۆشنی ئەو لەکاتی بڵاوبوونەوەیدا بەچاو دەبینرێ. هەروەها شەوقی خۆر کەبڵاوەدەکاو نەخشی خۆر وەك باڵدار دەنوێنێ و هەورەبروسکەو گرمەی هەورکە نیشانەی بارانبارینەو بەدوایدا بەرهەم و ئاژەڵداری دوور لەنەخۆشی یە، موژدەی ئەوە دەدەن کە ئارییەکان لەم بوارەدا وێنەی روبارەکان و سەرچاوەکان و گیاندارانی کێوی بەشێوەی نەخش ونیگاری سەرنجڕاکێشەر کە ئەوچەمکانەی سەرەوە بەرجەستە بکا، وەك یادگارێ بەجێهێشوە.

## ج: ئابووری و پەیوەندی بژێوی ئارییەکان بەکۆچیانەوە

سەرچاوە مێژوویی دەشتەکانی ئێران و بارودۆخی هەرێمی دەڤەرە جیاجیاکانی ئەم دەشتانە بەراورد لەگەڵ سەرزەمین و وڵاتانی دراوسێدا بەخاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی زۆر دادەنێن. بارودۆخی جوگرافی دەشتەکانی ئێران کاریگەرییەکی زۆری هەبوە بۆسەر بەرهەمهێنان و ئابووری دانیشتوانی ئەم دەشتانە لەدێر زەمانەوە تا ئێستا. زۆربەی جەنگخوازان و داگیرکەران کەویستوویانە ئێران بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە شەیدای ئەو سەرچاوەی بەرهەمهێنانەو ئەو دەرامەتە ئابوورییانەی ئەوبوون. سەرزەمینی بەربڵاوی ئێران وەك پردێك، بەشەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئاسیای بەیەکترەوە بەستۆتەوە. پێگەی دەشتەکانی ئێران لەم روەوە بایەخێکی تایبەتی هەیە. لەسەردەمی دێریندا کە کاروباری دەریاوانی بەگیروگرفتێکی زۆردا تێدەپەڕی، ئەم دەشتانە تەنها رێگای پەیوەستبوونی بەشە جیاجیاکانی ئاسیابوون لەگەڵ یەکتردا. پتر لەمە ئەم دەشتانە وڵاتانی دەوروبەری دەریای مەغریبی لەتەك ئەوروپادا بەیەکەوە دەبەستەوە. ئەم شوێنە گرنگەی دەشتەکانی ئێران هۆی پەیوەندی خەڵکێکی زۆر لەهەموو جۆرە رەگەزێك و میللەتێبوو. شایستەی باسەکە ئەم بارودۆخی ناوچەیی و جوگرافی و ئاوو هەوایەی ئەو کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لەئایین و کەلتووری ئێرانییەکاندا لەهەموو بوارێکی جۆراوجۆردا. لەو روەوە کە دەشتەکانی ئێران بەپێچەوانەی میزۆپۆتامیاو میسرو هیند خاوەنی روباری گەورەو پڕ لەئاو نییەو زۆربەی رووبارە گەورەکان لەپەراوێزی ئەم دەشتانەدان یا کەم ئاوی و بێبارانی لەزۆربەی ناوچەکانی ئێراندا بەتایبەتی لەسەردەمی گەیشتنی ئارییەکان بۆئەوناوچانە گیروگرفتێکی زۆری لەسیستمی بەرهەمهێنان و کاروباری

کشتوکاڵ و ئابووری و بژێوی کۆمەڵگای ئارییەکاندا دروست کردوە ئەو ئارییانەی چوونەتە ناو دەشتەکانی ئێرانەوە سەختییەکی زۆریان چەشت تا کەرەسەو پێداویستەکانی دەستکردی ئاودێری ئاوگەیاندن بەزەوییە بەیارەکانیان فەراهەم هێنا، تا بتوانن ئەو بەشانەی لەژێر دەستیاندایە بچێنن. بەگوێرەی بۆچوونی هەندێ لەمێژوونووسان ئەم جۆرە هەوڵدانە لەکەرەسەو تایبەتمەندە بەرجەستەکانی ئارییە ئێرانییەکان دەروازەی بژێوی بۆ ئاوەڵاکردن.

بنەمای ئەو هەول و کۆششە لەبواری بە بەراوکردنی زەوییە دێمەکان ئەوەندە بایەخی هەبوە کە لەهزری ئایینی ئارییەکاندا ئەو باوەڕە کەوتە ئاراوە کە کشتوکاڵ و چاندن لە لیستی کارە باشەکاندا دابنرێن و هەمیشە بەباشە ناوببرێن. سەردەمی ئایینی ئارییەکانی ئێران و ئارییەکانی هیندی لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکەین بەم دیفاکتۆ ئاشکراو سەرنجڕاکێشەرە پەیدەبەین کەبارودۆخی هەرێمی و باری جوگرافی و سیستەمی بەرهەمهێنانی جیاواز لەنێوان ئەم دوو کۆمەڵگایەدا کاریگەرییەکی بەرچاوی لەپەیدابوونی جیاوازی نێوان ئایین و بیرو بڕوای ئایینزانیی ئەم دوو کۆمەڵگای ئاریایی ئێرانی و هیندییە هەبوە. سەرلەنوێ وردبوونەوە لەچۆنیەتی هاتنی ئارییەکان بۆ دەشتەکانی ئێران دەتوانێ زەمینە خۆش بکا بۆ لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنی کەلتووری ئارییەکان لەگەڵ میللەتان و تیرەکانی هاوڕەگەزیان. ئارییە ئێرانییەکان لکێکن لەخەڵکی هیندو ئەورووپا کەبەگوێرەی توێژینەوەکانی نەتەوەناسان و ڕەگەز ناسان کە دەربارەی میللەتانی هیندو ئەورووپا ئەنجامیان داوە، دەردەکەوێ کەلکی ئاریایی خاوەنی کەلتوورێکی دێرینن کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەهەمی پێش زایین(ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین) کە

ئەگەر بەراورد بکرێ لەتەك ئاسەواری کەلتووری و ئەدەبی خەڵکانی وەك یۆنانی و ئیتالیەکان کەخاوەنی کەلتوورێکی نوێترن پێشینەیەکی بەرچاو بۆلکی ئارییەکان دادەنرێ. تێکەڵبوونی مێژووی ئەفسانەکان لەفەرهەنگی کۆنی ئێراندا، خەریکبوون بەوردەکارییەکانی ئەم بابەتە دژوار دەکا، بەڵام چەند بەڵگەنامەیەکی جۆراوجۆر لەدەستدایە کە یارمەتیمان دەدا بۆناسین و زانینی سەردەمی کۆن و پێشینەی ئارییەکان. وردبوونەوەیەك بۆ رەوکردنی ئارییەکان، کە لەدوای جیابوونەوە لەخەڵکانی هیندو ئەوروپایی بەرەو باشوور.رۆیشتوون و دوای ئەوە دابەش بوون بەچەند لك و بەشێکی بچووکترەوە، توێژەران بە بارودۆخێکی جوگرافی تازە بەتایبەتی دەربارەی ئارییە ئێرانییەکان ئاشنا دەکا. گرنگترین ئەم بەش و لکانە بریتین لەبەشی ئارییەکانی هیندو ئارییە ئێرانییەکان و بەشی سکایی کەئەم بەشەیان بە سکاکانی ئاسیای ناوەڕاست ناسراون بەپێی چەند دۆکیۆمێنتێ کەلەم سەدەی ئێستادا کەووتوونەتە بەردەست سکاکان لە ئارییەکان یا ئێرانییەکانی باکوورن و ئەوەی لەم بۆچوونە پشتگیری دەکا زمانی ئەوانە، کەوەك یەکێ لەزمانەکانی ئێرانی باکوور دەستنیشان کراوە. شارەزاییەك کەلێی دڵنیابین و پشتی پێببەسترێ دەربارەی باری کۆمەڵایەتی و شێوەی ژیان یا بەگوزارشتێکی دیکە مێژوو وکەلتووری ئەم میللەتە ئارییانە لەسەردەمەکانی پێش مێژوو لەدەستدا نییە.

گرنگترین ئەم کۆسپانە پەیبردنە بەسەردەمێ کە تاڕادەیەك جێی بڕوابێ، بەجیابوونەوەی ئارییەکان لەخەڵکانی دیکەی هیندۆ ئەوروپا. هەنووکە ئەم خاڵە-کەتا ماوەیەك لەمەوپێش نەزانرابوو- روونەکە ئارییەکان دوای ئەم جیابوونەوە ماوەیەك پێکەوە ژیاون. هەروەها ئێستا تاڕادەیەك دەتوانرێ سەردەمی جیابوونەوەی ئارییەکان لەخەڵکانی هیندۆ ئەوروپایی لە

سنووری سێهەزار ساڵ پێش زاییندا دابنرێ. نزیکتر کردنەوەی ئەم سەردەمە لەئێستای ئێمەوە بەو هۆیەوە ناتوانرێ کەبەگوێرەی بەڵگەنامەو توێژینەوەکان، کتێبی ریگ‌ودا Rigveda کە کتێبی پیرۆزی هیندییەکانە لەپێش ساڵی هەزارو چوارسەد یا سەدەی پانزەهەمی پێش زایین نووسراوە. بەم جۆرە جێی گومان نییە کەلەم سەردەمە لەیەك دابڕاوەدا زمانی ئارییەکان جیاوازبووەو لکی ئێرانی و هیندی ئاریایی بەچەند زمانێکی جیاواز وتوێژیان کردووە بەپێی ئەم گریمانەیەو بەوردبوونەوە لەبۆچوونی زماننا‌سان یەك هەزارەی پێش ئەم سەردەمە واتە نزیکەی ۲٤۰۰ ساڵ پێش زایین (ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زایین) زمانی میللەتانی ئاریایی زمانێکی یەکگرتوو بووە. ئارییەکان سەردەمێکی دوورو درێژ زمانێکی یەکگرتوویان هەبوەو هەر هەموویان بەو زمانە گفت‌وگۆیان کردووە، چونکە ماوەیەکی زۆری گەرەکە واتە هیچ نەبێ چەند سەدەیەکی دەوێ تا هەرلکەی دیالێکتێکی تایبەتی بەخۆیەوە هەبێ کەوتووێژی پێبکا.

لەپێشتردا دیدو بۆچوونی زانایان و توێژەران لەسەر ئەم خاڵە چەقی بەستبوو کە ئارییەکان لەچەند ناوچەیەکدا لەدەوروبەری دەریاچەی ئاراڵدا بەشێوەیەکی یەکگرتوو وهاوبەش بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ نیشتەجێبوون. ئێستا ئەو باوەڕە لەئارادایە کەئەمان لەدەڤەرەکانی روباری سەیحوون و ئامو دەریا (ئامویە) ژیانیان بەسەر بردوەو زۆرتری لەکاتی جیابوونەوەیان لەیەکتر بەرەو ئاسیای ناوەڕاست و ئاسیای‌خۆرئاوا ملیان ناوە. لەو جێگایەی کە پاشماوەی نووسین و سەرنجڕاکێشەر لەسکایانەوە لەناودا نەماوەو مێژووی ئەم میللەتە تەنها لەبەڵگەنامەو بەردە. نووسراوەکان و ساڵنامەو یادنامەی پاشاکان و فەرمانڕەوایانی میللەتانی دیکەوە دەبیستین.

دەبێ ئەم راستیە بسەلمێنین کە شارەزایی ئێمە دەربارەی پێشینەی سکاکان و کەلتوورو کۆمەڵگای ئەوان تەنها بریتییە لەناوەڕۆکی بەردە نووسراوەکانی سەردەمی کۆن و ئاسەوارو نووسینەکانی مێژووناسانی یۆنانی و لێکۆڵینەوەکانی دێریینناسان کەدەبێ دەربارەی گۆڕستانەکانی فەرمانڕەوایانی سکایی و پاشماوەی هونەری ئەوان لەگەنجینەی(زیوێ)و مانەندی ئەو کە زۆربەیان لەگەڵ میللەتانی ئێراندا بەشێوەیەکی هاوبەش و چون یەك لەتەك کیمریان و میللەتانی دانیشتووی میزۆپۆتامیادا هەیانبوە، ئاگاداربین. نەبوونی بەڵگەنامەی تەواو دەربارەی سکایان دەبێ پەیوەندی بەوەوە هەبێ کەئەم میللەتە لە مێژوودا وەك خەڵکانێکی بەتواناو جەنگاوەرو لەهەمان کاتدا بیابانگەردوبێ دەوڵەت ناسراون. سنوورو شوێنی جێگیربوونی سکایان زۆر بەرفراوان بووە. لەناوچەکانی ناوەندی ئاسیای ناوەڕاستەوە هەتا لێوارەکانی رووباری دانووب بۆ ژیان بڵاوەیان کردووە.

ئێران لەو سەرزەمینانەیە کەبەپێی بەڵگەنامە مێژوویی‌یەکان لەسەردەمە دێرینەکانی خۆیدا، زۆر لەگەڵ ئەم میللەتەدا دیدارو پەیوەندییان هەبوە، چ لەسەردەمی مادەکان، چ سەردەمی هەخامەنیشان، چ لەڕۆژانی فەرمانڕەوایی یۆنان بەسەر ئێرانداو هەروەها لەسەردەمی سلووکی‌یەکان و سەردەمی ئەشکانی و ساسانیدا، ئەم پەیوەندییە روون و ئاشکرابووە.

ئاشکرایە لەم تێکەڵی و پەیوەندییە کەناوبەناو بەشێوەی پێکەوە ژیان ئاشتیانەو ئاڵوگۆڕکردنی خزمەتگوزارییەکان لەنێوانیاندا دەرکەوتووە، ئامادەبوونی سکایانی تیزخود(Sakka Tigra Khauda)ە لەسوپای هەخامەنشی‌یەکاندا بەگوێرەی هەواڵەکانی خودی داریوش لەبەردە نووسراوەکانیدا گەڕاینەوە بۆلای ئارییە ئێرانی و هیندییەکان کەلەدوای

کۆچیان لەئاسیای ناوەندیدا بۆ باختەر(باکتریا Baktria) هاتبوون و لەوێوە دەستەیەك یالکێکی هیندی یە ئارییەکان بەرەو کێوەکانی هیندوکوش Hindukuš ڕۆیشتبوون و بۆ دۆڵی پەنجابسەروخوار بووبوونەوەو لکی ئارییە ئێرانی یەکانیش بەرەو باشوورو خۆرئاوا ملیان نابوو ولەدەشتەکانی ئێراندا بڵاوەیان لێکردبوو.

هەندێ لەتوێژەران و بیردۆزان دەربارەی چۆنیەتی کۆچی ئارییەکان لەو باوەڕەدان کە ئارییەکانی هیند لەدەشتەکانی(پامیر)ەوە بەرەو هندستان ڕۆیشتبوون. هەروەها گومان براوە کەجێگای جیابوونەوەی ئارییە هیندییەکان و ئێرانییەکان لەئەوروپادا بووە. دوای ئەوەی هیندییەکان لەساڵی ١٧٠٠ پ.ز لەرێگای قەفقازەوە تا باکووری ئێران هاتوون و ئارییە ئێرانییەکانیش بەدوایاندا گەیشتوونەتە دەشتەکانی ئێران. ئارییەکانی ئێران دوای چوونە ناو ئێرانەوە، هیندییەکانیان کەبۆ باکووری ئێران هاتبوون بەرەو خۆرهەلات رەوانەکرد.

ناوی ئێران لەوشەی ئاریا وەرگیراوە بەواتای نیشتمانی ئارییەکانە. وشەی ئێستای ئێران، بەدرێژایی مێژوو بەچەند شێوەیەکی جیاجیا لەسەرچاوە ئایینی و مێژوویی و لەم دواییەدا لە فەرهەنگی زمانەکانیشدا هاتووە. بۆ نموونە بەشێوەی(ئیریانام) و دوای ئەو (ئایریان)، هەروەها(ئایران) و ئێستاش(ئێران) هاتووە.لە زمانی پەهلەوی ئەشکانی(اران) هەروەك چۆن ئەشکانی یەکان بە ئێرانزەمینیان وتوە(ئێران شوتر). وشەی ئێران لەپەهلەوی ساسانیدا ئێران(سعلس) دەگرێتەوە. دەوترێ کە(ئەراتوستن) فەیلەسووف و جوگرافیزان و شارەزای زانستی فەلەك و ئەستێرەناسی یۆنانی دێرین کە سەردەمی ژیانی ئەو وێدەچێ لەسەدەی سێیەمی پێش زایینیدا بووبێ، بۆیەکەمجار لەبەڵگەنامەکانی

یۆنانیدا بەشێکی لەئێران بەناوی(ئاریانا) وە ناوبردوە. بەوتەی(سترابون) جوگرافیازانی ناسراو لە(کتێبی پانزەهەم، بەشی دووەم و بەندی هەشتەم) سنووری ئێرانی بەگوێرەی گوفتاری(ئەراتوستن) بەم جۆرە دیاریکردوەو وتوویەتی: سنووری ئێران لەلای خۆرهەڵاتەوە بۆ روباری سند، لەباکوورەوە بۆ کێوەکانی پاراپامیز کەبەلای هەندێکەوە زنجیرە کێوەکانی ئەفغانستانی دەریای خەزەر یا دەروازەی کاسپین، وەلەلای باشوورەوە بۆ دەریای گەورەی عومان و لەلای خۆرئاواوە دەگاتە ئەوشوێنەی کەپارت لەمادو کرمان لەئەسفەهان(پارتاکنا Parata kena)و فارس جیا دەکاتەوە. سترابوون ئەم سنوورە بەهێڵێ دەزانێ کە لەدەربەندی دەریای خەزەرەوە تا کرمان درێژەی هەیە.

ئەمە نیشانەی ئێران یا ئاریانایە بەوتەی ئاراتوستن. وەلێ خودی سترابوون دەڵێ: بەشێ لەماد، پارس، باکووری باختەر(باکتریا- بەلخ)و هەروەها سەغد بەئاریانا ناودەبەن، چونکە ئەم خەڵکانە، زۆربەیان بەو زمانە گفت وگۆ دەکەن. سنووری جوگرافی سەرزەوی ئێران لەسەرچاوە مێژوویی یەکانی ئێران و نائێرانییەوە لەبەرچاوگرتنی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەریدا هاتووە جیاوازی لەبۆچوونەکاندا هەیە. لەسەردەمی هەخامەنشیدا بەگوێرەی باسەکانی گەزنووفون کە ئەفسەرێکی یۆنانی بووەو بۆ کووروشی بچووک کوری داریووشی دووەم برای ئەردەشیری دووەم کاریکردوە لەسەرەتای پەڕاوی(گەڕانەوەی دەهەزار کەسی)دا لەکوروشی بچووکەوە دەگێڕێتەوە کەئەو هەوڵ و جەنگی خۆی لەدژی براکەی بەجۆرێ درێژە پێدەدا کەببێ بەجێنشینی تاج و حکوومەتێ کە سنوورەکەی ئەوەندە بەرفراوانە کە لەیەک شوێندا مرۆڤ توانای گەرماو لەهەمان کاتدا

لەشوێنێکی تریدا توانای بەرگری و راوەستانی بەرامبەر بە سەرمای سەختی ئەو نییە.

بەو جۆرەی کە دەیزانین ئەم ئیمپەراتۆریەتە لەلایەکەوە بە روباری دانووب لەباکووردا و لەلایەکی دیکەوە لە حەبەشە لە ئەفەریقادا کۆتایی هاتووە.

بەڵام ناتوانین ئەمە بەئێران ناوبەرین. لەسەردەمی ساسانیەکاندا بەپێی ئەو ئاسەوارانەی پەیوەندییان بەو مەسەلەوەیە، سنووری ئێران یا ئێرانشەهر زۆر بڵاوبوە چونکە پاشاکانی ساسانی شاری(کلدە) بابلی کۆن یا پایتەختیان بەو بۆنەوە، کە پایتەختی ساسانی یەکان لە(تەیسەفوون) بوە بەدڵی ئێران شەهر ناوبردوە.

**د/ ئاری و ئێرانییەکان لەدیدی نەتەوەناسییەوە( ئەتنۆلۆژی ):**

ئەو سەرزەمینەی، ئێرانییەکان لەکۆنەوە نیشتەجێبوون تێیدا بەگوێرەی ئەونەخشانەی لەبەردەستدان لەجیهاندا ئێرانی هەنووکە دەگرێتەوە:

جگە لەوە لەخۆرهەڵاتدا بلۆجستان و سەرزەمینی پاکستانی ئێستا، ئەفغانستان و سەرزەمینی تورکمانستان لەروسیاو ئەزبەکستان و تاجیکستان و چەند بەشێ لەقەفقاز(سەرزەمینی ئالانی کۆن، کەئەمڕۆ بەئوستەکان ناودەبرێن، وەلێواری باکووری دەریای رەش(سەرزەوی سکیتەکان و سەرمەتەکان)ی گرتۆتەوە.

لەمێژەوە مێژوونووسان و توێژەران لەناوچەی باکووری تورکنشینەکان شارەزاییەکی بایەخداریان بەدەست نەهێناوە، بەڵام دەربارەی شارستانی یەکانی ناسراو بەزاگرۆس کەپەیوەندییان بەهەزارەی سێیەمی پێش زایینەوە هەیە بەکۆمەڵی دیکۆمێنتە سۆمەری و ئەکادییەکان شارەزایی و چەند بەڵگەنامەیەك بەدەست دێ کە یاریدەی توێژەران دەدەن و

بەرەوپێشیان دەبەن. لەویدا بەتایبەتی لەدۆڵە شینایییدارو بەپیتەکاندا خەڵکانێ کەشێوەیەکی بەرچاوو سەرنجڕاکێشەریان لەکاروباری ژیان و پێشڕەویدا هەبووە، هەر لەمێژەوە جێگیربوونیان هەڵبژاردوە، کەرەنگە لەباکوورەوە بەرەو باشوور لەجووڵەو پێشڕەویدا بووبێتن.

بۆ نموونە لە سووزیانا(خووزستان) عیلامی یەکان، لە لوڕستان کاسی یەکان، لەکوردستان گۆتی یەکان و سۆبارییەکان و دوای ئەوان خەڵکانێ کە ئیمپەراتۆرییەتی (میتانی) یان دروست کرد، کەبە(حوورییەان) ناسراون. ئەمجا لەنیوەی یەکەمی یەکەمین هەزارەی پێش مەسیح(ماتائییان)و مووساسیریان وتیرەکانی هیندۆ ئەڵمانی یەکان کە پێکهێنەری میللەتانی(ئورارتوویی)ن، کە بەوانەوە لەلای خۆرهەڵاتەوە(خاتی)یەکان و میللەتانی (هیتی) لەپێش هیندۆ ئەڵمانی یەکاندا پەیوەندییان کردوە. ئەم میللەتانە کەزۆر لەپێش کۆچی(سامی یەکان) جێگیربوون، بەهۆی ناوەکانیانەوە (ناوی کەسایەتی یەکانیان)و نووسراوی سەر بەردیان بەچەند زمانێکی جۆراوجۆری ئاسیایی کۆن چەند نیشانەیەکیان دەربارەی خۆیان بەیادگار بەجێهێشتوە. وادیارە کە یەکەمین گرووپی ئاریایی لەهەزارەی دووەمی پێش مەسیحدا لەم ناوچەدا جێیان هەڵبژاردووە وتیا جێگیربوون. ئەم گرۆهە لەزەمەندەکانی تورکستانەوە هاتوونەتە شوێنە بەرزەکانی ئێران. پێویستە ئەوەش وەیاد بهێنرێتەوە کە (کاسی)یانی ناوبراو دەوڵەتی (کاسی)یان لە بابل دامەزراندووە. دامەزراندنی حکوومەتی کاسی یەکان لەوێدا سەدەی هەژدەهەمی پێش زایین، لەدەوروبەری ١٧٠٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح بووەو درێژەی فەرمانڕەوایی ئەوان لە بابلدا نزیکەی پێنج سەدە، واتە لە(١٧٠٠-١٢٠٠پ.ن) بووە. وەلە باکووری (میسۆپۆتامیا)

ئیمپەراتۆرییەتی میتانی لەسەدەی شانزەهەمی پێش زایین(نزیکی ١٥٠٠ ساڵ پ.ز) بوەو درێژەی حکوومەتی ئەوان لەباکووری نێوان دوو روبـاردا نزیکەی دوو سەدە واتە لە(١٥٠٠-١٣٠٠ پ.ز)ە. ئاشکرایە دوای ئەو دوو فەرمانڕەواییەی باسکران واتە کاسییانی بابل و میتانی، چەند دەوڵەتێ لەباکووری میزۆپۆتامیا دروست بوون. ئەم دەوڵەتانە لەکەلتووری دەوڵەتانی پێش خۆیان(دەوڵەتی خۆماڵی ئەم دەڤەرانە) بەپێی پێویست بەهرەمەندبوون- ناوی کەسەکان بەزمانی هیندی و ئێرانی و ناونیشان و نازناوو ناوی گیانلەبەران و کەرەسەی جەنگ و راوو پێداویستەکانی ژیان وەك بوونی ئەسپ و بوونی عەرەبانە کەنیشانەی شارستانین لە تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی ئارییانی هیندی و ئێرانین. هەر دوو توخمەکە پەیوەندییان بەتوێژی رابەر یا فەرمانڕەواوە بوەو لەهاوبەشبوونیاندا هیچ گومان نییە. ئەوبەشە لەئارییەکان کە لەئێراندا شوێنێکیان دەستنەکەوت بۆ مانەوە، لەڕێگای خۆرهەلاتی زەوییە بەرزەکانی ئێرانەوە، رێڕەوەکانی ئەفغانستان و بلۆجستانیان بەجێهێشت و گەیشتنە دەڤەرەکانی روباری سند.

هەروەها ئەوان لەشارستانییەتیدا پێش ئارییەکان کەوتن و شارستانێتی ئارییەکانی هیندییان درێژە پێداو کۆمەڵگاو شارستانێتی و نیشتمانپەروەری هیند، بەهۆی ئەوانەوە بەرجەستەبوون. گەیشتنی تیرەیەك لەئارییەکان کە لەپێشا چووبوونە زەویە بەرزەکانی ئێران بۆ رۆژئاوای ئێران، کەمێژوو ئەوان بە ئارییە تازە نیشتەجێبوەکان لەرۆژئاوای ئێراندا ناودەبا، دەبێ لەماوەی چواریەکی یەکەمی هەزارەی یەکەمینی پێش لەدایکبوونی مەسیح روویدابێ. ئەمانە ئەو کەسانەن کە لەکۆتایی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، دوای یەکگرتن، دەوڵەتی مادیان دروست کرد. لەم

روەوە لەباسی مێژووی ماددا قسەی لێدەکرێ. ئەوان لەدوای فەرمانڕەوایی سەدەو نیوێ لەلایەن بەشێکی دیکەوە لەئارییەکان کە چووبوونە باکووری شوێنە بەرزەکانی ئێرانەوەو لەسەرزەمینی پارس دا بەناوی پارسەکانەوە جێگیربووبوون لەناوچوون و کوروش لەناوبەری دەسەڵاتی ماد دوای ماوەیەکی کەم دەوڵەتی لیدی بە رابەری کرزوس) Kroisos لەساڵی(٥٤٦ پ.ز)دا رمان و چەند ساڵێ دوای ئەوە لەساڵی ٤٣٩ پ.ز ئیمپەراتۆری بابلی سەرنگوون کرد. لەم روەوە لەباسی هەخامەنشییەکاندا بەدرێژی قسەی لەسەر دەکرێ، کە لەوانە کەمبوجیە بەگرتنی میسر ئیمپەراتۆرییەتی فراوانتر کرد. لەم روەوە لەباسی سیاسەتی سەربازی هەخامەنشیەکان لەشوێنێکی‌تردا بەدرێژی باسی دەکرێ. دوای ئەوە داریوش بەهۆی لەشکرکێشی خۆیەوە بەرەو خۆرئاوا وەك دەڤەرەکانی بالکان، و لەخۆرهەڵاتەوە بۆ هندستان بەفراوانکردنی دەوڵەتی پارسەکان یا ئیمپەراتۆریەتی هەخامەنشیان کۆمەکی کردوە. جەنگ دژی میللەتان و تیرەکانی باکووری ئێران وەك سکایان هەردەم بەشێ لەهێزەکانی سوپای هەخامەنشیانی خەریك کردوە.

ئەم دەوڵەتەلەکۆتاییدا لەساڵی ٣٣٠ پ.ز لەلایەن ئەسکەندەری مەقدۆنییەوە کە بەئەسکەندەری گەورە ناسراوە سەرنگوون بوو. لەروانگەی نەتەوەناسانەوە، ئێرانی دێرین لەپێشدا بەمیللەتان و تیرەکانی خۆرئاوای ئێران وەك مادەکان لەخۆرئاواو باکوورو پارسەکان لەباشووری ئێراندا دابەش دەبێ. پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کە دەستنیشانکردنی میللەتانی ناوبراو لەلایەن جوگرافیازانانی وەك(سترابوون) لەسەر بنەمای شارەزایی مێژوویی و میللەتناسی یۆنانیانی دێرین پێکهاتوە. گەرچی دەربارەی میللەتانی مادوپارسی لەو باسانەدا پەیوەندی بەوانەوە هەیە لەشوێنی

خۆیدا لێی دەدوێین، وەلێ باسی ئەم خاڵە بەپێویست دەزانم کە جگە لەبەڵگەنامەی ئاشکرا لەمادەکان خۆیانەوە، بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان و بەردە نووسراوەکانی سەردەمی هەخامەنشی، چەنجار ئەوە دووپات و پشتگیری لێکراوە کەمادو پاسەکان لەڕەگەزی ئاریان و مادەکان بەهەموو تیرەکانی باکوورو خۆرئاوای ئێرانەوە لە (رەگا) کەڕەنگە(رەی هەنووکە) بێ لەباکووری تاران، هەروەها ئەکباتانا (هەمەدانی ئەمڕۆ) جێگیربوون. لەپاڵ ئەم نەخشە جوگرافی و نەتەوە ناسییەوە، پارسەکان لەباکووری(پاسارگاد) تەختی جەمشیدی ئێستا لەنزیکی شیراز جێنیشتەبوون. خزم و کەس وکاری پارسەکان، دانیشتوانی سەرزەوی وەك کەرەمانا(کرمان)، ساگارتا هەروەها رەنگە (شاگرت= شاگرد، مەکا= مکیران لەباشوور کە ئەوانە لەبەردە نووسراوەکانی داریووشدا ناویان هاتوە.

دانیشتوانی خۆرهەلاتی ئێران لەبەشی خۆرهەلاتی سەرزەویی شۆرەزاری ناوەندی ئێران بریتین لە روخجیان، هەریویان یا ئاریویان، هەراتی یەکان، قەندەهارییەکان، ستگیدیان و باکتریان(بەڵخی یەکان). سکایان و سوغدیان( فەرغانە Sugdava)و خوارەزمیان (دانیشتوانی دەڤەری خیوە Hwaraz Miya)و دەهایان و ماساژتان (ماساگنایان) لەدەڤەری باشووری خۆرئاوای دەریاچەی ئاراڵ، هەروەها هیرکانیان (لەگورگانی ئەمڕۆ)، بەتایبەتی پارتەکان لەخۆراسان، ئێرانییەکانی باکوور پێکدێنن. سەرمەتیان و سکیتیان، ئالانەکان و ئیستەکان کە لەباکووری ناوچەی قەفقازو دەریای رەشەوە تا روباری دانووب لەگەڵ میللەتانی ئەڵمانی لەخۆرئاوا کە لەگەڵ باستانیان پەیوەندییان هەیە، لەراستیدا بەمیللەتانی ئێرانی دەژمێردرێن و تاسیتۆس ئەم زانیارییەی وەك سەرچاوەیەکی جوگرافی خستووەتە بەردەست مێژووناسان. لێرەدا باس

دەربارەی ئێرانی‌یە باکوورییەکانە. ئەم خاڵە هێشتا لەشوێنی خۆیدا شایستەی لێکۆڵینەوەیە کەبۆچی ئەم هەموو میللەتە ئێرانیانە کە لەناوابوون و بە بۆچوونی هەموان تێکڕا ئاری‌بوون کەچی تەنها مادو پارسەکان دادەنرێن بە دروستکەری مێژووی رامیاری ئێران؟ هەروەها بۆچی و لەبەرچی ئەوانە یەکەمینی حکوومەتەکان یا باشتر بڵێین دەوڵەتەکانیان لە شوێنە بەرزەکانی ئێراندا دامەزراندوەو لەمێژوودا دەدرەوشێنەوە؟

دەبێ وەبیر بهێنرێتەوە کە هاوکات لەتەك دامەزراندنی دەوڵەتی ماددا بەناوی یەکەمین دیاردەی فەرمانڕەوایی ئارییەکان- هەروەك لەمەوپێش ئاماژەی بۆکرا، لەخۆرهەڵاتی ئێران واتە لەسنووری باشووری رووسیای ئەمڕۆو سەرتاسەری ئەفغانستانی ئەمڕۆ، خەڵکانێ دەژیان کە هەرچەندە خاوەنی سیستمی بەڕێوەبردنی تیرەکان بوون، نەدەوڵەتیان پێ‌دەوترێ‌و نەئێمەش بەدروستی ئاگامان لەبنەمای فەرمانڕەوایی ئەوانەو سیستمی بەرهەمهێنان و بەڕێوەبردنی کاروباری تیرەکان و تەنانەت پەروەردەکردنی گیانلەبەرانی بەکەڵك وەك ئەسپ لەنێوانیاندا رەواجی هەبوە، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە دەوڵەتێکی هاوکات لەگەڵ مادەکانداو لەدواییدا لەگەڵ پارسەکاندا دابمەزرێنن. نموونەی بەرچاوی ئەوان سکانن کە لەپەروەردەکردنی ئەسپ و بەڕێوەبردنی تیرەکانی خۆیاندا بەشێوەیەکی رەق و سەرەڕۆیانە شان بەشانی مادەکان و پارسەکان ناویان دەبرێ کە تەنانەت ئێمە لەمەولا ئاماژەیان بۆ دەکەین کەچۆن موغان(پێشەوایانی ئایینی زەردەشتی/ وەرگێڕ)بەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرەکان لەکاروباری ئایینی و هەڵس‌وکەوتیاناو سوود وەرگرتن لەگەرماوی هەڵمیان لێوە فێربوون. دەبێ بشگوترێ کە لەمەودوا هاوکات لەگەڵ حکومەتی

ئەشکانیاندا دەوڵەتی کووشان Kušan دروست دەبێ کەڕۆڵی ئەوان شایستەی توێژینەوەو بایەخ پێدانێکی زۆرە. میللەتانی دانیشتووی ئەفغانستانی ئێستا وەك پەشتۆکان بەتایبەتی شایستەی باسن کە لەزۆربەی تێبینییە کەلتوورییەکاندا ریشەی هاوبەشیان لەگەڵ ئێرانییەکان و دانیشتوانی ناوەندو خۆرهەڵاتی دەشتەکانی ئێرانیان هەیە. لەسەرەتادا ناتوانرێ هیچ کات لەتوێژینەوەی مێژووی مادو هەخامەنشیدا لەژێر ناوی دوو دەوڵەتی ئارییایی باسێ دەربارەی خزمایەتی سکاکان یاکەمترین پەیوەندی نێوان مادەکان و پارسەکان لەگەڵ سکایان و سکیتەکان، بهێنرێتە ئاراوە. داریووشی یەکەم(٥٢٢-٤٨٨ پ.ن) لە نووسراوە بەردینەکانی خۆیاندا لەسکایانی تیزخود لەناو سوپای خۆیاندا وەك کەسانێ کە گوێڕایەڵ و سەرسپاردەی ئەون ناو دەبا. لەپێشتردا لەجەنگی نێوان مادو بابلییەکان لەلایەکەوە لەتەك ئاشوورییەکانداو لەلایەکیترەوە کە لەباسی مادەکاندا لەو رووەوە دەدوێین، دەبینین کە سکاکان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، لەکاتێکدا کیاکسار پاشای لێهاتووی ماد لەبەرەی نەینەوادا خەریکی جەنگ بوو لەگەڵ ئاشوورییەکاندا دەچنە سنووری مادەکانەوەو روو بەپاشای ماد لەبەرەی جەنگ لەگەڵ ئاشوورییەکاندا وەردەگێڕن و لەکاروباری جەنگ لەگەڵ ئاشوورییەکاندا بەشێوەیەکی کاتی پشێوی دروست دەکەن.

ئەوی لێرەدا شایستەی باسە، جووڵانی وردە وردەی سکاکیان تا سەدەی دووەمی پێش زایین و پێشڕەوییان بەرەو باشوور تا دەڤەری دەریاچەی هاموون. ئەمە هەر ئەو دەڤەرەیە کەلەو سەردەمەدا(درانگیانا) یا(درانگیان) یان پێدەوت و بەکارهێنانی ئەو لەهەموون یا دەشتی هاموون یا دەوروبەری دەریاچەی دەشتی هاموون زیاترەو لەهەمان کاتدا چەمکی

سەرزەویی سکایانی هەبوە. ئەوەی پەیوەندی بەلقەکانی ئاریایی جێنیشتە لەباکووری خۆرهەڵاتەوە، هەبێ کەم تا زۆرێ جێگای لێکۆڵینەوەو دیاریکردنە، وەلێ یەکێ لەو چەند رووداوە کە نەزانراوە، کۆچی بلۆچەکانە لەزێدو نیشتمانی خۆیانەوە کە رەنگە قەفقازو ئازربایجان بێ بەرەو باشوور. بلۆچەکان دوای ئەم کۆچە کە خەملاندن و دیاریکردنی سەردەمی ئەو زۆر دژوارەو تاڕادەیەك ستەمە لەدەڤەرەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئێراندا لەچەند دەڤەرێکی وەك موکران و کرمان هەتا خۆراسان جێگیربوون.

هەندێ لەنەتەوە ناسان لەبەر ئەوە بلووچەکان بەتیرەیەك لەسکایان دادەنێن بۆ باشووری خۆرهەڵاتی ئێران کۆچیان کردوە کەبەوێ (زرنگیا Zrangia)شیان وتوەو هەر ئەوسیستانە(Siestan)یە. ئەم نەتوانینەی دیاریکردنی سەردەمی بلووچەکان بەهۆی نەبوونی نیشانەو ئاسەواری ئەم کۆچەوەیە کەئەوە لەکاتێکدایە کەکۆچی میللەتانی بێگانە یا نائارییەکان ئاسەوارو بەڵگەی بەهێزیان لەسەر زەوییەکانی دراوسێیانەوە بەجێهێشتووە. لەو جۆرە دەتوانرێ شەپۆلی کۆچە بەرفراوانەکانی ئاسیای ناوەندی ناو ببرێ کە دەرەنجامی ئەوە سکیتەکان کەوتنە ژێر گوشارەوەو ناچاربوون بە بەجێهێشتنی سەرزەوییەکانی خۆیان و هێرش بردن بۆ چەند ناوچەیەکی دیکە بۆ جێگیربوون تیایدا. بەروو وەرگێڕان لە سنوورەکانی قەفقاز کە شەپۆلەکانی کۆچی کیمری‌یەکان و سکایانی لەسەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی پێش زایینداً بەخۆوە دیوە، بەڵگەنامەکانی ئەم جۆرە وانیشان دەدەن کەسەدەی هەشتەمی پێش زایین رووداني هێرشی خۆراسانی‌یەکانی کۆن بووە بۆ باکووری خۆرهەڵاتی ئێران و دامەزراندنی حکوومەتێکی خێڵەکی بەهێز دەبێ لەبەرچاو بگیرێ و کوروشی دوەم دامەزرێنەری دەوڵەتی هەخامەنشی لەساڵی (٥٢٩ پ.ن) هەر بەدەستی ئەوان

کوژراوە لەباسەکانی لەمەودوا بۆ ئەم مەبەستە ئاماژە دەکرێ کە لەسەدەی سێیەمەوەو بەدرێژایی سەدەی دوەم پێش زایین پارتەکان(ئەشکانی‌یەکان) دژی تیرەی سکیت(سکایی) خەباتیان کردوەو دوای ئەوە ساسانی‌یەکان کە لەساڵی ٢٢٦یا٢٢٥ی زاییندا بوون بەجێنشینی ئەوان، ئەو خەباتەیان بەشێوەیەکی فراوانتر دژی تیرەکانی سکیت درێژە پێداوە. ئەم کۆمەڵە لەتیرەکانی سکیت لەمێژوودا بە(هەفتالیان) یا بەوتەی توێژەرانی نوێ(ئەبدالیان) ناسراون‌و دوای ئەوە بە(هوونانی سپی) ناوبراون. لەئەفسانەکاندا بەسەر زەوی ئەوان توورانو بە خۆیان تووڕانیەکان ناوبراون.

لەسەردەمەکانی ئیسلامدا میللەتی تورك، خەڵکانی جێنیشتەی باکووری ئێران، کەلەو شوێنانە باکووری خۆرهەلاتی ئێرانە خستەژێر گوشارەوەو ئەوانیان لەدەڤەرەکانی باشوورو خۆرئاوادا ناچار بەتەنگترکردنی سنووری دەسەلاتیان دەکەن کەبێجگە لەوشەی (ناچار بە پاشەکشە) گوزارشتێکی زمانەوانی دیکە نەماوە، بۆ ئەو مەبەستە بەکار بهێنرێ(. هەندێ لەم میللەتی تورکە بە تاجیکەکان یا سرتەکان ناسراون. تورکمانەکان‌و تا تارەکان ئەوانیان خستۆتە ژێر گوشاۆەوەو بەرەو خۆرهەلات راویان ناون‌و هەندێ باکووری خۆرئاوای ئێرانیان بەجێگای ئەو راوانراوانە داناوە. هەندێ لە سەرزەوی مادی کۆن واتە ئازربایجان، جگە لەهەندێ شوێنی کەمو بەرچاو، زمان‌و کەلتووری ئەوان سەرزەوی تورکی‌یە. ئەم خاڵە پێویستە رەچاو بکرێ کەهەندێ لەتوێژەران هەوڵیان نەداوە ئەم راستیە بەدەست بهێنن کەجێگا بەرزەکانی ئێران جێی‌پێشوازی بوە بۆ میللەتان‌و چەند تیرەیەکی جۆراوجۆر، کە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە جێنیشتەبوون‌و مانەوەی ئەم تیرانە پەیوەندی بەخودی خۆیانەوە هەبوە، کە لەکاتێکدا

چوونە ناوەوەی ئەم میللەتانەو دەرچوونی ناچاری دانیشتوانی خۆماڵی خۆی لەدەڤەرەکانی ئێران بەو جۆرەی کە بەچەند نموونەیەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا، ئەم دەرەنجامە رەت دەکاتەوە.

نموونەیەکی ئاشکراو پێزانراوی ئەوانەی لەیەکەم جاردا جێگیربووبوون دانیشتوانی سەرزەویی عیلامە لەباشووری خۆرئاوای ئێران کە زۆرتری رەنگە قولە رەشەکانی (کۆیلە) حەبەشی بووبێتن. بەشێوەیەکی گشتی و نەگۆڕی دێریناسان و توێژەرانی مێژووی عیلام، رەشەکانی حەبەشی بە دانیشتوانی یەکەمجاری عیلام دەناسرێن کە هەموو لێوارەکانی دورگەی فارسی هەتا موکران و بلوجستانیان بەدەستەوەبوەو خۆیان خستۆتە ژێر رکێفی داگیرکەرانەوەو لەگەڵ ئەواندا تێکەڵ بوون و رەگەزێکی دوورەگ و ئاوێتەیان پێکهێناوە کە دانیشتوانی شووش و رەنگە بەشێ لەکوردستانیشی گرتبێتەوە. بەوتەیەکی دی بۆ پەیوەندیداران و توێژەرانی بابەتی نەژادی و نەژادناسی ئەم مەسەلە روون و نکوڵی لێنەکراوە. هەندێ لەمێژوونووسان ئەم تێکەڵبوونە بەم جۆرە باس دەکەن: دانیشتوانی یەکەمجاری عیلام خەڵکانێکی نیوەرەش بوون کەوادیارە دەچوونەوە سەر رەگەزی دراویدی و ئەم رەشپێستە کەللەسەر درێژانە بەهەوێنی رەگەزی میدترانەیی دەزانن. لەهەموو شوێنێکی ئێراندا تا خۆراسان و ئەفغانستان، توخمی ئێرانی لەئێراندا پەیدابووو ئەوەی لەئاسیای ناوەندیدا پەیوەندییان بەتورکەوە هەبووبێ بۆ مێژوونووسان هەمیشە گەر لیستێکی دیکەی نەتەوەی سامی بووبێ جێی سەرەنج راکێشان بوە. بوونی پێوەرەکانی فەرهەنگی سامی لەبواری هونەر، نووسین و زمان، بیناسازی و بیرو بڕواو چەند فاکتەرێکی دیکە، دەتوانرێ دابنرێ بەکاریگەریی شارستانێتی سۆمەر لەسەر عیلام وەك نموونەیەکی بەرجەستەو بەبەرچاوەوە.

بەوردبوونەوە لەهەموو گۆڕانكاریو ئالوگۆڕێ كە ئێران تاقیكردۆتەوە، بنەماو پوختەی كەلتووری ئێرانی لەزۆر لەناوچەكانی وەك فارس، ناوچەكانی ناوەندی لە ئێراندا، خاكی كوردنشین و لوڕنشینی خۆرئاوای ئێران و لەباكوورو باكووری خۆرهەلاتی ئێراندا، لەگەڵ ئەو هەموو گوشارو هەورازو نشێوەدا پارێزراوەو تورك و مەغۆل و عەرەب و پێشتریش یۆنانییەكان ئەوەیان بەدەست هێناوە. هەرچەندە چەند میللەتێك و چەند تیرەیەكی جۆراوجۆر لە ئێراندا هەبوون و ژیاون بەلام لە ماوەی هەزارەها ساڵدا هەموو لەژێر ناوو قاڵبی ئێران و میللەتانی (ئیریا)و تیرە ئێرانییەكان لەمێژوودا ناسراوو چەسپاون.

ئەوەی كە كاریگەرە لەپاراستنی ئەم كەلتوورەدا هاوزمانییەكە بەدرێژایی مێژوو، ئێران ئامادە نەبوە كەزمانی خۆی بگۆڕێتەوە بە زمانێكی دیكە وەك یۆنانی، عەرەبی و توركی و مەغۆلی- هتد. میللەتان و تیرەكانی ئێرانی بەهەرزمان و دیالێكتێ ئاخافتن بكەن و ئەمڕۆ لە نێوانیاندا باوبێ لەژێر ناوی زمانەكانی ئێرانیدا دەناسرێن.

وەك دیالێكتی كوردی، لوڕی، گیلكی (گیلانی)و چەند دیالێكتێكی دیكە. وەزمانێ كەئێرانی نییەو لەنێو ئێرانییەكاندا سوودی لێوەردەگیرێ و گفتوگۆی پێدەكرێ بەناوی خۆی و بەهەمان ناونیشان كەهەیەتی ناودەبرێ وەكو تورك و عەرەبی....هتد. لەمێژووی ئێراندا بەتایبەتی لەئەفسانە مێژووییەكانی ئێراندا باسی ئێران و غەیری ئێران یارووییەكی ناسراوی ئێرانی و نائێرانی زۆر بەجیاوازو هەستیارییەوە ناوبراون كە وادەردەكەوێ لەنێو باوو باپیری ئێمەدا رەواجێكی زۆری هەبوەو بە گرنگ دانراوە، بەتایبەتی لەسەردەمی پارتیان (ئەشكانیان)و ساسانییەكاندا ناوی ئێران و ئەنئیران بەواتای ئێران و ئەنیران یا نێو ئێران و دەرەوەی ئێران باوبوە.

هەروەها ئەم ناوونیشانانە دەربارەی زمانی ئێرانی لەبەراورددا لەگەڵ زمانە نائێرانییەکاندا بەکارهاتووە ئێرانییەکانی سەردەمی دێرین بۆ سەرزەمینی ئێران و ئێران نشین سنوورێکی تەواو دیاریان رەچاو کردبوو وهەرچی رووداوێ لەدەرەوەی ئەم سنوورەدا ببوایە بە ئەنیران ناویان دەبردو فەرهەنگ و شارستانیی ئێرانیان لەبەرتر دادەناو ئەم رێسایە لەلایەن تێکڕای مێژووناسان و زمانناسان و میللەت و رەگەز ناسانەوە پەسەند کراوە کەهەرچی خەڵکانێکی سەر بەرەگەزی ئاری چ لەئێران و چ لەهیند یا لەسەرزەوییەکانی دیکە لەیەك نزیك کردبێتەوە تەنها زمانە کەپەیوەندی نێوان ئەم میللەتانەی بەرجەستە کردوە. لەلاپەڕەکانی پێشوودا لەباسی زمانەکانی هیندو ئێرانی، هیندۆ ئەڵمانی، هیندۆ ئاریایی، یا هیندۆ ئەوروپایی بەپێی پێویست وتوێژی لەسەرکرا. لێرەدا لێك دابڕان و دووری جوگرافی یۆنانییەکان، رووسەکان، ئینگلیزەکان و ئەوانی دی کەبەیەك رەگەزەوە بەستراونەتەوە، دیارە بەسەرنجدان لەپەیوەندی راستەوخۆی زمان و رەگەز لەنێوانیاندا، زمانیان هەر لەیەك خانەوادەیە، وەك چۆن هەموو بەیەك رەگەزەوە بەستراونەتەوە.

### هـ هاوبەشییە کەلتوورییەکانی دیکەی ئارییانی هیندۆ ئێرانی:

ئەو بەشە لەئارییەکان کە لەهەزارەی دوەمی پێش مەسیح لەئاسیای ناوەندییەوە کۆچیان کردبوو وهێشتا پێکەوەو بەشێوەیەکی چونیەك ژیانیان بەسەر دەبرد، لەمێژوودا بە(هیندۆ ئارییان) ناسراون.

ئەوانە وەك بۆماوەی باووباپیری خۆیان شتێکیان بەناوی جیهانی ئایین و بیرو بڕوای هیندۆ ئەڵمانییەکانیان برد بۆ ئەو سەرزەمینە نوێیەی کۆچیان بۆکرد. ئەم ئایین و باوەڕە ئەمڕۆ ناونیشانی (پلەو جۆری ئاریایی) لەپەرستندا گرێداوە بەخۆیەوە. ئارییەکان دیارە لەدوای جێگیربوونیان و

ئاشنابوونیان بەولاتی نوێیانەوە لەتەك داب و نەریت و باوەڕی خەڵکانی خودی ئەو ناوچانەی پێوە پەیوەست بوون روو بەڕووبوونەوە. باوەڕو پێوەرە فەرهەنگی‌یە زۆر پێشکەوتوەکان لەچاو ئەو رۆژگارەدا لەهەزارەی دوەمی پێش زایین، بەڵکو پێش ئەوکاتەش واتە لەهەزارەی چوارەم و سێیەمی پێش مەسیح لەسەر بنچینەی هزری ئەم تازە هاتوانە کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبوە، کە لەوانە شارستانێتی بۆ ماوەو ناسراو هەروەك چۆن وتمان لەرۆژئاوای ئێراندا وەك شارستانێتی‌ی میانەی دوو رووبار(میزۆپۆتامیا). ئەوە لەکاتێکدا کە ئەوبەشەی ئارییەکان کە لەئارییانی کۆچکردوو بۆ ئێران جیابوونەوەو بەرەو کەنارەکانی روباری سندوپەنجاب ملی رێیان گرتبوو ودانیشتوانی ئەو ناوچانەیان خستبوە ژێر فشاری خۆیانەوە، بەداب ونەریت و هەڵس وکەوتی باوی ئەوشوێنانە ملیان دابوو.

بۆ نموونە پەسەندکردنی داب و نەریتی(لینگا) و جۆری دیکە دەتوانرێ نموونەیەکی بەرجەستەبن بۆ فەرهەنگ و باوەڕو داب ونەریتی لەئارادابووی ئەو شوێنانە کە ئاریەکانی هیندی تیا جێنیشتەبوون. بەتێپەڕبوونی کات، مێژوو دان بەوەدا دەنێ کەخەبات و کێشمەکێشی راستی و بێ‌راوەستان- بێ‌ئەوەی پێشبینی کۆتایی بکرێ و نموونەشیان لەم سەردەمی ئێمەدا بەچاو دەبینرێ- لەنێوان ئەم کەلتوورو داب و نەریتانەی بەمیراتی ماونەتەوە لەگەڵ کەلتوورو داب ونەریتی ئاسیای پێشوو کەهەندێ بەدەمارگیری ئایینی و کەلتووریی‌ناودەبەن روویداوە. کارێکی ئاسایی‌یە کەئەم دەمارگیری بۆماوە(ویراسی) لەلایەن ئەو ئارییە هیندییانەوە کەملیان نابوو، زەمینەی دەرگیری و پێکدادانی فراوانی خۆش کردوە لەنێوان هندوان و هاوسێکانیاندا، تەنانەت لەو سەر زەوییانەشدا کەبوون بەجێگای

جێگیربوونی(هیندۆ ئاری). کاریگەریی پێکادانی دانیشتوانی میزۆپاتامیاو گواستنەوەی بەرچاوی کەلتوورو باوەڕی ئەوان بۆئەوپەڕی جیهان. بەشێکی بەرچاوی لەم رووبەڕووبوونەوەو پێکادانەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی. ئەمەش بەڵگەی ئەو راستییەیە کە کۆمەڵانی ئاریای هیندی هەموو داب و نەریتێکی کەلتووری خەڵکانی خۆماڵی ئەو شوێنانەیان پێ هەرس نەکراوەو نەگونجانیان لەناخەوە لەپێکاداندا لەگەڵ ئەم بۆماوانەدا رۆڵێکی بنەڕەتی و بنیاتنەری بینیوە. دیاردە سروشتییەکان، ئاگرو چەند هۆکارێکی دی لەمێشکی هیندییەکاندا لەگەڵ دانیشتوانی خۆماڵی و ئاسیای پێشوو یا میزۆپۆتامیا چون یەك هەڵنەسەنگێندراون و جیاوازی زۆر لەنێوانیاندا بەدرێژایی مێژوو بەرچاو دەکەوێ. تەنانەت چەمکەکانی(خودا) و (خوای جۆرەکان) نێر یا مێ دەکەونە توێی ئەم رێسایە. ئەم هەموو نموونەو هۆکاری پەیدابوونی ئەوانە، ناتوانرێ لێکۆڵینەوەیان بەجودا لەیەك لەسەربکرێ، بەڵکو هەروەك وترا چەمکەکانی(دەیوا) لەسانسکریتداو (دەئووس) لەزمانی لاتینداو(زەئووس) لەزمانی یۆنانی و (دئوا) لەزمانی فارسی کۆنداو (دئیوا) لەزمانی ئاوێستاییداو (دیو) لەزمانی پەهلەوی و (دیو) لەزمانی فارسی ئەمڕۆداو(دیمون) لەزمانی ئەڵمانیدا چەند نموونەیەکی ئاشکران لەم بارەوە. دەبینین ئەو چەمکانەی باسکرا لەهەموو فەرهەنگێکدا جێگای تایبەتی خۆی هەیە.

بەزۆری ئەوەی لای هیندییەکان بە(خودا) ناودەبرێ لای ئێرانییەکان عیفریت و شەیتانە، بۆ نموونە وشەی(دەئیوا) لە سانسکریتدا کەجارجارە بەهەڵە بەدیوا daiva دەنووسری و رەچاو دەکرێ بەواتای(خودا)یە، خوای کەڵەکگرو بەدەستەڵات. وشەی(دئووس) لەزمانی لاتیندا تەنها واتای (خودا)ی هەیە. زئووس لەزمانی یۆنانیدا خوای گەورەیە کەخۆیشی وەچەی

خوایەکی گەورەیە بەناوی(کرونووس) یا بەیۆنانی خرونووس(Khronos)، کەخوایەکی بەتوانایەو منالی دەبیٚ و(هیراکلس) یەکیٚکە لەبەچکەکانی ئەو کە یۆنانییەکان خۆیان بەنەوەی ئەو دەزانن. زئووس خوایەکی چەسپاوو بەدەستەلاتەو برایەکی بەناوی(هادس)ەوە هەیە کەهاوشیٚوەی ئەهریمەنی ئیٚرانییە. وشەی(دەیوا) لەزمانی فارسی کۆندا بەواتای بتە. دەئیوا لەئاڤیٚستاییدا بەواتای عیفریت و هیٚزی ویٚرانکەرو زیانبەخشە. (دەو) لەزمانی پەهلەویدا هەمان دیٚوو هیٚزی دروستکەری نەخۆشی و بەفیڕۆدانە، وشەی(دیموون) لەزمانی ئەلمانیدا بەواتای شەیتانە. لەزمانی ئەلمانیدا هەندیٚجار هاوواتای دیموون لەرووی زمانەوانییەوە کە راڤەکردنی لەگەلّ وشەی (شیطان) ی سامی لەیەك دەچن، بەکار دەهیٚنریٚ و هەمان وشەی زاتن Satan یا هەمان شەیتانی عەرەبییە. بەکارهیٚنانی ئەوانە بەشیٚوەی ئاوەلّناو(dămonisch) زۆر لەئارادایەو بیٚجگە لەشەیتان چەمك و واتایەکی دیکەی نییە. لەهەموو کەلتوورەکانی میللەتانی ئاریایی رەگەزدا جگە لەهەندیٚ جیاوازی سەروبۆر ئەم ریٚسایە لەناودایە. دیارە چەمك و ناوی خودایان لەنیٚوان ئاریاکانی نیشتەجیٚی دەوروپشتی روبارەکانی سیندو پەنجاب، یا بەوتەیەکی دیکە ئارییە هیندییەکان جۆرە گۆڕانیٚکی بەخۆوە دیوە بەلاّم ئەوە بەو واتایە نییە کەلەنیٚو خودایان یا خودایانی جۆردا گۆڕانکاری روویدابیٚ.تەنانەت گواستنەوەو کۆچی ئەوان لەگەلّ خواکانی خۆیاندا لەلای ئارییە هیندییەکان نەبوە بەهۆی گۆڕانکاری لە رەچەلّەك و رەفتاری تایبەت بەخۆیانەوە، وەك ئاسوورا(Asura) کە لەسەرەتادا بەخوایەکی گەورە ناودەبراو دروستکەرو بە دەسەلاّت بوو بەلاّم هیٚدی هیٚدی شویٚنی خۆی لەدەست داو بوو بەدیٚویٚ. ئەو جۆرە گۆڕانە لەجیهانی خوداکاندا لەئیٚران و میزۆپۆتامیاو میسرو شویٚنەکانی دیکەشدا رووی‌داوە،

وەك ئاشـوور(١)(Asur) کـە لەپێشـدا خـوای جـەنگ و بەخشـش بـووە لای ئاشوورییەکان بەڵام لەدواییدا بوو بەخوای جۆر بۆ بەخشینی رۆزی و نازو خۆشی.

خودایـانی ئاریـایی پێـش جێهێشـتنی شـوێنی کۆنیـان، فرەبـوون وەك(میترا) کە لەکۆنەوەو بەدرێژایی مێژوو خەڵکێکی زۆر هەواداری بوون و لەگەڵ مەسیحیەتدا رکابەری دەکردو رێزو دەسەڵاتی میترا لەدیدو بۆچوونی ئایینەکانی دیکەی ئێرانی و غەیرە ئێرانیدا هەبوەو نکوولی لێنەکراوە. میترا لەزمانی ئاوێستاییدا (میـثرا)و لـەزمانی فارسـی کۆنـدا(میثـا)و لـە زمـانی پەهلـەویدا(میهر)یا(میثر)و لـەزمانی ئـەمڕۆدا(میـهر)ەو بـەواتای پەیمانـەو بوونی ئەولەناوخۆردا بەرجەستە دەبێ.

هـەروەها میـترا لـەنێوان ئاریـا هیندییـەکان و ئاریـا ئێرانییـەکاندا پایـەو پلەی خۆی هەبوەو پەرستوویانە کە ئەمە بەڵگەی ئێمەیە لەسـەر ئەوەی کە دەڵێـین میـترا لـەخودایانی ئاریـایی بـووە لـەپێش کۆچیـاندا واتـە لـەپێش چوونیـــاندا بـــۆ هینـــدۆ ئـــێران. ئـــەو لـــەدواییدا بـــوو بـــەیاریدەدەری زورڤان(Zurvan)و ناوبژی نێوان ئاهورامزداو ئەهریمەنی گرتبوە ئەستۆی خۆی. دەربارەی زورڤان لە لاپەڕەکانی دواتردا باسی دەکەین.

ایندرا خوای جۆر(رب النوع)ی بەتوانا و پیرۆزی هیندییانە کە لەئێراندا پێشـوازی لێنـەکراو لەسـەرچاوە ئایینیـیـەکانی ئـێرانی دێرینـدا بـەناوی شـەیتان و عیفریتـەوە ناسـراوە. هـەندێ لەسـەرچاوە مێژووییـەکان لـەو باوەڕەدان کە(وەرونا)خـوای دیکـەی هندییـان کە لـەئایینی(وداکاندا) جێـی پەرستن بوەو لەسـەرچاوەکانی دیکەدا بـەرچاو ناکـەوێ، لـەئێران دووبـارە پایەدار نەبوەو بەهاتنی ئاهورامزدا بۆ ناوگۆڕەپان بەتەواوی لەناوچوە. ئەمە ئەوە دەگرێتـەوە کەهـەل و مـەرجی کۆمەڵایـەتی و کـەلتووری و مەرجـەکانی

دیکەی کۆمەڵگای ئارییەکان بەجۆری بووە کەکاتێ لەسەر زەمینێکەوە بۆسەر زەمینێکی دیکە گوواستوویانەتەوە سەلامەتی خواکانیان دەستەبەر نەکردووە، هەرلەبەر ئەوەشە کە(ایندرا)و(ورونا) بەپێی ئەو هەل‌ومەرجەی کۆمەڵگای ئێرانی نەیانتوانیوە سەرنج بۆلای خۆیان رابکێشن‌و خۆیان خۆشەویست بکەن. هەندێ لە (خوایانی جۆر)ی ئاریایی کە لەهیندا پەیدابوون، هاوڕێ لەگەڵ دیاردە کەلتوورییەکانی دیکە بۆ ناوچەکانی ئاریانشین رۆیشتوون‌و هیچیان لەهیندا بۆ یادگار بەجێنەهێشتووەو هیندییەکان هیچ یادێکیان لەوبارەوە نیە. تەنها لەم دەستە، خوایانی جۆرەکان ناویان ماوەتەوە. خوای چەند جۆرێ کە لەپەیداکردن‌و بەهێزکردن‌و فراوانکردن‌و مانەوەی دیاردەکانی سروشت، ئاوەکان، روبارەکان، سەرچاوەکان‌و بەردارکردنی گیاو گیانلەبەران دەستیان هەبوە، چەند نموونەیەکن لەوانە. (ئاناهیتا) مێیەخوای بەرپێدان (بەری درەخت)و نازو باران کەلەکۆنەوە لەئێراندا پەرستراوە، سەرچاوەیەکی لەفەرهەنگی هیندیدا هەیەو لەوێوە بۆ ئێران هاتوە، وەلێ هیندییەکان خۆیان ئەویان فەرامۆش کردووە. ناوی یەکەمجاری ئەم مێخوای جۆرە(ئاریدویسورا ئاناهیتا) بوەو بەفارسی ئەمڕۆ(ناهید)ەو هەسارەی ناهید(ڤینۆس) نیشانەی ئەوە. ئاناهیتا لەنێو هیندیاندا یا باشتر بڵێم لەزمان‌و فەرهەنگی ئەواندا(ئاناسیتا)یە بەواتای پاك، کچ، بێ‌لەکە، هاتووە. ئەوەی لەم توێژینەوەدا شاراوەو مەتەڵەو زیاتر مرۆڤ ناچار بەڕۆچوون‌و بەدواداچوون دەکا، بەکارهێنانی وشەیەکە کەلەزمانی هیندۆ ئەڵمانیدا بۆ ئاگر رەچاوکراوەو لەهیندیشدا هەر ئەو وشە بۆ خوای جۆری ئاگر بەکار هێنراوە. ئەم وشە(ئاگنی) یەو لەگەڵ وشەیەك کە ئێرانییان بەناوی(ئەتار) یا(ئەتەرش) بەکار هێنراوە هیچ جۆرە گونجاندنێك‌و رووی هاوبەشی

لەرووی لێوەرگرتن و رەگ و ریشەوە نیە. بەلأم ئەم وشەی ئێرانییە لەفەرهەنگی ئێرانیدا هەرگیز بەواتای (خوای جۆر) نەبوەو ئەمڕۆش وشەکانی ئادەرو (ئازەر) بەواتای ئاگر بەشێوەیەکی ئاسایی بەکار دەهێنرێ و بۆ هیچ فارسی زمانێ وشەی ئازەر بەواتای ئاگر بێگانە نیە. زماننا سان وشەکانی ئەتەرش و ئازەر لەتەنیشت یەکەوە بەکار دەهێنن و پێدەچێ (ئاتەش) یان لەوشەی ئەتەرش وەرگرتبێ کەزووتر باسمان کرد.

لەنێوان ئارییەکان و زۆرتر لەنێوان ئارییە ئێرانییەکاندا خۆر، مانگ و ئەستێرەکان بەردەوام ئەپەرستران. هێزە سروشتییەکان کە ئارییەکان دەیانپەرستن وەك با (هەواء) وزەوی(خاك)و ئاگرو ئاو، بەچوار توخم ناسرابوون و لەبۆماوەکانی ئارییەکان و ئێرانییەکان ئەم چوار توخمە بەپیرۆز دادەنێن و بۆ پاراستن و پترکردن و پاکڕاگرتنیان ئەوپەڕی کۆششیان بۆ بەخەرج داوە. ئەم بۆماوە(میراتی)ی ئارییانە لەبەر گرنگی و بایەخیان لەبەرهەمهێنان و ئابووریدا، لەنێو هەموو کۆمەڵگاکاندا، لەهەموو هەل و مەرجێکی ناوچەییدا، لەگەڵ کەمێ جیاوازی لەنێو ئێرانییەکاندا لەپێش ئیسلام کە پەیرەوییان لەهەموو ئایینێ یا گرووپی ئایینزایێ یانوێ و داهێنانێ وەك(مانویت) کردووە جێی رێزو تەنانەت پەرستنیش بووەو بۆ زیادبوونیان دەستی نزایان بۆ بەرزکردۆتەوەو داب و نەریت و رێبازی تایبەتیان بۆ بەرپاکردووە. ئەو جۆرە نەریتانە لای کلدانییانی ئەستێرە پەرست و دانیشتوانی دیکەی میزۆپۆتامیا وەگەڕ خراون.

ئەگەر لەنێوان رێبازو ئایینەکانی ئاری و سامییاندا لەپەرستنی دیاردەکانی سروشتدا جیاوازییەك بەرچاوکەوتبێ بەهۆی کۆنیی هەریەکە لەم کەلتوورانەوەیە. دیاردەکانی سروشت بەچاوی رێزەوە سۆمەرییەکان یا بابلیەکاندا دیاردەکانی سروشت بەچاوی رێزەوە تەماشا دەکران و

ئـەنجامدانی شـێوازی پەرسـتنیان لەگـەڵ دانیشـتوانی خۆرهـەڵاتی میزۆپۆتامیادا یا ئێرانییەکاندا جیاوازی هەبوە، کە ئەو جیاوازییە لەوەوە پـەیدابووە کـە فەرهـەنگی سروشتپەرسـتی لای خـەڵکانی میزۆپۆتامیـا کۆنـتربووە. سـەرچاوە مێژووییـەکان بـاس لـەپێکادان لـەنێوان ئـایینی ئێرانییـەکان لەدەشـتەکانی ئـێرانداو هاوسـێکانی خۆرهـەڵاتییان لـەمیزۆپۆتامیادا، هـەروەها ناتـەبایی لەگـەڵ فەرهـەنگی ئـابووری ئاریـا هیندییەکاندا دەکەن.

لەهـەندێ سـەرچاوەدا ئەمـەکراوە بـە بەڵگـەی جیـاوازی لەجیـهانبینیدا لـەنێوان خۆرهـەڵات نشـینی دێریـن و ئارییـەکاندا، بەتایبـەتی ئارییـە هیندییەکان و ئـەو سـەرچاوانە دەڵێن کـە ئایینـە دێرینـەکانی ئاریـایی لـەم پێکادانی کەلتوورییـەوە پەیدابوون و ئێمـەش لـەم باسـەماندا ئەوهـەی راڤـە دەکەین.

لەخۆرئاوای ئێراندا، بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانـەی لەبەر دەستدایە وەك ژیاننامـەو یاداشـت و نامـەکانی پاشـایانی ئاشـوور کەدەسـتیان بەسـەر شـوێنێکدا گرتبـێ لەهـەزارەی یەکـەمی پێـش زایینـدا ئـەو فـەرمانڕەواو والییانـەی باجیـان داوە بەئاشـوور، ناویـان بـراوە. لـەو دەقـەرەدا، واتـە لـەخۆرئاوای ئـێراندا بـەگوێرەی یاداشـتنامەکانی سەلمانسـەری سـێیەم دەربارەی داگیرکردنی وڵاتـان لەسەدەی نۆهـەمی پێـش زایینـدا(٨٣٨پ.ز) مادەکـان یـا بەوتـەی ئاشـوورییەکان سـەرزەمینی(ئامـادای)و لەباشـووری ئێراندا سەرزەمینی(پارسوماش) لەنێو بیست وحەوت سەرزەمینەدابوون کە باجیـان داوە بەسەلمانسـەری سـێیەمی پاشـای ئاشـوور. لەباسـی مـادو هەخامەنشیدا لەم ڕووەوە زیاتر دەدوێین.

موغـەکان(Magier) یـەکێبوون لەشـەش تـیرە یـا زیـاتر لەشەشـی مادەکـان و بەناونیشـانی رۆحـانی، جادووگـەران، پزیشـکان، لێکـدەرەوەی خەون، تەنانەت ئەستێرەناسان ناوبراون و سەرچاوە یۆنانییەکان بەتایبەتی هیرودۆت چەند لاپەڕەیەکیان بۆ باسی ئەم موغانە تەرخان نەکردووە.
کاتێ مرۆڤ تەماشای کاری موغەکان لەکۆمەڵگای خۆرئاوای ئێران دەکاو سـنوورو ئامـادەبوون و لێـهاتوویی و پسـپۆڕی پیـاوانی ئـایینیی پەرستگاکانی بابلی و ئاشووریی و سۆمەری دەگەڵ ئەواندا بەراورد دەکا بەم ئەنجامە دەگا کە ئەوانە زۆر لەیەك دەچن.
لەراستیدا موغ لەگـەڵ پیـاوی ئـایینی(کـاهین) ناوپەرسـتگادا هـاوجۆرو هاوکـاری یـەك بـوون و پـەیوەندی نێـوان موغـان و رۆحانییـەکانی نێـو پەرستگاکان لـەمیزۆپۆتامیادا چەندجار پشتگیری و جەختی لەسـەرکراوە. ئەم پەیوەندییە تەنانـەت لـەبواری رامیـاری و سـەربازی سـوود بەخشیشـدا هـەبوە. بـۆ نموونـە سـەرنجدان لـەپلاندانانی جـەنگ لـەنێوان مـادو ئاشوورییەکاندا لەم بارەوە پشتگیری لەم بۆچوونـە دەکا. ئەوانـە موغـەکان بـوون کەبەتەنیشـت چـەند هۆکـارێکی دیکـەوە وەك بازرگانـان و پیـاوانی سیاسـی و پـەیکی دەربـارەی هـەردوولا، زەمینـەیان خۆشـکرد بـۆ رێکـەوتن و دۆسـتایەتی نێـوان کیاکسـاری(١) مـادو (نەبوپۆلاسـار)(٢) ی فـەرمانداری دەست نێژی ئاشوورییەکان.
هیرۆدۆت لەشێوەی ئەنجامدانی جادووگەری موغان و سوودوەرگرتنی ئەوان لەماددانەی مرۆڤ بێهۆش دەکەن تا بتوانن داب و نەریتی دانس و هەڵپەرکێ بەتـەواوی ئـەنجام بـدەن دەدوێ کـە ئـەوجۆرە نەریتـە لـەنێوان تیرەکـانی سکاییدا دووبارە باوبوەو موغەکانی ماد گەیاندوویانەتە نێو ئێران و لەلایەن

خەڵکی‌یەوە پێشوازی گەرمی لێکراوەو پایەداربوەو کاریگەریی بەرچاوی لەفەرهەنگی ئایینی ئێرانی کۆندا هەبوە.
دەربارەی چۆنیەتی چاولێکەریی موغان لەگەرماوی سکایی‌یەکان بۆ دروستکردنی هەڵم کەموغەکان لەبۆنکردنی ئەو هەڵمە ناڕەحەت دەبوون و بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو ناڕەحەتی‌یەدا دەستیان دەکرد بەدانس و هەڵپەڕکێ، لەباسی ئایینی موغەکان یا ئایینی مادەکاندا بەدرێژی لەم بارەوە دەدوێین.
ئەو خاڵەی لێرەدا دڵگرانمان دەکا ئەوەیە کەسەرچاوە دێرینەکانی ئێرانی پێش ئیسلام کەمترین زانیارییەکمان لەم روەوە نادەنێ و تەنها مێژووی ئەو سەردەمە لەسەرچاوە یۆنانی‌یەکانەوە بەدەست توێژەران گەیشتوە.
بەشێوەیەکی گشتی وەهای بۆدەچن کەلەپێش پەیدابوونی ئایینی رەسمی لەئێراندا کەکاتی ئەمەش بەسەدەکانی حەوتەم و شەشەمی پێش زایین دادەنێن، ئایینی ئێرانی‌یەکان لەئایینی ئارییەکانی هیندو ئارییەکانی ئێران سەرچاوەی وەرگرتوەو وەك باسکرا بیروباوەڕی موغەکانی دانیشتووی خۆرئاوای ئێران کە بێگومان لەپێش دامەزراندنی دەوڵەتی مادا لەکۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاییندا بۆچوون و بیروباوەڕی خۆیان هەبوە، لەبیرو باوەڕی ئایینی میزۆپۆتامیا سوودی وەرگرتوە. بە هاتنەکایەی رەفتارێکی نوێ لەئاییندا پێدەچێ کە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەسەر زۆر لەخوایانی جۆرو داب و نەریتی قوربانی کردن و رەفتارو هەڵس وکەوتی ئێرانی‌یەکاندا هێنابێ و هەندێ لەخودایانی جۆری لەبازنەی خودایان فڕێ دابێتە دەرەوە.
بەپشت بەستن بەسەرچاوە ئایینی‌یەکان ئەم ئایینە نوێیە لەخۆرهەلاتی ئێرانەوە هاتوەو واپێدەچێ کە لەخۆرئاوای ئێراندا تواناو رێزگرتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە. تەنانەت بەگوێرەی بەڵگەنامە مێژووییەکان و بەردە نووسراوەکانی پاشایانی هەخامەنشی لەسەدەی پێنجەمی پێش

زاییندا ئەو خودایانەی کە لەچوارچێوەی خودایانی ئاریایی- ئێرانی خرابوونە لاوە وەك میتراو ئاناهیتا بەشێوەیەکی رەسمی و بەدڵگەرمی یەوە لەلایەن ئەردەشیری دوەم و ئەردەشیری سێیەمەوە پەرستراون.
بەوجۆرەی کە هیرودۆت بۆچوونی خۆی دەربارەی ئێرانی یەکان دەربڕیوە نەدەبوو چاوەڕێی ئەوە بکرایە کەپەیکەر یا پەرستگا بۆ خودایانی ئێرانی بەشێوەی رەسمی دروست بکرێ(، گەرچی پەرستگاکانی ئاناهیتا لەئێراندا پێشینەیەکیان لەسەردەمی هەخامەنشیدا بەتایبەتی ئەردەشیری دوەمی کوڕی داریووشی دوەم و پێش ئەویش هەبوە.
پەیوەندی و گرێدانی ئاریا ئێرانییەکان بە ئاریا هیندییەکانەوە کاری بووە روون و ئاشکراو نکوولی لێناکرێ و تەنانەت ئەم پەیوەندییە لەسەردەمەکانی دوای ئیسلامیشدا بەچەند شێوەیەکی جۆراوجۆر پارێزراوە. کۆچکردنی هەندێ لەئێرانی یەکان بۆ هیندو بەشێوەیەکی دیاریکراو لەسەرەتاوە بۆ دەڤەری (گەجەرات) لەهینندا بەشێوەیەك بووە کە هیندووس زەمینەی فێرکاری و پەروەردەو ژیانیان بۆ ئێرانییە کۆچکردوەکان ئامادەکردوەو توانای بەجێهێنانی رەفتارو داب و نەریتی ئایینی یان پێبەخشیون.
لەم دواییانەدا ئەم پەیوەندییانە لەچەند بوارێکی دیکەی فەرهەنگیدا بەرچاو کەوتوون کە ئێرانی یەکان بەهۆی کۆمەکی خۆرهەڵاتناسانی ئەوروپایی یەوە بەهۆی زمان و نووسینی سانسکریتی یەوە توانیویانە لەسەرچاوە ئایینی یەکانی خۆیان بکۆڵنەوەو لەو بوارەدا رێزمانی ئەو سەرچاوانە بە بەراوردکردن و کۆمەکی رێزمانی سانسکریت فێربوون چونکە چەند بەشێ لەم دەقی ئایینی ئێرانییانە یەکسەر دوای کۆچی ئەوان بۆ هیند وەرگێڕدران بۆ زمانی سانسکریت. ئەوی کە لەسنووری کەلتووری کۆمەڵایەتی و خێزان لەهیندا زۆر جێی تێرامان بووە، هەروەها لەئێرانی

کۆندا، سووربوون لەسەری پەیوەندییەکانی مێردکردن بوە لەلای ئارییەکان کەدەبێ لەنێو خۆیاندابێ و بەس.
ئارییەکان دوای کۆچ بۆ هیند ئەم جۆرە هزرەیان وردترو بایەخدارتر پەیرەوکردو بۆ پەیوەندی بەستنی مێردکردن لەگەڵ نائارییەکاندا دوورە پەرێزبوون وپێی قایل نەبوون. تەنها هاتوچۆی جارناجاری ئەوان بۆ ئەوروپاو سەرزەمینەکانی دیکە ئەم رێسایەی لەمێردکردندا گۆڕی و وای لێکردن کە لەگەڵ نائاریاکانیشدا ژن و ژنخوازییان هەبێ.
لەم روەوە دووشت جێی سەرنج بوە، یەکێ رەگەزیی یا خوێن، ئەوی دی ئایینی کە بۆماوەی ئێرانییەکانە لەپێش ئیسلامدا. بەم جۆرە دێتە بەرچاو کە ئارییە هیندییەکان لەپاراستن و ئاکام و پەخشکردنی رەفتارو نەریتی ئاریاییدا زۆر وردترو سەختگیرتر بوون و ئەو نەریتانەی ئێرانییەکان لەدوای کۆچ فەرامۆشیان کردبوو ئەمان سەرلەنوێ فێریان کردنەوە.

# بەشی پێنجەم
# هیندۆ ئەڵمانییەکان

پێویستە لەم رووەوە ئاگاداربین کە تەنها ئەم دوو لکە ئارییە هەن کە کەلتووری تەسک و تایبەتمەندییە هاوبەشەکانیان هەبێ. بەشەلکەکانی دیکەی ئاریایی وەك هیندۆ ئەڵمانییەکان، یا بەوتەیەکی دی هیندۆ ئەوروپاییەکان چەند شتێکی هاوبەشیان لەسنوورێکی دیاریکراودا هەیە. لێرەدا دەربارەی زمان، زێد(نیشتمان)، رەگەز، ئایین و جیهانی خوایانی جۆری ئەوان و رۆحانییەت لای هیندۆ ئەڵمانییەکان دەدوێین. لەبنەڕەتدا ناو یا وشەی (هیندۆ ئەڵمانییەکان) چەمکێکی ئاشکراو لەهەمان کاتدا فراوانی هەیەو نیشانەی خزمایەتی (کەسایەتی) نێوان ئەڵمانییەکان و هیندییەکانەو پەیوەندیی رەگەزیی ئەڵمانی و هیندییەکانە پێکەوە بەرەگەزی ئاریاییەوە. هەندێ لەتوێژەرانی مێژووی ئایینەکان لەوباوەڕەدان کە بەکارهێنانی ناوی هیندۆ ئەوروپایی لەتەنیشت(هیندۆ ئەڵمانی)دا کارێکی دروست و جوان نییە. زماناسان لەسنووری بەرپرسیاری و لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا هەوڵ دەدەن کە بەلەتەنیشت یەکەوە دانانی ئەو دوو ناوەی سەرەوە پەیوەندی خەڵکان و چەند میللەتێکی زۆر بخەنەروو کە لەمێژدا بەیەك رەگەزی هاوبەشەوە پەیوەندییان هەبوەو تەنانەت بەیەك زمان گفت وگۆیان کردووە. ئەم ئاپۆرەی خەڵك و میللەتانە، لەسەر بنچینەی بۆچوونی زماناسان، زمانەکانی هیندۆ ئەڵمانی(٢) بەدوو دەستە دابەشی دەکەن کەبەگرۆهی

خۆرهەڵاتی یا(خاوەری)[*] وگرۆهی خۆرئاوایی یا(باختەری) ناودەبرێن. وەزمانەکانی ئەوان وەهەوەها زمانەکانی هیندۆ ئەڵمانی خۆرهەڵاتی و هیندۆ ئەڵمانی خۆرئاواییان پێدەوترێ.

گرۆهی یەکەم بەزمانەکانی ئێرانی، هیندی، باڵتی (باڵکانی)و سلاوی (سلاڤی) دەوترێ. گرۆهی دووەم بریتییە لەزمانەکانی یۆنانی، ئیتالی و سەلتی(کەلتی)و ئەڵمانی. پایەو پێوەر بۆ ئەم دابەشکردنە لەبنەڕەتدا جوگرافی یا ناوچەیی‌یەو ئەوەی کەدانی پێدانراوە بوونی هاوبەشییەکی بەرچاوە لەنێوان زمانەکانی لکی خۆرهەڵاتی هیندۆ ئەڵمانی و لکی خۆرئاوایی ئەوان، کە پەیوەندبوون و کەسایەتی خاوەنی ئەو زمانانە لەسەر بنەمایەکی هاوبەش و هاوڕەگەز دووپات دەکاتەوە.

مێژوو چەند رووداوێکی زۆری بۆ ناسینی نەژادو زمان و ئایین تاقی کردۆتەوە. لێرەدا ناشێ ئامارژە بۆ سەرچاوەو بەڵگەنامەکان بکرێ، وەلێ چەند زۆرن ئەو جەنگانەی لەجیهاندا بەهۆی رەگەزەوە یا رەگەز پەرستیەوە روویانداوە!.

رەگەزی ئارییایش لەم هەراو هوریاو رووبەروو بونەوە بێبەش نەبوون. لەم دابەشبوونەدا چەند دابەشبوونێکی بچووکتر هەیەو هەریەکە لەم زمانانە لەگەڵ لکەزمانییە ناوبراوەکاندا لەناو خۆیاندا چەند زمانێکی بچووکتر یاچەند دیالیکتێکی زۆریان لەخۆگرتوە. بەتێپەڕبوونی رۆژگار زۆر لەم لەیەکچوون و هاوبەشی‌یانە لەهەریەك لەم لکە زمانییانەدا کاڵ بۆتەوەو تێکەڵبوونی خاوەنی ئەم زمانانە لەگەڵ خەڵکانێکی جیاواز لە زمان و

---

[*] خاوەری دوور یاخۆرهەڵاتی سەروو بەشێ لە خۆرهەڵاتی ئاسیایە کەبریتی‌یە لەچین و ژاپۆن و کۆریاو هیندو چین و ئەندەنووسیاو فلیپین. بەڵام خاوەری ناوەند یا ئاسیای خۆرئاوایی بریتی‌یە لەئێران، عەرەبستان، عێراق، فەلەستین، ئەفغانستان، پاکستان،هندستان وەرگێڕ.

رەگەزو فەرهەنگی دیکەدا بووە بەهۆی وەرگرتن و تێکەڵکردنی وشەو دەستەواژە لە میللەتانی دیکەوە، تەنانەت چەند گۆڕانکارییەك لەسنووری رێزمانیشیاندا روویداوە. ئەوەی زمانناسان بە(دیالێکتی تەخاری) ناو دەبەن کە لەتورکستان گفتوگۆی پێدەکەن، لەسەردەمێکدا زمانێکی سەربەخۆ بووەو بەلکی خۆرئاوایی ئارییەوە پەیوەندە. دووبارە لەجێی خۆیدایە کەجەخت لەسەر ئەوە بکرێ کە زمانی هیندی و ئێرانی کە زۆر لەیەکەوە نزیك و پەیوەستن دەبێ بەناوی ئارياييەوە پێناسە بکرێن.

راستە کە بەکارهێنانی ناوی ئاریایی بۆ هەموو زمانەکان و دیالیکتەکان کە لەئێراندا بەکار دەهێنرێن دروست نییە . زمانناسان و زانستی زواننناسی هێدی هێدی بەلام بەوردی چەند رێسایەکیان بۆ دەنگ(فۆنۆتیك) ناسیٚ و راڤەی دەنگەکان بەدەست هێناوە کە چۆنیەتی گۆڕانکارییەکان، راڤەی دەنگەکان بەدرێژایی هەزارەها ساڵی مێژووی زمان و فەرهەنگی ئارییەکان، هیندۆ ئەڵمانی و ئێرانییەکان بۆ توێژەران روون دەکەنەوە. بەکۆمەکی ئەم رێبازەو ئەم یاسایانە، توێژەران دەتوانن بەخەملاندنی رەگ و ریشەی وشەکان و کۆنترین شێوەی ئەوان و چۆنیەتی راڤەی ئەوان بەدرێژایی مێژوو پەی بەرن.

بەپشت بەستن بەهەمان رێباز زمانناسان و مێژووناسان لەنەخشەکانی خۆیاندا هەردەم دەگەڕێن بەشوێن بەدەستهێنانی شێوەی بنەڕەتی یا کۆنترین شێوەی ئەو وشانەی لەزمانی ئارییەکاندا هەن. ئەم جۆرە توێژینەوەو لێدوان لەسەر ناسینی پێشینەی ئارییەکان بەم ئاکامە گەیشتوە کە ئارییەکانی دێرین بەندبوون بەسەردەمی شارستانی چاخی بەردینی دوایی‌یەوە، وەلێ فلز(کانزا)یان ناسیوە. ئەوی لەم لێکۆڵینەوانەدا دژوار دێتە بەرچاو دەستنیشانکردنی نیشتمان و شوێنی خۆماڵی ئارییەکانە. لەم

بارەوە تیۆری فرە جیاوازو زۆر لەیەکەوە دوور لەچاو یەکدا هێنراونەتە ئاراوە. پێشتر بۆچوون و باوەڕ لەسەر ئەوەبوە کە لەبەرئەوەی زمانی سانسکریت (زمانی هندوان و وداکان) کۆنترین زمانی ئارییەکانە، دەبێ زێدی ئەوان لەئاسیادا بووبێ. لەدواییدا ئەوروپا بەناوی زێدو نیشتمانی ئارییەکان لەپێشتر دانرا کە لەوێدا زۆرتر زەوییە زەبەن و پڕ لەگژوگیاکانی باشووری رووسیا جێی باسی توێژەران بوو. لەم پەیوەندیی و بۆچوونەدا ئەوروپای کۆن بەنیشتمانی ئارییەکان ناوی دەرکردوە، بەرزاییەکانی تورینگن تەنانەت ناوچەی ئەسکەندنافی باکووری ئەڵمان بەناوی نیشتمانی ئەوانەوە باسکراوە. لێکۆڵینەوەی زماننناسی باشترین راژەی لەم بارەوە پێشکەش کردووە نامەو ئاسەواری نووسراوو بۆماوەی هونەریی و شێوەی ژیان و بژێوی بەدەستهێنان لەکەرەسەی سوودبەخش لەم روەوە لەئارادا هەبوون.

توێژەرێ بەناوی(پاول تیمە)وە بەلێکۆڵینەوەکانی خۆی کە هێشتا هەر پرسیارێکی ورووژێنەرە، بەو ئاکامە گەیشتووە کەنیشتمانی ئەسڵی ئارییەکان لەدەوروبەری رووبارەکانی (لاکس) لە خۆرئاوای مەرزی((بووخن))و لەخۆرهەڵاتی رووباری (راین) هەتا درێژای دەریای خۆرهەڵات و دەریای باکوور، هەتا کەنارەکانی دەریای ئەلب، هەتا ناوچەی (وەزر) دەگرێتەوە. ئەوەی گرنگەو توێژەرانی ناچار کردوە بەبیرکردنەوە زمانی تایبەتی ئەم میللەتە خۆماڵیيەیە کەچۆن پەرەی سەندو لەپشتی رووبارو زەریاو دەشت و چیاکانەوە گەیشتۆتە سەرزەمینە جۆراوجۆرەکان.

لەسەرەتاوە باوەڕ لەسەر ئەوە چەسپابوو کە دابەشبوون و لێکپچڕانی میللەتی ئەسڵی یا دایك، بەتایبەتی لەئاکامی کۆچ و جێگیربوونیاندا لەچەند دەڤەرێکی نێو روباری سندو زەریای ئەتڵەس، زمانەکانی ئەم

کۆچکەرانە تا ماوەیەکی دوورو درێژ لەدوای کۆچکردن وەك ئەندامانی یەك خێزان، لەپاڵ یەکدا پارێزراون. زمانناسان ناوی ئەم تێورەیان بەتێوری قەدوبالای درەختی ناوبردوە کە لقەکان و گەلاکانی سەر رووی خۆی دەپارێزێ.

(یۆهانس شمیدت)(١٢) دەربارەی تایبەتمەندی گۆڕانی زمانی ئارییەکان لەو بڕوایەدایە کە لەزۆر شوێن گۆڕانی لەڕووی دەنگەکان و دیارە وشەکانیشەوە روویداوە کە دەسپێکی ئەوانە لەچوارچێوەی گەورەو بچووکی ئارییەکاندا بووەو هێدی هێدی ئەم چوارچێوە بچووك و گەورەیە بۆچەند بازنەیەکی گەورەترو فراوانتر خۆی کوتاوە کە فراوانبوونی ئەم رووداوە بووە بەهۆی پەیدابوونی سنوور لەنێوان زمانەکانی هیندۆ ئارییەکان. ئەم کارە بوو بەهۆی پەیدابوونی کەم تا زۆرێ جیابوونەوەو لێکترازان لەنێوان زمانی ئارییەکانداو ئەمە هەمان سنووری زمانی یە کەتوێژەر بیری لێدەکاتەوە. ئەم تیۆرە وەك زاراوەی شەپۆلەکان سنوورێکی فراوان لەنێوان زمانە ئارییەکاندا دەگرێتەوەو بەوەوە گرێ دەدرێ کەهەردەم دوای گۆڕانکاری رەوانبێژی و وشەکان کەوتووە کە بەدوای یەکدا پەیدابوون. مێژووی زمانی ئارییەکان لەپاڵ ئەم گۆڕان و گۆڕانکارییەدا پەیدابوونی دیالێکتەکان و تەنانەت هاوئاهەنگی و هاوواتایی زمانیشی بەدوادا هێناوە.

ئەم باسە لەکاتێکدا دژوارتر دەردەکەوێ کە توێژەران لەسەر نەخشەی زمانی دانیشتوانی خۆماڵی ئەو دەڤەرانە دەدوێن کە ئارییەکان کۆچیان بۆ کردووەو زمانەکانی هیندۆ ئەڵمانی بەسەر ئەو دەڤەرانەدا زاڵ و فەرمانڕەوابوون. زمانی ئەسڵی(خۆماڵی) بەهۆی دەوڵەمەندی شێوەی خۆیەوە، چەند تایبەتمەندییەکیشی هەیە کە فێربوونی ئەو زمانە گرێدەدا

بەوانەوە. لەو روەوە دەبێ لەگۆڕانكاری كردارەكان و ئاوەڵناوەكان بیر بكرێتەوە كە بەتایبەتی لەباسی دەنگەكاندا لەرێزماندا بۆ دروستكردنی وشەكان نەخشەیەكی گرنگیان هەیە.

# بەشی شەشەم

## تایبەتمەندییەکانی رواڵەتی یا جەستەیی (فیزیکی) ئارییەکان لەدیدی رەگەزناسانەوە

بەوردبوونەوە لەهەموو ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی تێپەڕین مرۆڤ دەگاتە ئاکامێ کەئەم زمانە یازمانی ئارییەکان زمانێ نیە کە لەلایەن خەڵکانێکەوە پەیدابووبێ و گەشەی کردبێ کە خاوەنی شێوە بیرکردنەوەو کەلتووری دەشتەکی بووبێت و ئەمە تەنها توێژینەوەی زمانی ئەوانەو دەربارەی تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەوان شتێکمان نەوتوە. توێژەران هەمیشە لەیەك رەگەزو نەوەی باکووریی کۆڵیونەتەوە کە مووزەردو چاوشین و سەر درێژ یا کەللەسەر کشاون کە لەڕاستیدا میللەتان یا خەڵکانی میدیترانەیی (دەریای سپی) وەك یۆنانی و رۆمی‌یەکان ئەم تایبەتمەندییانە دەسەلمێنن و ئەگەر خەڵکانی خۆیی یا میللەتی کۆنی ئاریایی لەسنوورێکی فراواندا بڵاوەو کۆچیان کردبێ، ئەگەری تێکەڵبوونی نەتەوەیی و رەگەزییان لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا هەیە. دیارە کەزمان لەو کەرەسانەیە کە بەئاسانی دەستەلاتی خۆی بەسەر خەڵکان و میللەتانی جۆراوجۆردا دەچەسپێنێ. بۆ نموونە ئێرانی و هیندۆ ئەڵمانییە مووزەردەکان رەنگە زمانی خۆیان لەخەڵکانێکی تەواو نائارییاییەوە بەمیراتی وەرگرتبێ یا فێربووبێتن. تاکاتێ کە بەتەواوی روون نەبێتەوە کە وەڵامی ئەم پرسیارە چی‌یە کە لەپلەی یەکەمدا پەیوەندی هیندۆ ئەڵمانییەکان دەگەڵ میللەتانی سامی رەگەزدا لەلایەکەوەو ئاشنایەتی و خزمایەتییان لەگەڵ میللەتانی فنلەندی و

جەریدا لەلایەكی دیكەوە چۆن بوە، پێویستە ئەم توێژینەوە كەم تا زۆرێ بسەلمێنین و ئەم پرسیارە چۆن بووە هەروا بێ وەڵام و چارەسەرنەكراو یا وەك وەڵامێكی گومانلێكراو بمێنێتەوە. بەدەستهێنانی پەیوەندی نێوان هیندۆ ئەڵمانییەكانی پەیدابوو لەڕەگەزی ئاری لەگەڵ سامییانی جیهانی ئەو رۆژگارەدا یاخود بەتایبەتی لەهەزارەی سێیەمی پێش زایین لە(میزۆپۆتامیا)دا چەندجار لەلایەن توێژەرانەوە جەختی لەسەركراوەو ئەرێ و نەرێی ئەو مەسەلە پێویستی بە بەڵگەی چەسپاوی كۆمەڵناسی، مرۆڤناسی، نەتەوەو رەگەزناسی و زمانناسی هەیە، یا ئەوەی كە توێژەران لەم روەوە بەدەستیان هێناوە، بۆشایی یەكی نەهێشتووەتەوە كەجێی گومان بێ لەم بارەوە، بەدرێژایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین هیندۆ ئەڵمانییەكان لەزمانی سۆمەری و ئەكەدی چەند وشەیەكیان تێكەڵ بەزمانی خۆیان كردوەو ئەم كارە بەهۆی پەیوەندی(بازرگانی و فەرهەنگی– هتد) پەوەبووە. تێكەڵبوونی برێ وشەو تەنانەت نازناوو ناونیشان و ناوی شمەك و ناوی سوڵتانەكان و زنجیرەو شوێنە جوگرافییەكان و ناوی مرۆڤەكان لەزمانەكانی سامی پەیوەندیدار بەسۆمەری و ئەكەدییەكانەوە نیشانەی پەیوەندی نكوولی لێنەكراوی نێوان هیندۆ ئەڵمانییە لەگەڵ سۆمەری و ئەكەدییەكاندا لەسەردەمەكانی پێش مێژوودا.

ئەم جۆرە پەیوەندییە لەنێوان خاوەن شارستانییەكانی كۆنەوە بێگومان هەبوەو خەڵكانی كە لەخۆرهەڵاتی دێریندا خاوەنی فەرهەنگ و ژیار، لەچەند پلەیەكی جیاوازدابوون، هەمیشە گەڕاون بەدوای پەیوەندی دروستكردن لەنێو یەكداو مێژوو بەئاسانی بەم راستی یە پەی بردوە. بۆیە دەبێ لەم مەسەلە بیربكرێتەوە.

# بەشی حەوتەم
# بیروباوەڕەی هیندۆ ئەڵمانییەکان

تیۆرو ئەنجامگیری دەربارەی ئایینی هیندۆ ئەڵمانییەکان لەماوەیەکی دوورودرێژی لێکۆڵینەوەدا بەتەواوی گۆڕانیان بەسەردا هاتوە. چەند سەرکەوتنێکی بەرچاو لەبەراوردکردنی زمانەکانی میللەتانی هیندۆ ئەڵمانی لەنێویەکدا لەسەدەی بیستەمی زایینیدا کۆمەکێکی شایانی بە مەسەلەی پەی بردن بەخواکانیان کردوە. توێژەران لەم بارەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە کە بەیارمەتی لێکۆڵینەوەکانی زمانناسی بتوانن خودایانی لەیەکچوو لەنێو ئەم میللەتانەدا دەستنیشان بکەن. بەراوردکردنی ئەفسانەکانی میللەتانی هیندۆ ئەڵمانی لەگەڵ میللەتانی سامی رەگەزو مانەندی ئەوان، لەلایەن ئەفسانەناسانی وەك ئەدالبرت کووهن و شارەزایانی زمانی ئەڵمانی و زمانناسانی وەك ماکس مۆلێر لەم رووەوە بەچەند ئەنجامێکی زۆر سەرنجڕاکێش گەیشتوون.

ماوەیەك ئەم هاوکێشەو لێکۆڵینەوانە نەیانتوانیوە بۆ دەستکاری و گۆڕان بمێننەوە. چونکە تیۆرەکانی کارناسان بە بەدەستهێنانی بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتی تازەتر زۆر زوو گۆڕانیان بەسەردا دەهات. هەموو ئەو هاوکێشانەی سەبارەت بەخودایانی میللەتانی هیندۆ ئەڵمانی و پەرستنی ئەم خودایانەو چۆنیەتی رێبازەکانی قووربانیکردن بۆیان لەلایەن ئەم میللەتانەوە هەمیشە لەگۆڕان و چاکسازیدا بوون. گۆڕانکارییەکان سەبارەت بەتوێژینەوە مێژووییەکانی سەدەی بیستەم و پێشڕەوییە ئاشکراکان لەسنووری زمانناسیدا لە لاسەرووی ئەم گۆڕانکاری و چاکسازییانەدا بوون.

دووفاکتەری دوایی پشکێکی گرنگیان لەپەرستنی خودایانی بنەڕەتی میللەتانی هیندۆ ژەرمەنی و خودایانی پەیدابوو یا هێنراو لەولاتانی دیکەوە لەئەستۆدابوە. ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەریەك بنەما راوەستاوە کە یەك خودای هاوبەش لەنێو ئارییەکاندا، واتە(خودای ئاسمان) لەژێر ناوونیشانی خۆیدایە بەزمانی هیندی کۆن(دیۆس پیتەر) یا بەزمانی یۆنانی(زیووس پاتر) یا لەزمانی لاتیندا (ژووپیتەر) و بەزمانی ئەڵمانی کۆن(تیوان) وەك خۆی ماوەتەوە. بوونی ناوی تیواز کەخودای جۆرە لای ئەڵمان و زمانی ئەڵمانیش دەچێتەوە سەر زمانی هیندۆ ئەڵمانی ئەو گومانە پەیدا دەکا کەلەم بوارەدا دەتوانرێ رەخنە ئاراستەی زمانناسان بکرێ کە گوێیان نەداوە بەجیاوازی نێوان خەڵکی رەشۆکی و زمانی پەرستگاکان و رۆحانی‌یەکان کەزمانی ئەمان پەیوەندی بەخودایان و رۆحەوە هەیەو لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا جیاوازییەکی زۆری هەیە. بەوتەیەکی دیکە زمانی تێکرای خەڵکی لەگەڵ زمانی خودایان و ئەرواحدا لەیەکەوە دوورن. توێژەران و زانایانی تیۆلۆژی (زانستە خودایی‌یەکان) لەسەر ئەو باوەڕەن کە بۆ ئەم مەبەستە تێگەیشتنی چەند زمان چەند چەمکێکی تایبەت پێویستە.

لەدوای تێپەڕبوونی پەرستنی خودایانی جۆر، جۆرە پەرستنێکی رۆح لەجێداماوەو توێژەران بەشێلگیریەوە لەسەر ئەو باوەڕەن کە لەنێوان لکەکانی نەتەوەی دایکدا ئارییەکان ژیانیان لەسەر بنەمای ئایینداری(Religion) دەست پێکردوە.

ئەوەی کە سەرنجڕاکێش بێ و لەهزری ئەواندا چەسپابێ باسی خەون و خەیاڵ و رۆحی پێشینانی ئەوان بووە کە ئیدی هیچی دیکەیان نەناسیوەو ئەمە ئەوپەڕی پەرستنی ئەوان بووە هەڵەو دردۆنگییەك کە لە بەراوردکردنی ئەفسانەکانەوە هاتۆتە کایەوە ئەمە بووە کە خوداکانیان لەسەر شێوەی

خوایانی جۆری دروستکەر یا جۆری لەناو بەردەناسی. ئەم خوایانە دەستەڵاتە سروشتی‌یەکان بوون وەك خۆر، مانگ‌و ئەستێرەکان، یا لەسەر شێوەی هەورەگرمەو هەورە بروسکە، باران‌و باو لافاو. بۆ نموونە لەئایینی ئەڵمانییەکاندا (دۆنەر Donner) خوا جۆری (رب النوع) هەورەگرمەو هەورەبروسکەبوەو ئەمەشی دەگەیاند کە پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوان خوایانی جۆرو رووداوە سروشتیەکاندا هەبوە. بیرکردنەوە سەرەکیەکانی ئەم سەدانەی دوایی بەتایبەت سەردەمی ئێستا سەرقاڵی ئەم جۆرە هزرەن کە پەیوەندی نێوان خوداکان تا چ رادەیەك بەسیستەمێکی رێك‌و وردا تێپەڕیوە.

(ژرژدومیزیل)(٤) توێژەری بەتواناى فەرەنسی بەهۆی لێکۆڵینەوەکانی خۆیەوە زەمینەی خۆشکردو لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانرێ بە بۆچوونی جیاوازی خەڵکان لەپەرستنی خوایانی جۆردا لەئاپوراکانی ئەو رۆژگارەدا پەی ببرێ. ئەم بۆچوونە لەهەر ئاپورا(کۆبوونەوە)یەکدا بەسێ بەش یا گرۆوە دابەش دەبێ یا بەوتەیەکی دیکە لەسەر سێ پایە راوەستاوە: یەکەم پایەی فەرمانڕەوایی‌و دەستەڵاتی پاشا، دووەم پایگا یا پایەی جەنگاوەران، سی‌یەم پایەی گەورەپیاوان‌و خانەدانەکان‌و تێکڕای خەڵکی. لەلای هیندییەکان(میترا)و (وروونا) ولای ئەڵمانی‌یەکان (تیواز) کەهەندێ‌جار لەیەك دەچوون‌و لەیەکتر نزیك دەبوونەوەو گەلێ جاریش دوور لەیەکترو بەرامبەر یەکتر رادەوەستان. بۆ گەورەپیاوان خوای جۆری جەنگ بەناوی(ئیندرا)و(دونار Donar) زۆر خۆیان دەنواند. لەقۆناغی دواییدا چەند خوایەکی فرەی دی دەردەکەوتن کەزۆرتری بەسروشتەوە بەندبوون، هەندێکیان لەسەر شێوەی دوو برای دوانە یا جووتێ خوای هاوچەشن‌و یەکسان لەدەستەڵات‌و تواناد‌ا. نموونەی بەرجەستەی ئەم دووبرا دوانە

یاپێکەوە لەدایك بوە (ئەسڤینا Astivins) یانی هیندییەکان و (دیوسکور)انی یۆنانییەکانن.

لەتەك ئەوانەدا خوادایانی مێچکە یا (مێخودای جۆر) دەبن. ئەم جۆرە سیستەمە لەکاروباری خوداکاندا لەمیانەی میللەتانی هیندۆ ئەڵمانیدا بێوێنەو رەسەنن.

لەکۆتاییدا بەم ئەنجامە دەگەین کە ئارییەکان تەنها بەهۆی زمانیانەوە نییە کە کەس وکاری یەکن و لەیەك رەگەزن، بەڵکو لەبواری سیستەمی خوداکان و ئایینیشدا لەیەکەوە نزیکن و دەبن بەکەسی یەکتر. ئارییە کۆنەکان بڕوایان بەئاگر هەبوەو بوونی جیهانیان لەژێر سایەی توانای لەرادەبەدەری ئەودا بەدی کردووە. ئارییەکان بۆ هەڵبژاردنی جێگای پیرۆز، بۆ خواپەرستی و رێزلێنان لەخوداکان چەند رێبازێکی جۆراوجۆریان هەبوەو شوێنی ئایبەتی خواپەرستییان لەشوێنە بەرزەکان یا لەسەرکێوو کێڵگەکان یا لەناوچە تەختەکاندا هەڵدەبژارد.

شێوەی ئەنجامدانی قوربانی و خواپەرستی بەسەرپەرشتی پیاوانی ئایینی ئەنجام دەدرا ولای ئارییەکان کەمتر بەوانە دەوترا غەیب زان (کاهین)ی پەرستگاکان. لەنێو میللەتانی هیندۆ ئەڵمانیدا هەر میللەتەی بەجۆرێ لەلایەن رۆحانییەتەوە یا چینی رۆحانییەوە پەروەردە دەکراو شارەزایی و زانستی ئایینیان پێ رادەگەیەنرا. بۆ نموونە(برەهمەنەکان) لەهیندۆ(فلامین) لەرۆم و(درویید)ەکان لەنزیکی (کلتیان) واتە سەڵتەکان ئەوە دەگەیەنن کە لەسەرەتادا چینێکی تایبەتی رۆحانی لەنێوانیاندا نەبوە باس و توێژینەوەی زۆر کۆنی یۆنانی و ژەرمەنەکان وەها دەگەیەنن کە رێبازو ئەنجامدانی کاروباری ئایینی زۆر سادە لەنێو ئەو میللەتانەدا هەبوە. ئەم رێبازو کاری ئایینی ئەنجامدانە بێپەرستگاو بێچینی روحانی لەنێوان

ئاریە زۆر کۆنەکاندا نەبوە، وەلێ زۆر لەرێو رەوشتی هیندییان، یۆنانیان و رۆمانیەکان تارادەیەك خاوەنی سەرچاوەیەکی هاوبەش و هاوشێوەبوون و ئەم کارە لەسەردەمە دوورترەکاندا یا باشتر بلێین لەسەردەمێکدا کە ئارییەکان خاوەنی زمانێکی هاوبەش بوون، زۆر لەیەکەوە نزیك بووەو ئەم کارە ئەوە دەردەخا کەچینی رۆحانی هەبوەو ئەم چینە زاناو بەدەستەلاتیش بوون. ئەوانەی کە ئەم رێو رەوشتەیان بۆ نەوەکانی دواتری ئەم میللەتانە گواستەوە، کەسانی ئاسایی کۆمەڵگا نەبوون، بەڵکو رۆحانی تێکۆشەرو بەئاگاو پەروەردەکەرانی کۆمەڵگابوون. تەنانەت ئەم رۆحانییەتە خاوەنی رابەری بەتوانابوە.

باسی راوبۆچوونەکانی خوایی و بەرێوەبردنی کۆمەڵگا لەسەر بنچینەو بنەمای ژیریی و دادو ئاوردانەوە لەکاروباری ئایینی تەنها لەم پیاوە ئایینییانە وەردەگیراو رادەگەیەنرا بەکۆمەڵگا، لەبەرئەوە پێویستە ئەم راستییە بسەلمێنرێ کەچینی بەئاگاو بەدەستەلات لەکۆمەڵگادا بووەو ئەمرۆ ئێمە بەوانە دەڵێین(رۆحانی). تێکرا پێویستە ئەم راستییە بسەلمێنرێ کە بەوردبوونەوە لەو بەڵگەنامەو باسانەی لەبەر دەستدایە، ئایینی میللەتانی هیندۆ ژەرمەنی و پێشینانی ئەوانیش واتە ئارییەکان ئایینێکی سادەو سەرەتایی نەبوەو خاوەنی رێساو یاسای وردو هەستیاربوەو توانیویەتی بەسەرەکیترین کاری خێزانی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی کۆمەڵگاوە خەریك ببێ. بەوردبوونەوە لەگەشەپێدانی ئایین لەنێوان میللەتانی ئاریایی، چ ئارییە ئێرانییەکان و چ ئەوانەی بۆ هیند کۆچیان کرد، ناوی ئاریا زەمینەی خۆشکرد بۆ بیرکردنەوە لەوە کەنەتەوەی ئاریایی و پەیوەندبوون بەم نەژادو توخمەوە بەگەورەیی و لە بەرتری (امتیاز) دەژمێردرێ. بۆ نموونە دەتوانرێ بۆیەکێ لەتیرە زۆرەکانی ماد بەناوی

ئاریزانتانـەوە (ئاریزانتیـان) ئامـاژەبکرێ کـە ئـەندامانی ئـەم تـیرە خۆیـان بەتوخم و بنەماڵەی ئارییـەکان زانیـوە. یـا ئامـاژە بکـرێ بـۆ (ئاریـامین) کـە یـەکێبوو لەشـاکانی هەخامەنشـی لـەپێش دامـەزراندنی شاهەنشـاهی پارسـەکان لەلایـەن کوروشـی دووەمـەوە لەسـاڵی (٥٥٩ پ.ز)دا. ئاریـامین لەساڵەکانی (٦٤٠-٦١٥ پ.ز) فـەرمانڕەوا (سـوڵتان)بـوەو کـوڕی(چیـش پیش)و نـەوەی هەخامـەنش بـووەو لـەوەوە لەوحەیـەکی زێڕیـن لەهەمـەدان بەدەست گەیشتوە کە ئەوی بەناوی شای گەورەو شای شاهان و شای پارس ناوبردوە. هەربەم جۆرە ناوی خودایانی هینـدی وەك (ئینـدرا) هاتووە کـە گەورەترین خـودای ودایی‌یەکان بووە، خـودای بەدەسـتەڵات و بەخشـندەی بەرگرتنی درەخت و بارانی پیت بەخش بوە. گرنگی‌ی پیرۆزی ناوی ئینـدرا کـە زۆر لـەمێژەوە هـەبوە لەسـەر روبـاری(سـند) و ولاتـی(هیندسـتان)دا بەرچاوکـەوتوە. هـەر بـەوجۆرەی دەربـارەی پـەیدابوونی ئاریاکـان و هاوبەشییان لەگەڵ یەکتریدا، لەسەردەمێکدا کەیەك میللـەت بـوون دوایـن، دیسان لێرەدا بۆئەم بنەما حاشا لێنەکراوە ئاماژە دەکەین کە رێبازی ئایینی ئارییە ئێرانییەکان و ئارییە هیندییەکان بۆماوەیەکی دوورو درێژ یەك بووە. چونکە ئەوان ماوەیـەکی زۆر بەیـەك زمـان گفـت و گۆیـان کـردوەو پێکـەوە ژیانیان بەسەربردووە. هەل‌ومەرجی جوگرافی و باری ناوچەیی و سیستەمی بەرهەمهێنان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی بژێوییان، کاریگـەری سـەرەکی بـوون بۆسەر ئایینیان. دوای ئەوەی لکە جیاجیاکانی ئاریـایی، لـەنێوانیاندا لکـی ئێرانی و لکـی هینـدی لەیـەکتر جیابوونـەوەو ئـەم کـارەش چـەند سـەدەیەك لەدوای پێکەوە ژیانی ئەوان روویداوە جیابوونـەوەی ئایینیش لـەنێوانیاندا روویـدا. بەتـەواوی بۆ ئەوسـەردەمەی کە ئـەم جیابوونـەوە روویـداوە بـەهیچ

جۆرێ ناتوانرێ ئاماژە بکرێ، چونکە ئەم کارە پێویستی بە بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتی تەواو و ئاسەواری دێرین و ئەو جۆرەشتانە هەیە.

هەتا ناوەڕاستی سەدەی دەهەمی پێش زایین، پێدەچێ ئەم جیابوونەوە رووی نەدابێ. بەگوێرەی نووسراوی سەربەردێ کە لەکێوی بوغاز لەئاسیای ناوەڕاست دۆزراوەتەوەو بەرواری نووسینی ئەو دەتوانرێ بەلەدوای ساڵی ١٣٥٠ پ.ز بخەملێنرێ، وەها دێتەبەرچاو کەهێشتا لەو سەردەمەدا ئەم جیابوونەوە رووی نەداوە، چونکە لەسەر ئەم بەردە گەورە پیاوان و فەرمانڕەوایانی میتانی کەبنچینەیان ئارياییە بەخوا جۆرەکانی هیندی وەك ئیندرا، ورونا، ناستیاس سوێنیان خواردوە.

لەولایشەوە توێژەران دەربارەی سەردەمی نووسینی (ودا)کان یا پەڕاوی پیرۆزی هیندییەکان لەوگومانەدان کە لەنێوان سەدەکانی چواردەهەم و هەشتەمی پێش زاییندا بووە لەسەدەی هەشتەمی پێش زایین خوارتر نەبوە، بۆیە دەبێ سەردەمی جیابوونەوەی ئارییە ئێرانییەکان و هیندییەکان لەنێوان ئەم دووکاتەدا واتە لەنێوان ئەم شەش سەدەدا دابنرێ.

ئارییەکان دیارە وەك عیلامی‌یەکان و زۆربەی میللەتان و نەتەوە دێرینەکان بەگیان(رۆح)و هێزە زیانبەخش و سوودمەندەکان بڕوایان هەبوە. تەنانەت بڕوایان هەبوە کە گەنجینەو ئەنبارەکانی سروشت، نازو خۆشی، بەرهەمی کشت‌وکاڵی باش، تەندروستی و شادی و چیدی لەوبابەتەبێ لەلایەن هێزەکانی چاکەو خراپەوە پێشکەش بەمرۆڤ دەکرێ. لەنێو ئەم نازو گەنجینانەدا دەتوانرێ باران و رۆشنایی وەك نموونە ناوببرێن. ئارییەکان بڕوایان بەجەنگی نێوان هێزەکانی باشەو زیانبەخش هەبوە. ئەوان تاریکی شەو، زستانسەختی‌ی زستان)، وشکە ساڵی، گرانی، وشك بوونی گەلاوشینایی، نەخۆشی و دەردو وەیشومە، هەموو ئەوانەیان دەدایە

پـاڵ هـێزە زیانبەخشـەکان و گرانـی و وشکەسـاڵی، سـەرمای سـەخت و نەخۆشـییان بەسـەرکەوتنی هـێزە زیانبەخشـەکان کەئەوانـە پـەیوەندییان بەجیهانی تاریکییەوە هەیە بەسەر هێزە سوودبەخشەکاندا کە پەیوەندییان بەجیـهانی ڕۆشـناییەوە هەیـە دەهاتـە بـەرچاو. ئـەوان دیـارە هـێزە سوودبەخشـەکانیان دەپەرسـت و شـەیدایان دەبـوون و لـەڕێی ئـەواندا قوربانییـان دەکـرد. بەرامبـەر بـەوە هـێزە زیانبەخشـەکانیان وەك دوژمـن تەماشا دەکردو بۆ خۆپاراستن لەبەدکاری و شەڕی ئەوان پەنایان دەبـرد بۆ نزاو جادووگەری کەئەو کـارە لـەدواییدا لەشێوەی سـیحرو جادووگـەریدا بەرجەستەبوو.

پەرستنی(میترا)ی خوای خۆری سەردەمی کـۆن لەلایـەن ئارییەکانـەوە بێگومـان درەوشـاوەی خۆریـان بـەچاوی ئاسمـان دەزانـی و هەورەگرمـەو هەورەبروسکەیان بەقەلغانی ئەو دەهاتە بەرچاو.بەوتەیەکی دیکە دەتوانرێ لەم ماوەیەدا دووبارە ڕوویـەکی هاوبەش لـەنێوان ئاریـانی ئێرانی و هینـدی بـەدی بکـرێ کـە ئـەویش ئەوەیـە کـە ئارییـە ئێرانییـەکان وەك ئارییـە هیندییەکان سەرقاڵی پەرستنی چەند توخمێ بوون کەژمارەیان بەدروستی نەزانراوەو لەدواییدا بەچوار توخم ناسران، ئەم توخمانە لـەدواییدا بەئاوو ئـاگرو بـاو خـاك ناسـراون. بەپێچەوانـەی بۆچوونـی هـەندێ لـە توێـژەران پێدەچێ کە ئارییەکان هەرگیز بەپەرستنی تەنها یەك خوا پەییان نـەبردبێ. تەنها خاڵێ کە لـەم ڕووەوە ئارییـەکانی ئـێران و هینـد لەیـەك جیادەکاتـەوە ئەوەتا کە سەردەمی کەم بوونـەوەی ژمـارەی خوایـانی جۆری پەرستراو لای ئارییە ئێرانییەکان زووتربوە تا لای ئارییە هیندییەکان. هەروەها خاڵێکی دیکـە کـە پێویسـتە بـاس بکـرێ ئەوەیـە کـەوا دەردەکـەوێ کـە ئارییـە ئێرانی‌یـەکان کـەتازە گەیشـتبوونە دەشـتەکانی ئـێران و لـەڕووی

شارستانی‌یەوە لەپلەیەکی خوارترابوون لەبابلی و ئاشووری و سۆمەرییەکان چونکە ئەوان لەم بارەوە شارستانی و فەرهەنگێکی پێشکەوتووتریان هەبوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارییە ئێرانی‌یەکان زۆر رووی شارستانییەتی ئەم میللەتانەیان لەچاو خۆیاندا، بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر لەوان وەرگرتوە. لەئەنجامدا بەپێی هەندێ لە توێژینەوەی نەتەوە ناسان و مێژوونووسان دەتوانرێ کە ئارییەکان لەگەڵ ئەو شارستانییەتە کەمەی خۆیاندا لەرووی رەفتارو هەڵس وکەوتەوە لەچاو بابلی و سۆمەری ئاشوورییەکاندا- هتد لەبەرتربوون لەوان.

خێزان، کۆمەڵگاو حکوومەتی ئارییەکان:

خێزان وەك گەورەترین پایەی کۆمەڵگا لەشێوەی باوك سالاریدا بووە. سەرۆك تایفەکانیش دووبارە وەك گەورەترین دەسەڵاتدارانی نێو خێزانەکان لەنێو ئارییەکاندا باس کراون. ژن لەنێو ئارییەکاندا بەئەندامێکی زۆر بایەخدارو کاریگەر لەدوای مێرد ناوی هاتووەو رێزی لێگیراوە.

لەسەرچاوە ئایینی‌یەکانی ئێرانی کۆندا بە باوك یا گەورەی ماڵ و خێزان، وەك چۆن لەوەودواش لەکەلتووری ئاکاری ئارییەکاندا ماوەتەوە، (کەتەك خوتای) یا کەدخوا (کوێخا) واتە سەرۆکی ماڵیان وتوە. لەپاڵ ئەویشدا هاوسەری ئەویان بە(کەتەك بانووگ) یا کەدبانوو(کەیبانوو) واتە خانمی ماڵ ناوبردوە. پێوەرو دەسەڵاتی کەیبانوو وەك لەهەندێ سەرچاوەدا هاتوە سنووردار نەبوە، وەلێ لەژێر فەرمانی مێردەکەیدا کە سەرۆکی ماڵ بووە کاری خۆی ئەنجام داوە.

ئەگەر بەهۆی چەند بەڵگەیەکەوە مێردەکەی هاوسەرێکی دیکەی لەپاڵ ئەودا هەڵبژاردایە ئەوە نەك تەنها لەدەستەڵات و لەبەرتری ژنی یەکەم کەم نەدەکردەوەو بەس بەڵکو(پەتەخشاژن) یا(پاشاژن) بۆ ژنی یەکەم بەکار

دەهێنراو بەهاوسەری نوێیان دەوت(چەکەر زەن) یا(چاکەرزەن)- کارەکەر- کەدەبوو لەژێر فەرمانی کەیبانوو یا ژنی پێشوودا کاری ئەنجام بدایە. بەتێکڕایی کاتێ فەرهەنگ و یاساو ڕێسای خانەوادەی دەستەڵاتدار لەکۆمەڵگای ئارییەکاندا لەگەڵ خانەوادەکانی میللەت و نەتەوەکانی دیکەدا بەراورد دەکەین بەو ئەنجامە دەگەین کەرێ وجێی ژن لای ئارییە ئێرانییەکان پتر بایەخی پێدراوە تالای خەڵکانی دیکە.

مێژووی کۆیلایەتی ژنان لەنێو نەتەوەو میللەتانی دیکەدا بەئاشکرا پشتگیری لەم بۆچوونە دەکا. لەکۆمەڵگای ئاریایی ئێرانی، بۆ منداڵان باوک بەبێ هیچ مەرجێ دادەنرا بەفەرمانڕەوا. لەبەرئەوەی سەرۆکی خانەوادە باوک بوو جێی دادوەریان پێدابوو، لەناوماڵدا هەموو جۆرە نەریت و ئایینێ لەلایەن ئەوەوە پیادە دەکراو فێری منداڵەکانی دەکرا.

کاتێ کۆمەڵگای باوک سالاری لای ئارییە ئێرانی‌یەکان و میللەتانی دیکە وەك میللەتی ئەتروسکی ڕۆمی بەراورد بکەین دەبینین کەچ دڵڕەقی‌یەك لەنێوان ئەو کۆمەڵگایانەدا هەبوەو باوك لەنێوانیاندا چ دەستەڵاتێکی نامرۆڤانەی هەبوە، کە بۆ نموونە توانیویەتی ژن و منداڵەکانی خۆی بکوژێ یا بیانکا بەکۆیلە.

هەروەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆکرا، لەبەرئەوەی ئایین لای ئارییەکان سادەبووە، لەنێوانیاندا لەلایەن باوکەوە کاروباری بڕوای ئایینی سەرپەرشتی دەکراو بەرپرسیاربوون لەپاراستنی دروشمە ئایینی‌یەکان لەئەستۆی ئەودابوو، واتە لەبەرئەوەی بنەماکانی بیروباوەر سەرەتایی‌بوون باسی بوونی گرووپێ لەنێوان ئارییەکاندا کەچینێکی ڕۆحانی دروست بکەن لەئارادا نییە. یەکەم جار تیرەیەك بەناوی موغانەوە، وەك لەسەرچاوە یۆنانییەکاندا هاتوە کەپیشەیان جادووگەری و چاوبەست بووە بەناوی

یەکێ لە تیرە زۆرەکانی ناسراوە کەڕەنگە کاروباری ئەوانە بریتی بووبێ لەخۆ خەریك کردن بەپزیشکی یەوە، بەلێکدانەوەی خەون و پێشبینی کردن، بەوەلاخستنی ناکۆکی و هەراو هوریا بەگوێرەی پێوەرە ئایینی یەکان کەئەوانە لەو ڕێیەوە بژێویان بەدەست هێناوە... ئەگەر لەهەندێ سەرچاوەدا کە پەیوەندی بەکەلتووری کۆمەڵایەتی ئێرانی کۆنەوە هەبووبێ چینێ بەناوی رۆحانی یەوە باسکرابێ، ئەوە هەرگیز پەیوەندی بەکاتی کۆچکردنی ئارییەکانەوە بۆ بان ئێران و هەروەها ماوەیەکیش دوای ئەوە نەبوە.

باوك لەخێزاندا بێجگە لەکاروباری دابینکردنی ئارامی و بژێوی ئەندامانی خێزانەکە، پاراستنی ئاگریش کەتوخمێکی سوودبەخش و پێویست بووە لەنێوماڵدا لەئەستۆی ئەوادبووە. ئەم رەفتارە لەفەرهەنگی نەتەوەو میللەتانی دیکەشدا هەبوە. یۆنانییە کۆنەکان میچکە خوایەکی جۆریان(ربة النوع) بەناوی (هیسیتا)وە هەبوە کەپارێزەری ئاگردان و کوانووی ماڵ بوە.

هیندییە کۆنەکان خوایەکی جۆریان بەناوی(ئاگنی Agni )یەوە هەبوە کەبەخوای جۆری ئاگر دادەنرا. لەکۆمەڵگای ئارییایدا باوکی خێزان بەرپرسیاری پاراستنی ئاگردان و هەڵگیرساندنی ئاگربووە. ئاگردانی ناوماڵ لەشوێنێکی تایبەتدا دادەنراو پیرۆزییەکی تایبەتی هەبوەو جێی ڕێزو نەوازش بووە. لەسەر ئەوبنەما لەوەودواش ئاگر بەناوی یەکێ لەچوار توخمەکە لەتەنیشت ئاوو باو خاکدا بەپیرۆز دادەنراو بەرێزەوە تەماشا دەکرا. وێڕای بەجێهێنانی کاروباری ئایینی کەسەرپەرشتی و پیادەکردنی بەشێوەیەکی ڕێك وپێك لەئەستۆی باوکدابووە دیارە سەرپەرشتیارانی خێزان شێوەی بەجێهێنانی قوربانی بۆ خوایانی جۆریشیان لەئەستۆدابووە.

چـەمکی ئـاگردان و ڕێزلێنـان و فەرهـەنگی ئـایینی و کۆمەڵایـەتی ئـەو کەتائێستاش لـەنێوان خـەڵکانێکی زۆری جیـهاندا بەردەوامـە ڕیشـەیەکی لەنێوان ئایینی ئارییە کۆنەکاندا هەیە. کوژانەوەی ئاگر لەماڵدا بـەوەجاخ کوێریی[٦] دادەنراو وێڕای ئەوە بەو خێزانانە دەوترا کە لەمناڵبوون بێبەش بوون و مانەوەی نـەوەو دیـارە بەردەوامبوونی خێزان و تۆوو بنەماڵە ئەوان ناگرێتەوە.

بەسـەرنجدان لـەگرنگیی نەخشـەی خانـەوادە لەکۆمـەڵگای ئاریـاییدا، گومانی ئـەوەی کـە کۆمـەڵگا بەشـێوەی چـەند کۆمـەڵێ لەخانـەوادەکان کـە لەسـەر بنـەمای یاسـاکانی خێڵـەکی و تـیرەیی بـەڕێوە دەچـوون نەفامانـەو لەخۆوە نەهاتووە. ئەوەی کە بەشێوەی بنیادنانی فەرمانڕەوایی لەسەردەمی مادەکـان و هەخامەنشـییەکان و زنجیرەکـانی دیکـە، هـەروەها لەسـەردەمە مێژووییـەکانی دواییـدا لـەئێران و جیـهان بـەدی دەکرێ، سەبارەت بەئارییـە تـازە هاتووەکـان نـاتوانرێ چـاوەڕێ بکـرێ. زۆرتـری دەبـێ بەوشـێوەی کەشایستەی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانەیە بەجۆرێ لەفەرمانڕەوایی یا دەزگـای یاساداری کۆمەڵایـەتی بەشێوەی پاشایانی تایفەکان(ملوك الطوائـف) بـیر بکرێتـەوەو بەم شێوەیەی کـە بـەدرێژایی کـاتی ئـەم توێژینـەوەی کۆمـەڵگا ناسانە کەم تازۆرێ هەبووبێ لەچەند خێزانێ تیرە دروست دەبوو کە بنکەی ئەوان(گونـد)بـووەو (ویـس)یشـیان پـێوتووە. لەچـەند تیرەیـەك عەشـیرەت دروست بـووە کە بنکـەی ئەوانیان بە(گێـوو Gau) ناوبردوە. لـەکۆی چـەند عەشیرەتێ میللـەتێ یـا خـەڵکانێ پێکـهاتوون. لەویلایـەتێکدا کـە(دهیـۆ)ی پێوتـراوە. شێوەی هـەڵبژاردنی سـەرۆکانی کـارگێڕی ئـەم دەسـتگایانە. یـا

[٦] اجاق(وەجاخ): ئاگردان بەوانـە وتـراوە وەجاخکوێر کە مناڵیـان نـەبوە چونکە ئاگردانەکـەیان بەهۆی بێ مناڵییەوە کوێربۆتەوە(کوژاوەتەوە)_ وەرگێڕ.

بەوتەیەکی دیکە یەکەکانی حکوومەتی پاشایانی هۆزەکان(ملوك الطوائف) بەم جۆرە بوە: سەرپەرشتیارانی خێزانەکان، سەرانی تیرەکان کە ئەمانیش سەرۆك عەشیرەتەکانیان هەڵبژارد. لەسەرەتای ئەم شێوە میرییەدا سەرۆکی میللەت یا ویلایەت لەرێگای هەڵبژاردنەوە دادەنرا، وەلێ وەك وتراوە بەهۆی لەئەستۆگرتنی فەرماندەیی هێزە بەرگرییەکان و سەربازییەکانەوەو بەهۆی پشێوی و نائارامی و جەنگەوە، لەم دواییانەدا سنووری دەستەڵاتی ئەو فراوانترەبووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە فراوانبوونی دەستەڵاتی ئەو دەستەڵاتی سەرۆك خێزان و سەرانی تیرەکانی لەناو بردبێ بەسەرۆکی تیرە ویست پەیت و بەسەرۆکی خێڵ (دهویت)و بەسەرۆکی عەشیرەت(زەنتۆپەیت)یان وتوە. زەنتۆپەیت بەسەرۆك یا گەورەی عەشیرەتیشیان ناوبردوە. لەم کۆمەڵە کاتێ گرووپێ لەخەڵکی چەند ناوچەیەکی بەیەکەوە گرێدراو کە لەزۆرشتا هاوبەش بوون لەژێر فەرمانی یەك کەسدا کۆدەبوونەوە کەبەو فەرمانڕەوایەیان دەوت(شا).

پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کە ئەم ئەدرەس و پۆستانە لەدواییدا شێوەیەکی دیکەی وەرگرت و شێوەی یەکەمجاری لەدەست دا. بۆ نموونە پۆستی دەهیووتی لەسەردەمی هەخامەنشیدا گۆڕانی بەسەردا هات و روویەکی دیکەی جیاوازی لەسەردەمی ئاریایی بەخۆوە بینی. دەهیویت لەهەندێ جاردا بەپاشای ناوچەیەکیش وتراوە. ئەمڕۆ(دهەد) لەپلەو پایەی (کەدخودا) دایە. کەدخودا( کوێخا ) کەئەمڕۆ لەپلەی سەرپەرشت و ناوبژیوانی گونددایە لەکۆندا بەسەرۆك یا سەرپەرشتی ماڵ دەوترا وەك چۆن لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەمان بۆکرد. دهێویتەکان میرانی ناوخۆ یا پاشایەکی بچووك بوون کە لەپاشای گەورەوە کە لەناوەندا فەرمانڕەوایی دەکرد فەرمانیان وەردەگرت. وێدەچێ کە لەسەردەمی هەخامەنشیدا

دەنیشانی (شاهەنشاه) لەم هزرەوە سەرچاوەی وەرگرتبێ کە پاشایانی گەورە بەسەر پاشایانی بچووکدا فەرمانڕەوابوون بۆیە نازناوی شاهەنشاه(شای شایان) یان پێدراوە.

لەئەرکەکانی دیکەی ئەم پاشا بچووکانە لەبەرامبەر پاشا یا پاشایانی ناوەنددا ناردنی باج یا خەراج بوە کە لەکاتێکی دیاریکراودا وەدەستیان دەهێنا. لەبەرئەوەی ئەم پاشایانەی کە دەستنیشان کرابوون، بەجۆرێ جێی پشت پێبەستنی پاشای ناوەندبوون هەڵدەسان بەکۆکردنەوەی پارە لەناوخۆداو کۆکردنەوەی هێز تا رەوانەی ناوچە جەنگییەکان بکرێن. وەك لەسەرچاوەکاندا هاتوە ئەوانە لەهەندێ بۆنەدا دیارییان بۆ دەرباری پاشای فەرمانڕەوای خۆیان دەناردو لەکاتی روودانی جەنگدا سوپاکەیان بۆ ئامادە دەکرد. هەندێ حکوومەتی ئەشکانییەکانیان دەگەڵ حکوومەت یا دەوڵەتی ئاریایی پێش مێژوویان بەراوردکردوەو چوون یەکیان لەقەڵەم داون. بەگوێرەی هەمان سەرچاوە لێکۆڵینەوەی وردتر لە دروستبوونی حکوومەتی ئەشکانییەکاندا، لێکۆڵینەوەی یاساکانی فەرهەنگی کۆمەڵگاو سیستەمی بەرهەمهێنان و تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەوان کۆمەك بەئێمە دەکا بۆ ناسینی بنەڕەتی حکوومەتانی ئارییەکان و لێدوان لەسەر مێژووی ئێران لەدوای ئارییەکان ئاسانتر دەکا.

مێژووی کولتوورو ژیانی ئارییە ئێرانییەکان لەکۆتایی سەدەی هەشتەم یا نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایین دەست پێدەکا. ئەوەی کە لەپێش ئەم سەردەمەدا پەیوەندی هەبێ بەئارییەکانەوە لەبواری شارستانی و فەرهەنگی ئەوانەوە تا رادەیەك لەئێمە ونە، یا لەپشتی پەردەیەکی تاریکەوە شاراوەیە. بەوتەیەکی دیکە ئەوەی کە لەدرێژای نزیکەی دوو هەزارو نیو یا لەهەزارو سێسەدەوە هەتا دووهەزارو پێنج سەد

ساڵ، واتە بەدرێژایی ئەو سەردەمەی كە لەجیابوونەوەی ئارییەكان لەخەڵكانی هیندۆ ئەوروپایی هەتا سەدەی حەوتەمی پێش زایین تێپەڕیوە، لێمان ونەو نازانین كەلەم ماوە تا رادەیەك درێژەدا ئارییەكان چییانكردوەو چ میراتی‌یەكیان لە كارو كردەوەی خۆیان بۆ یادگار بەجێهێشتوە.

تەنها وەك دەگێڕنەوە لەئەفسانەو داستانەكانی سەردەمی كۆن كە كەم تا زۆریێ رەنگی مێژوویيان بەخۆوە گرتوە، ئەوەندە دەزانین كە ئارییەكان هێدی هێدی روویانكردۆتە گوندنشینی و شارۆچكەنشینی و لەدواییدا شارنشینی و ئەمجا بنچینەی حكوومەتیان داناوە یا بەوتەیەكی دیكە چەند دەوڵەتێكی بچووك و سەرەتاییيان دروست كردوە كە لەم دەزگا حكوومی و دەوڵەتە بچووك و سەرەتاییيانە بەتەواوی ئاگادارنین. هەندێ لەمێژوونووسان برێ لەمێژووی ئەفسانەیی ئێرانی كۆنیان پەیوەست بەسەردەمی ئارییەكانەوە لەقەڵەم داوە. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە ئارییەكان چوار دەوڵەتیان دامەزراندوە. یەكێ دەوڵەتی داستانی جەمشید، یەكێ‌دی دەوڵەتی داستانی فەرەیدوونە، دوو دەوڵەتی دیكە دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی مەنووچە هروزاب. سەردەمی جەمشید زۆر كۆنەو بەئاسانی ناتوانرێ لەیەك برگەی مێژووییدا جێی بۆبكرێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە كە جەمشیدی پاشای داستانی‌ی كۆن بەندە بە سەردەمێكەوە كە هێشتا میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی پێكەوە ژیانیان بەسەربردوەو جیابوونەوە لەنێوانیاندا رووی نەداوە، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هەمان بەڵگە ئەوە بەدوور نازانێ كە سەردەمی جەمشید بەسەردەمێكەوە گرێ درابێ كە ئارییە ئێرانی و هیندییەكان پێكەوە ژیانیان تیادا بەسەربردبێ. هەروەها دەوڵەتی فەرەیدوونیش دەبێ لەم ماوەدا بووبێ. وەلێ دەوڵەتەكانی مەنوچە هروزاب بەسەردەمێكەوە بەندن كە ئارییە ئێرانی‌یەكان لەباكووری خۆرهەڵاتی بان

ئێراندا نیشتەجێ بوون و لەهەمان کاتدا کەوتبوونە ژێر گوشاری خەڵکانێکەوە کەلەلای باکوورەوە هەردەم هێرشیان دەکردە سەریان. ئاشکرایە کەئەو توێژەرانە دووبارە گومانی ئەوە دەبەن کە ئارییە جێگیربووەکان لەباکووری خۆرهەڵاتی ئێراندا کەوتبێتنە ژێر گوشاری سکایانەوەو مێژووی ئێرانی دێرین بەشێوەیەکی بەرچاو لەگەڵ ئەم نەتەوەدا سەروساختەی هەبوە. لەبەر ئەوەی لەباسەکانی مێژوویی ئێراندا دەستێوەردان و گۆڕانێکی زۆر روویداوەو ئەم باسە بەشێوەیەکی وەك خۆی نەگەیشتوە بەدەستی ئێمە، ناتوانرێ سەردەمی دروستبوونی حکوومەتەکانی جەمشید، فەرەیدوون، مەنۆچەهر، روزاب بەدروستی و بەدڵنیاییەوە لەخولی پێش مێژووی ئێراندا واتە پێش دامەزراندنی ماد لەکۆتایی ساڵەکانی سەدەی هەشتەمی پێش مەسیحدا بزانرێ.

هەروەها وادەردەکەوێ کە ئەم داستان و گێڕانەوەی پێشهاتانە لەیەك شوێن و لەیەك کاتدا بڵاونەکراونەتەوە. وێڕای ئەوە بەدرێژایی چەند خولێکی جیاجیاو چەند سەدەیەکی زۆر بەچەند بەڵگەیەکی جۆراوجۆرو هەندێجار نامۆ ئەم باسانە دەستکاری کراون یا هەندێجار ئاوەژووکراون و تاڕادەیەك ناهەمواری و شێواندن لەم داستان و گێڕانەوانەدا هەیە کە ناتوانرێ سەردەمی زۆر لە دلاوەران و پاڵەوانانی سەردەمی کۆن و زۆر لەپاشایانی ئێرانی کۆن لەو دەوڵەتەی خراوەتە پاڵ مەنۆچەهر دەستنیشان و دیاری بکرێ و جێی بڕوابێ. هەربەم جۆرە زۆر لە رووداوە گرنگە مێژوویی یەکان بەم چارەنووسە گرفتاربوون و هەندێ لەرووداوە زۆر گرنگەکانی ئێرانی کۆن کەوتوونەتە ناو تاریکی ئەفسانە کۆنەکانەوەو بوونەتە جێگای دردۆنگی و سەرسامی. ئەم بارودۆخە زۆر لەمێژوونووسانی کە مێژوونووسانی عەرەبیش لەوانەن- تووشی سەرسووڕمان کردوەو

مێژووی ماد، هەخامەنشی، ئەشكانی و ساسانی‌یان تێكەڵ بە رووداوەكانی چاخە ئەفسانەییەكانی مێژووی ئێران واتە سەردەمی پێشدادیان و كەیانیەكان كردوە.

چەند كەسایەتی سیاسی و پیاوانی سەربازی ناوداری سەردەمی پارتییەكانیان (ئەشكانی) بەهی سەردەمی كەیانی و ناو بەناونیش بەهی سەردەمی هاخامەنشییەكان زانیوەو هەندێ لەرووداوە گرنگەكانی مێژووی سەردەمی ساسانی خراونەتە پاڵ سەردەمی كەیانی. لەسەر ئەم بنەمایە هیچ گرانتییەك نیە كەهەندێ لە رووداوەكانی مادو هەخامەنشی بەرووداوی سەردەمی مەنۆچەهرییەكان دانەنرابن. لەلایەكی دیكەوە چەند گۆشەیەكی مێژووی ئێرانی كۆتایی سەردەمی هەخامەنشی و یۆنانییان ئاوێتەی یەكتر كردوەو رەسەنایەتی ئێرانیان داوە بەئەسكەندەری مەقدوونی.

لەكاتێكدا گەڕاندنەوەی ئەم داستانانە بۆ شێوە ئەسڵی و سەرەتایی‌یەكانی خۆیان كارێكی دژوارە كەئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە كە بەڵگەو دۆكیۆمێنتەكانی ئەوان پەیوەندییان بەسەدەكانی سەرەتای ئیسلامەوە هەیە، لەبەرئەوە پەیبردن بەراست و دروستی باسی پێشهاتەكانی ئێران و بەراوردكردنیان لەگەڵ رووداوە مێژووییە راستەكاندا كارێكی ئاسان نییە. پێدەچێ كەكاری مێژوونووسین لەئێرانی كۆندا بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێ لەمێژوونووسان- بەهیچ جۆرێ رانەوەستابێ و رووداوەكانی هەر سەردەمێك و سەردەمی پێش ئەویش بەشێوەیەكی بەردەوام نووسرابێتنەوە، وەلێ ئەم یاداشت و نووسراوو كرۆنۆلۆژییانە ریزبەندی رووداوەكان چییان بەسەرهاتوە كەس لێی ئاگادار نییە. تەنها نووسراوە بەردینەكانی سەردەمی هەخامەنشی گوڵەگەنمێكە لەم خەرمانە كەئەویش بڕگەبڕگە بەئێمە راگەیەنراوە. لێرەدا پێویستە بڵێین كە لەسەر

بەرد نووسینی سەردەمی داریووشی یەکەم(٥٢٢-٤٦٨ پ.ن) دەبێ بەجۆرێ لە مێژوونووسین لەقەڵەم بدرێ، چونکە لەم نووسینە بەردینانەدا چەند رووداوێکی بەربلاوو فراوان نووسراون. ئەگەرچی لەنووسراوەی (خودانامە)و وەرگێڕانە سەرەتاییەکانی ئەو بۆ زمانی عەرەبی و هەندێ زمانی دیکە، وەك وەرگێڕانی(ئیبنو لموقەففەع)، هیچ شتێ لەبەردەستدا نییە وەلێ لەمەڕ لەبەردەست نەبوونی خودانامەدا، دەتوانرێ دوو بەڵگەنامە بەناوی خودانامەوە ناو ببرێن: یەکێ ئەسڵی خودانامەو یەکێ‌دی خودانامەیەك کە بەدرێژای مێژوو، وەك سەردەمی ساسانی دەستکارییەکی زۆر کراوە. وادیارە بوونی خودانامەیەکی دیکە بۆ مەبەستی ئێمە بەس نییە، چونکە وەك وتمان ئەم نووسراوە لەدەستکاری ساسانییەکان نەپارێزدراوە، وەلێ دەشیتوانی لەمەڕ ناسینی گەلێ شتی شاراوەی مێژوویی سەردەمی کۆن یارمەتییمان بدا.

بەچاوپۆشی لەوەی کە مێژووی سەر زەمینی ئێران لەگەوهەری بنەڕەتی و کۆنی خۆیدا چ نەخش و نیگارێ بەدەستەوە دەداو چ چەمك و بڕگەیەك دەگرێتەوەو چە فەرهەنگێکی پێ ناساندووین و لەکاتی گواستنەوەی سەردەمێك بۆ سەردەمێکی دیکە چ چارەنووسێکی تاقیکردۆتەوە هێشتا ئەم باسە کەمە دەیتوانی کەرەسەیەکی بەکەڵك بێ بەدەست توێژەرانەوە تێکەڵکردنی ئەفسانەو داستان لەگەڵ مێژوودا، لەمێژوونووسینی ئێرانییەکان، توێژەرانی ناچار بەیەك راستی کردوە کە ناتوانن لێی دوورە پەرێزبن، بەواتای ئەوەی ئەگەر کەسێ پەیوەند بێ بەتوێژینەوەو پێداچوونەوەی تەواوی مێژووی ئێرانی کۆن و بیەوێ سنووری نێوان داستانەکان و مێژووی راست و دروست بدۆزێتەوە، دەبێ هەرچی هەیە لەنووسراوو ئاسەوارو پەڕاوو بەڵگەنامەو یاداشتی هۆنراوەو

پەخشان کەدەربارەی داستانەکان نووسرابن، لەبەر دەستیدا بێ و پێیدا بچێتەوە کەبێگومان ژمارەی ئەم نووسراوو بەڵگەنامانە یەکجار زۆرن، بڕێ لەمێژوونووسانی عەرەب وەك عەلی کوڕی حەسەنی مەسعوودی لەبەرهەمە بەنرخەکانی خۆیدا کە(مروج الذهب) یەکێکە لەوان، هەوڵی داوە کەپەردە لەسەر ئەم سەر لێشێوانە لابباو توێژەرانی دوای خۆی ڕێنمایی بکا بۆ بەدەستهێنان و پاراستنی سنووری نێوان داستان و ڕاستییەکانی مێژوو، بەتایبەتی لەو جێگایەدا کەمێژووی هەخامەنشییان و ئەشکانییەکانیان لەگەڵ مێژووی سەردەمی ئەفسانەیی کەیانی یان تێکەڵ بەیەك کردووە تا هەنووکە ئێمە ناتوانین لەباسی ئارییەکاندا لەم گرفتە بدوێین، ئومێدوایە لەبەشێکی دیکەدا باسێکی زیاتر لەوڕووەوە بدرێتە بەرتیشکی لێکۆڵینەوەو ئەنجامگیرییەوە. ئەو ڕۆکەو لەپەیوەندی لەگەڵ کۆچی ئارییەکان بۆ بان ئێران لەسەر بنەمای سەرچاوە مێژووییەکان دەتوانرێ دابەشکردن یا کردنی ئەو ئارییانەی چوونەتە بان ئێران بەچەند لکێوە بخرێتە ژێر تیشکی توێژینەوە کە لەچوونی ئەوان یاکۆچی ئەوانە بەلای کەمەوە نیوەی هەزارەیەك لەیەکەم هەزارەی پێش زایین تێدەپەڕێ و بەو جۆرەی هەموان لەسەری ڕێکەوتوون کە دەتوانرێ ئەم سەردەمە بە دەوروبەری سەدەی نۆهەمی پێش زایین یا تا کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زایین دەستنیشان بکرێ. سێ میللەت لە ڕەگەزی ئاریایی، لە گۆشەو کەناری بان ئێراندا چەند ناوچەیەکیان خستۆتە ژێر دەستی خۆیان و هەڵیان بژاردوە بۆ نیشتەجێبوون و مێژووی ئەم ناوچانانەیان بەناوی خۆیانەوە ناو ناوە. هەرسێ یا چوارسەدەی سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین، واتە لەدەستپێکی هەزارەی یەکەم یا سەدەی (پێنجەمی پ.ز) لەمەڕ دروستبوونی دەزگا حکوومییەکان لەلایەن میللەتانی ئاریایی ڕەگەزەوە

جێی بایەخ پێدانە. دەستگاکانی حکوومەتی ئەم سێ میللەتە کە هەنووکە بە ناساندنیانەوە خەریك دەبین بەشێوەی وردە دەوڵەت یا پاشایانی خێڵەکان باس کراون و لەمەڕ هیچ یەك لەوانە دەنگوباسێك دەربارەی حکوومەتێکی ناوەندی و بەهێز لەسەرەتای دەستەڵاتییانەوە نییە.

دەتوانرێ لەخۆرهەڵات یا باکووری خۆرهەڵاتی ئێران باکتەرییەکان (باختەری و بەڵخییەکان) ناوبرێن کە لەسەرەتای هەزارەی یەکەم یا بەدرێژای سەدەی دەهەم(پ.ز) حکوومەتێکیان بۆ خۆیان دروست کردبێ. دەتوانرێ باختەرییەکان لەبەشی ئەفسانەیی مێژووی ئێران و لەگەڵ زنجیرەی کەیانی دەستنیشان بکرێن. زنجیرەی کەیان زنجیرەیەکە کەتا کۆتایی سەدەی شەشەم(پ.ز) بەشێوەیەکی رەسمی ناوی هەبوەو پشتاسب کە لەسەرچاوە یۆنانییەکاندا بە(هیچتاپسی) ناسراوە، بەناونیشانی والی(باکتەر) ناوی دەرچوە کە فەرمانهەڵگری شایانی پێشووی هەخامەنشی واتە کوروشی دوەم(٥٥٩-٥٢٩ پ.ز)و کەمبووجیەی دوەم کوڕو جینشینی کوروش (٥٢٩-٥٢٢ پ.ز) بوەو کوڕی داریووشی یەکەم(٥٢٢-٤٨٦ پ.ز)ەو لە بەردەنووسراوەکانی خۆیدا نیشانەو بەڵگەی تەواوی لەسەر ئەم راستییە هەیە. میللەتێکی دیکە مادەکانن کە لەخۆرئاوای ئێراندا لەکۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زاییندا دەوڵەتی مادەکان دەخرێتە پاڵ ئەوان. ئەوانە زۆرتری بەشێوەی خێڵەکی ژیانیان بەسەر بردوەو سیستەمی باوی بەڕێوەبردنی فەرمانڕەوایی لەنێو عەشرەتەکاندا لای ئەوان کاری پێکراوە. میللەتی سێیەم دەتوانرێ لەباشووری ئێران وەك نیشتەجێی ئەوێ ناوبرێن کە لەسەر بنچینەی بەردەنووسراوەکانی ئاشووری و بەجۆرێ کەهێمای بۆکراوە، لەپێشدا لەباکووری دەریاچەی ئوروومیە جێنیشتەبوون و لەژێر

گوشاری جۆراجۆردا وردەوردە بۆ باشووری ئێران و سەرزەمینی پارس چوون.

ئەوەی ئاشوورییەکان بەناوی دەڤەری پارسوماش یا پارسواش بەناوی باجدەرانی خۆیانەوە باسی دەکەن لەسەرەتادا دەبێ لەباشووری دەریاچەی ورمێدا بدۆزینەوە. پارسەکان لەناوەڕاستی سەدەی شەشەم (پ.ز) دەوڵەتی هەخامەنشییانیان بنیاد ناوەو پێش دروستکردنی حکوومەتی خۆیان لەلایەن کورووشی دوەمەوە لەژێر دەستەلاتی مادەکاندابوون و بە لەناوبردنی حکوومەتی مادو وەرگرتنی دەستەلات لە ئاستیاگ( دوا شای مادەکان) ئیمپەراتۆریەتێکی بەهێزیان دروست کرد کەهەمیشە سنوورەکەی فراوانتر دەبووو لەسەردەمێکدا ئەم سنوورە لەکەنارەکانی روباری دانووبەوە لەئەورووپا تا حەبەشەی لە ئەفەریقادا دەگرتەوە.

سەردەمی مێژوویی ئاریایی کۆن بەم جۆرە لەکۆتایی سەدەی هەشتەمی (پ.ز) دەست پێدەکاو نیوەی دوەمی سەدەی حەوتەمی(پ.ز)ە کە بزاڤەکانی داواکردنی سەربەخۆیی لەسەرانسەری خۆرهەلات و خۆرئاواو باشووری بان ئێراندا سەریان هەڵدا. لەم باسەوە ئەو ئەنجامە بەدەست دێ کەسەردەمی مادەکان یا دروستبوونی دەوڵەتی ماد لەکۆتایی سەدەی هەشتەمی (پ.ز)دا سەردەمی دەستەلاتی ئارییە ئێرانییەکانە لەخۆرهەلاتی کۆنداو بەدوای ئەودا سەردەمی پارسەکان یا هەخامەنشی یا سەردەمی دەست بەسەراگرتنی ئارییە ئێرانییەکان بووە بەسەر خۆرهەلاتی کۆندا. ئەم دوو سەردەمە بەدوادا هاتووو تەواوکەری یەکترن. لەدوای سەردەمی هەخامەنشی سەردەمی سلووکی یا دەستەلاتی مەقدۆنییەکان رەچاو دەکەین کە سەردەمی پێشەوەچوونی توخمی فەرهەنگی و بەزمانی رامیاریی، یۆنانی و مەقدونی‌یە لەئێران و خۆرهەلاتی کۆندا. دوای ئەوە

سەردەمی پارتییان یا ئەشکانی یەکانە کە ئەمانەیش بەپێچەوانەی لافی ساسانی یەکانەوە ئاریایی رەگەزبوون و دوای ئەوان سەردەمی حکوومەتی ساسانییانە کە بەرمانی دەوڵەتی ساسانی و دەرکەوتنی ئیسلام حکوومەتی ئارییەکان یا ئێرانی یەکان کۆتایی دێ.

# بەشی هەشتەم

## لکەکانی ئێرانی و نائێرانی ئارییەکان- هۆکان و شێوازی کۆچی ئەوان:

بۆ پەیبردن بەریشەی ئارییەکان و ئەنجامەکانی کۆچکردنی میللەتانی ئاریایی لەهەزارەی چوارەم تا دوەم(پ.ز) یا بڵێین تا هەزارەی یەکەمی پێش زایین پێویستی تەواومان بەدوو بنەما هەیە، یەکێ زانستی مێژووی راستەقینەو دروستی ئێرانی کۆن دەگەڵ هەموو پەیوەندییەکان و وردەکارییەکانی ئەو. دووەم ئاگاداری لەبن و بێخ و ناوەرۆکی داستانە پەیوەندیدارەکان بەچاخەکانی ئێرانی‌یەوە لەگەڵ گێڕانەوەی جۆراوجۆری ئەوانە کە لەسەرچاوەو نووسراوە جۆربەجۆرەکانەوە، بەچەند زمانێکی جیاجیا کەم تازۆرێ پێمان گەیشتوەو لەبۆچووندا نەگونجاون.

ئاوێتە بوونی ئەفسانەو داستانەکانی ئێرانی دێرین لەگەڵ مێژووی راستەقینەی ئەم سنوورو سەرزەمینەدا پێداچوونەوەو توێژینەوەی زۆر سەخت و دژوارکردوە. نموونەیەکی بەرجەستەی ئەم جۆرە بێگومان(خوداینامە)یە کە لەزمانی پەهلەویدا خودای نامەك یا خوتای نامەك(Khwatay Namag)ی پێوتراوە- هەروەها داستانسەرای مەزنی شانامەی فیردەوسی‌یە. شانامە بەتەنهاو تەنانەت چەند نووسراوێکی دیکەش لەوبابەتە ناتوانن بۆ چارەکردنی ئەم گرفتە کارسازبن.

پەی‌بردن بەزمان و چۆنیەتی بزاڤی ئارییەکان کە ئێمە لەم جۆرە بەڵگەنامانەدا بەداویدا دەگەڕێین، بەبۆچوونی هەندێ لەمێژوونووسان و

دێریننا‌سان بەشێوەیەکی گشتی و لەبنەڕەتدا ئارییەکانی هیندۆ ئەوروپایی لەدوو کورتە سەردەم یا بەوتەیەکی دیکە لەدوو قۆناغدا کەتا رادەیەك ناوبڕەیان کەوتوە، دەستیان بەکۆچ کردوەو لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کۆچەدا بەچەند لکێ یا بەلای کەمەوە بەدوولك دابەش بوون یەکێ لکی خۆرئاوایی کە بەدەوری دەریای رەشدا سووڕی خواردوەو دوای ئەوەی لەتەنگی بسفۆرو داردانیل تێپەڕیون چوونەتە ئاسیای بچووکەوە.

گریشمن بەتەواوی دانی ناوە بەتێکەڵبوونی ئەم بەشە لەگەڵ میللەتانی(ئاسیانی)و عیلامی‌یەکانیش بەهەمان رەگەزی ئاسیانی دادەنێ و دوای ئەم تێکەڵبوونە یەکیەتی (هیتی‌یەکان) بەو هۆیەوە پەیدابوەو ئەوانی بەناوی توخمێکی بەهێزو دەستەڵاتدار لەم یەکیەتییەدا ناوبردوەو بەهۆی ئەم تواناو دەسەڵاتەیانەوە بوە کە توانیویانە بابلی، حووری و میتانی‌یەکان لەناو ببەن. لکێکی دیکە لەم کۆچکردوانە لکی خۆرهەڵاتی هیندۆ ئەوروپاییەکانە کەلەلای خۆرهەڵاتی مازندەرانەوە جووڵاون و گرووپێکی دی لەوانە لەکێوەکانی قەفقاز تێپەڕیون و تا سنووری روباری دجلەو فورات پێشڕەوییان کردوە. ئەمانە لەگەڵ میللەتانی(حوورییانی ئاسیانی) تێکەڵبوون و میللەتی(میتانی)یان دروست کردوە. هەمان میللەت لەوەودوا بەهۆی هیتی‌یەکانەوە شکستیان هێناوە. لەوبڕگە کاتی‌یەدا یا بەوتەیەکی دیکە لەقۆناغی دوەمو سنووری کۆتایی هەزارەی دوەمی(پ.ز) هەتا نزیکەی ١٢٠٠ ساڵ پێش زایین دووبارە میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی لەهەمان ڕاڕەوی پێشوەوە دەستیان بەکۆچ کردوە. لێرەدا ئەم تێکەڵبوونە دەبێ بەهۆی تێکەڵبوونی رەگەزی لەگەڵ میللەتانی دیکەدا.

بەبۆچوونی گیرشمن قەبیلەکانی(تراکوفیرژی)– تراکیەکان و فریگییەکان کە لەلایەن(ئیلیریان)ەوە راوانرابوون و(فریژیان، ئەرمەنییەکان، تراکیان،

میسیان و میللەتانی ساکی لەنیوە دورگەی بالکانی گرتۆتەوە)، پاشایی یا فەرمانڕەوایی هیتی یەکانیان لەناو بردوەو لکێ لەوان بەناوی فەلەستینیەکانەوە هاتونەتە کەناری خۆرهەلاتی دەریای میدیترانە(دەریای سپی)و لکێکی دیکە بەناوی (دووری)یەکانەوە لەڕێی وشکانییەوە گەیشتوونەتە دەریاو دەگەڵ میسرییەکاندا کەوتوونەتە جەنگەوەو دوای ئەوە بۆ سەرزەمینی یۆنانی ئێستا پاشەکشەیان کردوەو لەدواییدا دووشارستانی دێرینی یۆنان، واتە شارستانی(کرت)و شارستانی(میس)یان لەناوبردوە.

(دووری)یەکان خۆیان خاوەن شارستانی بوون و داڕشتنی هونەریی، بیناسازی و گەچکاری و لەلایەنە فەرهەنگی یەکانی دیکەی ئەوان لەمێژوودا ناسراوەو لەهەموو شوێنێ بەناوی داڕشتنی دووری یا (دووریک) ناویان هێنراوە. بەبۆچوونێکی دیکە لەمەڕ کۆچی میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی یەوە وا دەردەکەوێ کە ئەوان بوون بەدوو دەستەوە، گرووپێکیان لەڕێی یۆنان، تسالی، تراکیەوە درێژەیان بەپێشڕەوی خۆیان داوەو گرووپێکی دی لەدوو ڕێڕەوەوە هاتوونەتە ئاسیا. دەستەیەکیان لەڕێگای دەریای ئەژە(دەریای رەش)و مەڕمەڕە (دەریای سوور) بەرەو دورگەکانی میدیترانەیی خۆرهەلات و سەرزەمینی ئاناتۆلی(تورکیای ئەورۆ) ڕۆیشتوونو یۆنانییەکان لەبەڵگەنامەو ئاسەواری خۆیاندا ئەوانیان بە فریزی یەکان(فریگییان) ناوبردوە.

کاتی ئەم کۆچەیان بە لەنێوان کۆتایی هەزارەی چوارەم تا ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی(پ.ز)- ٣٠٠٠-٢٥٠٠پ.ز- باسکردوە.

گرووپەکانی تر یا دەستەی دوەم بە میللەتانی باکووری دەریای رەش، قەفقازو خۆرهەلاتی دەریای خەزەر ناسراون کە لەلایەن ئیلیرییەکان و

میللەتانی دانیشتووی جەزائیرو دەڤەرەکانی بالکان هێرشیان براوەتەسەر وەهەندێ لەوەدا کە پەیوەندی بەم بۆچوونەوە هەبێ لەو باوەڕەدان کە هیندۆ ئەوروپاییەکان لەڕێگای تورکستانەوە درێژەیان بە بزاڤی خۆیان داوەو بۆ ئێران و هندستان رۆیشتوون و ئەم رەوەندانە بەم شێوە باپیرانی مادەکان، پارسەکان، سەغدییان، هیندییان، میتانییان، سیت وسامارتەکانن کە گۆتی و کاسی یەکان کە دانیشتووی خۆماڵی ئەم ناوچانە نەبوون بەهۆی گوشاری ئەم تازە هاتوانەوە هەڵاتوون. بۆچوونێکی دیکە لەوە دەدوێ کە هیندو ئەوروپاییەکان لەنێوان کێوەکانی قەفقازو خەزەر تێپەڕیون و لەشیوی خوارووی ئەرس و دەشتی موغان کە بەئیرانویچ ناسراوە جێنیشتەبوونیان هەڵبژاردوە. بۆچوونێکی دیکە گەیشتنی ئارییە ئێرانییەکان بۆ ئێران لەڕێگای تەنگەکانی داردانل و بۆسفۆرەوە دادەنێ.

وەهاوڕێ لەگەڵ هەندێ لەمیللەتانی قەفقاز بەرەو دیجلەو فورات و ناوچەکانی ئەناتۆلی ملیان ناوەو لەمێژوودا بەهیتی و میتانی یەکان ناسراون.لە هەڵسەنگاندنێکی دیکەدا ئەنجامگیری یەکی دیکە بەدەست دێ کە بەشێوەیەکی گشتی هندۆ ئەوروپاییەکان کە هەزارەی سێیەمی پێش زایین هەرەتی سەردەمی کۆچی ئەوان بوە بۆ هەموو سووچ و کەنارێکی جیهان، بەدوو دەستە یالك دابەشبوون. یەکەمین دەستە یالکێ ئەوانەن کە بۆ کیشوەری ئەوروپا کۆچیان کردوە، دوەمین ئەوانەن کە بۆ کیشوەری ئاسیا کۆچیان کردوە.

هیندۆ ئەوروپایی کە بۆ ئەوروپا کۆچیان کردوە یا بەوتەیەکی دیکە کۆچکەرانی ئەوروپا بەچوار گرووپ دابەشدەبن. یەکەم: گرووپی سەڵتەکان، ئێرلەندییەکان، گوڵنەکان. دووەم: گلۆینەکان، ئیسکۆتلەندییەکان، بیرتنەکان، کەبەرەو خۆرئاواو باکوورو باشووری ئەوروپا رۆیشتوون.

هەروەها سلاڤییەکان کە رووسەکان و بولگارییەکان و لەهەستانی‌یەکان(پۆڵندە) دەگرێتەوە کە رێگای باکووری ئەوروپایان گرتۆتەبەر. سێیەم: لقی لاتینی یا لاتینییەکان کە لەلێواری دەریای میدیترانە لەولاتی یۆنان و سەرزەمینی رۆمی کۆن نیشتەجێبوون. چوارەم: ژەرمەنەکانن (ئەڵمانی) کەلەلای راستی روباری (راین)ەوە تا نیوە دورگەی ئەسکەندناڤیایان بڕیوە. دانیمارکییەکان، نەرویژییەکان، ئەڵمانی و گۆتیکەکان لەم دەستەن و بەلقی خۆرئاوای ژەرمەنەکان ناسراون و لەتەنیشتی ئەوانەوە لیتوانی و ئستوونی‌یەکان بەلکی خۆرهەلاتی ژەرمەن دەژمێردرێن. هەروەها هەندێ لەرەگەز ناسان لهستانی‌یەکان بەبەشێ لەم لقە دادەنێن.

هیندۆ ئەوروپایی کەبۆ ئەوروپا کۆچیان کردوە یا بەوتەیەکی دیکە کۆچکەرانی ئەوروپا بەچوار گرووپ دابەشدەبن. یەکەم: گرووپی سەڵتەکان، ئێرلەندییەکان، گوڵنەکان. دوەم: گلۆنیەکان، ئیسکۆتلەندییەکان، بیرتنەکان، کەبەرەو خۆرئاواو باکوورو باشووری ئەوروپا رۆیشتوون.
هەروەها سلاڤییەکان کە رووسەکان و بولگارییەکان و لەهستانی‌یەکان(پۆڵندە) دەگرێتەوە کەرێگای باکووری ئەوروپایان گرتۆتەبەر. سێیەم: لقی لاتینی یا لاتینییەکان کە لێواری دەریای میدیترانە لەولاتی یۆنان و سەرزەمینی رۆمی کۆن نیشتەجێبوون. چوارەم: ژەرمەنەکانن(ئەڵمانی)کەلەلای راستی روباری(راین)ەوە تانیوە دورگەی ئەسکەندەناڤیایان بڕیوە. دانیمارکییەکان، نەرویژییەکان، ئەڵمانی و گۆتیکەکان لەم دەستەن و بەلقی خۆرئاوای ژەرمەنەکان ناسراون و لەتەنیشتی ئەوانەوە لیتوانی و ئستوونی‌یەکان بەلکی خۆرهەلاتی ژرەرمەن

دەژمێردرێن. هەروەها هەندێ لەڕەگەزناسان لهستانی‌یەکان بە بەشێ لەم لقە دادەنێن.

ڕەوەندە ئاسیایی‌یەکانیش دووبارە بەچەند دەستەیەك دابەش دەبن کە سەرەکییەکانیان هیندییەکان و سکایان و هیتی و میتانی‌یەکانن. بەپێی چەند توێژینەوەیەکی دیکە لەم ڕووەوە لکی ئاسیایی هیندۆ ئەوروپایی‌یەکان کیمیریان و کیلیکیان و ئەشکانیان، مووسیان، لوکیان، فەلەستینی‌یەکان، میتانی‌یەکان، هیتی‌یەکان، ئورارتووئی‌یەکان، سکوتییان(سکایان)، فریژی‌یەکان(فریگیان) دەگرێتەوە. بەگوێرەی هەمان هەڵسەنگاندن میتانی‌یەکان بەدێرینترین میللەتی هیندۆ ئەوروپایی ناسراون و دیارە کەئاریایی ڕەگەزن و لەسەر ئایین و بیروباوەڕە هاوبەشەکانیان لەگەڵ ئارییەکاندا جەخت کراوە. هەروەها بۆچوونی زمانناسان لەم ڕووەوە سەرنج ڕادەکێشێ.

ویل دورانت لەو باوەڕەدایە کە جێگۆڕکێی خودایانی هیندۆ ئەوروپایی وەك میتراو رونا و ئیندرا هێڵی هاتوچۆو کۆچی هیندۆ ئەوروپاییەکان نیشانی ئێمە دەدا ئەو بڕوای بەهاوبەشییەکی بەرچاو لەنێوان زمانی میتانی و یۆنانی‌یەکاندا هەیەو لەلایەن میتانی‌یەکانەوە لەپەیمانە سەربازی، ڕامیاری‌یەکانی خۆیاندا بەخودایانی هیندۆ ئەوروپایی وەك میترا... هتد سوێندیان خواردوە.

ویل دورانت لەدەم هیرۆدیتەوە دەگێڕێتەوە کە بەوتەی زانایان و گەورەپیاوانی فینیقی، باووباپیرانیان لەدانیشتوانی کەنداوی فارس بوون. بەپێی ئەم بەڵگەیە گرووپێ لەفینیقی‌یەکان بەئاریایی و دەستەیەکیان بەئارامی و سامی ڕەگەز دادەنرێن. هەمان توێژەر هیتی‌یەکان، کاسی و سەغدییەکان باکترییەکان (باختەری)، مادەکان، پارسەکان

(هەخامەنشییان)و هێرشبەرانی ئاریایی هیند لەلکێکی جیاواز لەرەگەزدا لەگەڵ هیندۆ ئەوروپاییەکان دەزانێ کە لە لێوارەکانی دەریای خەزەرەوە رۆیشتوون و لەهەموو سووچ و گۆشەیەکدا بڵاوەیان کردوە. هەندێ لەدێرینناسان کە بەخاوەن شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی بۆچوونە مێژوویییەکان ناوبراون و خۆشییان بۆچوونی تایبەتی خۆیان هەیە، هەوڵیان داوە کە لەنێوان ئەو دەستەی لەهیندۆ ئەوروپاییەکان کە بۆئاسیا کۆچیان کردوەو لەئاسیای بچووك و بان ئێراندا جێگیربوون، لەگەڵ ئەو دەستە هیندۆ ئەوروپاییانەی بۆ ئەوروپا وەك ئەوروپای باکووریی، رۆژئاوایی، باشووریی رۆیشتوون، سنوورێکی جیاکەرەوە دیاری بکەن. دێریینناسی کۆچکردوو (رۆمان گیرشمن) لەوباوەڕەدایە کەبەوردبوونەوە لەوبنەمایانەی لەلایەن زماننناسانەوە خراونەتەروو پەیوەندی نێوان زمان و دیالێکتەکانی ئیتالیایی، سەلتی، هیندی و ئێرانی ئاشکرایە، کە دەتوانرێ لەو رێگایەوە باسی هاوبەشییە رەگەزییەکان و نزیکی و کەسایەتی ئەو خەڵکانە بکرێ.

هەروەها شێوازی ژیانی ئەم میللەتانە لەیەك چوە. واتە دەشتەکییەکانی ئەوروپایی وەك ئێرانییەکان(ئاریای کۆن) بەپیشەی شوانکاری و ئاژەڵدارییەوە سەرقاڵبوون و هەموان پەروەردەکردنی ئەسپیان زانیوە. لەهونەرە جەنگییەکان و شێوازەکانی شەڕدا هاوبەشییەکی فرەیان هەبوەو لەنێوانیاندا وەك سکایان و ئەشکانییان(پارتیان) سوارەی سەربازی هەبوەو بەتەواوی گۆڕستانە دۆزراوەکانی ئەوروپا کە پەیوەندییان بەئەوروپاییەکانی کۆنەوە هەیە هەروەك گۆڕستانە کۆنەکانی ئێران دێنەبەرچاو. تێکڕا ئەم دێرینناسە لەو باوەڕەدایە کەئەمانە خاوەنی یەك سەرچاوە یا بەوتەیەکی دیکە یەك نیشتمانی هاوبەش بوون و زۆر

لەتایبەتمەندییەکانی رەنگ و ژیان و فەرهەنگیی باویان پاراستوەو بۆ ئەوانەی دوای خۆشییان جێهێشوە.

## هۆکانی کۆچی ئارییەکان:

نەتەوەناسان و دێریننناسان چەند مەبەست و هۆیەکی جیاجیا و زۆر بۆ کۆچی ئارییەکان لەنیشتمانی خۆیانەوە بۆ شوێنەجۆراوجۆرەکان باس دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی دەبێ ئەم خاڵە رەچاوبکرێ کە کۆچی میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی بەپلەی یەکەم هۆی ئابووری یابەوتەیەکی دیکە بژێویی هەبوە. سەرهەڵدانی جارناجاری گرانی کەزۆری بەهۆی وشکساڵییەوە بووەو هەردەم پێکەوە هاوکات و هاورێبوون، یەکێ بووە لەهۆکانی هێرشبردنی ئەم خەڵکانە بۆسەرزەوییە دراوسێکان یا دوورە دەستەکان. بەتوێژینەوەی مێژووی جیهان، بەتایبەتی سەردەمە دێرینەکان دەتوانرێ سەرزەمینێکی زۆر دەست نیشان بکەن کەخاوەنی شارستانیی پێشکەوتوو وبنچینەی ئابووری بەرچاوبوون و کەوتوونەتەبەر پەلاماری میللەتانی بیابانگەڕو وێرانکار. نموونەی ئەوانە میسرە لەکۆتایی سەردەمی ناوەڕاستدا کەلەرووی ئابووری و شارستانییەوە لەپلەیەکی باش پێشکەوتن و بایەخداردا بوە کە لەگەڵ شارستانییە پێشکەوتوەکانی بین النهرین (میزۆپۆتامیا) و یۆنانی کۆن رکابەری دەکرد.

سەرزەمینی میسر لەلایەن میللەتی هیکسۆسەوە هێرشی برایەسەر، کەڕەنگە بیابانگەڕانی ئاسیای سەنتەری بووبن و بەلایەنی کەمەوە یەکسەد ساڵ لەمیسردا باڵادەست بوون و وێرانیان کردوە. حکوومەتی هیکسۆسەکان لەمێژووی میسردا بەدەسەڵاتی شوانان ناسراوە. میسرییەکانی خاوەن ژیار بەهۆی هێرشی ئەم هێرشبەرانەوە دیاردەیەکی زۆری شارستانی پێشکەوتووی میسریان بەوانە سپاردو ئەوانیش

شوێنەوارو دیاردە بەرچاوەکانی ئەم ژیارە کۆنەیان لەناوبردو هیچ دیارییەکیان بێجگە لەتالانی و وێرانکردن بۆسەرزەمینی نیل پێنەبوو.

هۆیەکی دیکە لەهۆ گرنگەکانی کۆچی میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی دەتوانرێ بەبێتوانایی ئەوان لەبەرامبەر هێرش و دەستدرێژی میللەتانی جێنیشتەبووی ئیلیری و نیوە دورگەی باڵکان دابنرێ، کە بەدرێژای نزیکەی سی هەزار ساڵی پێش لەدایکبوونی مەسیح ئەم هێرش و گوشارە، بەشێوەی بچڕبچڕ لەسەرەتاداو بەردەوام لەکۆتاییدا دەرکەوتوەو لەئەنجامی ئەم هێرش و گوشارانەدا میللەتانی ئیلیری و دانیشتوانی ناوچەی بالکان بەئەنجامی خۆیان گەیشتوون و لەباکووری خۆرهەڵاتی دەریای ئادریاتیك نیشتەجێ بوون و لەئەنجامدا هیندۆ ئەوروپاییەکان ناچاربوون بەجێهێشتنی ڕێ وجێی خۆیان و ملنان بۆچەند ناوچەیەکی دیکە. ئاشکرایە کەهەل ومەرجی ناهەمواری ناوچەیی و نالەباری ئاوو هەوا، وەك زیادبوونی ڕۆژانەی سەرماو بەدوای ئەودا بەستەڵەکی درێژخایەن لەهۆکانی دیکەی کۆچکردنی هیندۆ ئەوروپاییەکان دەژمێردرێن. خاڵێ کەلێرەدا پێویستە بایەخی پێبدرێ پەیبردنە بەسەردەمی پەروەردەکردنی چوارپێی درشت ئەندام لەتەك ئاژەڵی بچووکدا لەلایەن هیندۆ ئەوروپاییەکانەوە کە زەمینناسان و دێریننانسان بەم خاڵە بایەخێکی زۆریان داوەو ئەنجامی پێویستیان لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بەدەستهێناوە. ئەسپ یەکێکە لەو گیان لەبەرانەی کەبێ گومان ئارییە ئێرانییەکان لەگەڵ خۆیاندا هێناویانە بۆ بان ئێران.

چونکە بەپاڵپشتی هەمان سەرچاوەو بەڵگەنامە، عەرەبانەی ئارییەکان بەهۆی ئەسپەوە ڕاکێشراوەو هەر بەوجۆرەش هەڵگرتنی ئازووخەو کەل وپەلی جەنگ بەهۆی ئەسپەوە ئەنجام دراوە.ماڵیکردنی ئەسپ لەلایەن

هیندۆ ئەوروپاییەکانـەوە لەوانەیـە لەسـەرەتاکانی هـەزارەی دوەمـی پێـش زایین واتە نزیکەی ۱۸۰۰ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیحدا بووبێ.

هیندۆئەوروپییان بەپێی بۆچوون و ئەنجامگیری(ئارنولد توین بی) لـەم مـاوە دیـاریکراوەدا دەسـتیان کـردووە بەپـەروەردەکردنی ئەسـپ وەك گیانلەبـەرێکی مـاڵی کـە لەچارەسـەرکردنی ئابووری بـەرگری و دیـارە بـۆ بژێویـی بەدەسـتهێنانیش زۆر کاریگـەرو سـوودمەندبووەو بـۆ ئـەوکارە هەلومەرجی جوگرافی و بارودۆخی ناوچـەیی لەگـەڵ کەشـی لـەباریان بـۆ بەخێوکردنی ئەم گیانلەبەرە هـەبوە. لـەم سـەردەمەدا دەبـێ ژیـانی هینـدۆ ئەوروپاییـەکان شـێوەی عێـل یـا عەشـیرەتی هـەبووبێ. ئـەوەی ئـەم بەڵگـە هێنانەوە دووپات دەکاتـەوە دۆزراوەکانی دیریننـاسی پەیوەسـت بـە ۱۸۰۰ ساڵ پێش زایینە کە لەقووڵترین توێژاڵە قوڕی تروای پێنجەم ئێسکی ئەسپ بەدەست هێنراوە کە ئەوکارە دەخەنە پاڵ هینـدۆ ئەوروپییـەکان. میللـەتانی هیندۆ ئەوروپی لەهـەزارەی سێیەم و دوەمـی پێـش زایـین کەرەنگە بەرامبـەر بەسـەردەمی کۆچـی گـەورەی ئـەوان بووبـێ، خـاوەنی شارسـتانیبوون. لەسەرزەمینی یۆنانی کۆن لەنێوان سالانی ۲۱٤۰و ۱۷۳۰ پێش زایین چەند نیشانەیەك لەسەر شارستانییەتیان هەبوە کە لەئەنجامی چەند هۆکارێکی جۆراوجۆرەوە ئـەم شارسـتانییەتە لـەناوچووە لەوانەیـە لـەناوچوونی ئـەم شارستانییەتە بـەهۆی چـەند میللـەتێکی دووری‌یـەوە ئـەنجام درابـێ. ئـەم میللەتانـە بێگومـان بـەزمانی هینـدۆ ئـەوروپایی وتووێژیـان کـردوە. توێژینـەوەی دێریننـاسی لەلایـەن ئـارتور ئوانـس و هـنری شـلیمن و بـەپێی ناوەڕۆکی پەراوی(کۆشکی کنوسوس) ئەوە دەردەخـەن کەکۆشـکی مینـوس پاشای کەرت لەدەوروبەری ساڵی ۱۷۵۰ پ.ز دا وێران بووەو سـەردەمەکەی بەسەردەمی هێرشی کاسی‌یەکان بۆسەر بابل و هکسۆسەکان بۆسـەر میسـر

بووە. دیارە نابێ وەهابزانرێ کە کۆشکی مینوس لەلایەن ئەوانەوە وێران بووە چونکە بەپێی سەرچاوە یۆنانی‌یەکان حکوومەتی مینوس لەلایەن کچەکەیەوە ئارین‌و زاواکەیەوە(تیزە) لەناوچووەو جارێکی دیکەش بەو ئەنجامە دەگەین کەکۆچی میللەتانی هیندۆ ئەوروپایی، بەوپێیەی زۆربەی توێژەران دانیان پێداناوە لەدەوروبەری نێوان هەزارەی سێیەم‌و هەزارەی یەکەمی پێش زاییندابووە ئەم کۆچە لەیەك کاتدا یالەیەك برگەی کاتیدا رووی‌نەداوە بەڵکو بەشێوەیەکی بچڕبچڕو هەندێ جاریش بەشێوەیەکی بەردەوام‌و بەربڵاویی جوگرافی روویداوە.(ئومستد) رۆژهەڵاتناسی ناودار لەوباوەڕەدایە کەمیللەتانی هیندۆ ئەوروپایی بەسێ گرووپ یالکی لەیەکتر جیاواز بڵاوەیان لێکردوە. یەکەم لکێ کەبۆ باشوور واتە سەرزەمینی یۆنانی هەنووکە رۆیشتوون، کەئەوانە ئاکسی‌یەکان بوون. ئاکسی‌یەکان خۆیان بەوەچەی هیلن(هیلنا)- خوای گەورەی یۆنانیانی کۆن دەزانی. هیلن دوو کوڕی هەبوە بەناوی دوروس‌و ئیولوس. دووری‌یەکان دەچنەوەسەر دوروس‌و ئیولی‌یەکان دەچنەوەسەر ئیولوس لەنەوەی(هیلن)ن.

هیلن جگە لەم دوومناڵە دوونەوەی دیکەی‌بوە کە(ئەیوون)و(ئاکسووس)یان ناوبوە. ئەیوونی‌یەکان یا یۆنانی‌یەکان لەنەوەی ئەیون‌و ئاکسی‌یەکان(ئاخسی) لەنەوەو وەچەی ئاکسوس(ئاخنوس)ن. دەبێ ئەوەشمان لەیاد نەچێ کەناوی سەرزەمینی یۆنان یایونە لەم خوای جۆرەی ئەیون وەرگیراوە. ئەیون بەگەورە خودای سەردەمی یۆنانی‌یەکان ناسراوەو لەئەفسانەو نووسراوە ئایینی‌یە ئەدەبی‌یەکانی یۆنانیدا کرونوس(خرونوس) خودای سەردەمی ئەوبووە کرونوس دوو منالی هەبوە زئوس‌و هادس. هەروەها کرونوس کچێکی هەبوە بەناوی(هیرا)وە کە لەدواییدا شووی کردوە بەزئوسی برای.

دووەمین لك یاگرووپ لەمیللەتانی هیندۆ ئەوروپایی لکی خۆرهەڵاتی یا خاوەرین کە بەکۆچکەرانی ئاسیایی ناسراون و بریتین لەهیتی یەکان، میتانیەکان، هیندۆ ئێرانیەکان، کاسیەکان، هیکسۆسەکان، فریژیو هیندۆ ئەوروپی سوریاو کەنعان. لەوەودواش چەند نیشانەیەك لەسەر تێکەڵبوونی رەگەز لەگەڵ ئارامی و سامی یەکاندا دەرکەوتووە کەتەنها لەرووی زمان و ئاداب و نەریتەوە دەتوانرێ سنوورێکیان بۆ دابنرێ بۆ جیابوونەوەیان.

لك یاگرووپی سێیەم کۆچکردوانی خۆرئاوایی یا باختەرین کەلەرێی ئەوروپای نێوەندیو باشوورییەوە پێشڕەوییان کردوەو لەسەر بنچینەی هەندێ لێکۆڵینەوە درێژەیان بەم پێشڕەوییە داوە. ئەم لکە دووری یەکان و ئەیونی یەکان دەگرێتەوە. دوورییەکان هێرشیان بردۆتەسەر یۆنان و ئاکسی یەکانیان لەوناوە وەدەرناوە. ئاکسی یەکان دوای هەڵاتن لەدەست دوورییەکان بەرەو قبرس و کەنارەکانی دەریای رەش و دەوروبەری ئاسیای بچووك ملیان ناوە. ئەو پێشڕەوییەی ئەوان بوە بەهۆی پێکدادانی ئەوان لەگەڵ هیندۆ ئەوروپاییەکانی سووریاو کەنعان و لێرەدا چەند نیشانەیەکی تێکەڵبوونی رەگەزی نێوان ئاری سامی و ئارامییەکان دەبینرێ. هەندێ پشتگیرییان لەم پێکدادانی هیندۆ ئەوروپییانە لەگەڵ فریژییەکانی جێنیشتەی ئاسیای بچووك و هیتی یەکان کردوە. رووداني جەنگی تروا بەدوای ئەم پێکادانانەدا هاتووە. ئەم جەنگە لەنێوان ئاگامیمنون پاشای میسن و(پریام) پاشای تروا روویداو بەسەرکەوتنی یۆنانییەکان یا میسنیەکان کۆتایی هات.

دوای ئەم کۆچانە قۆناغێکی نوێ یا سێیەمین قۆناغ لەکۆچی هیندۆ ئەوروپییەکان بۆ یۆنان بەهۆی ئەیونییەکانەوە هاتۆتە ئاراوە. ئەم قۆناغە لەکۆچکردن دەبێ بەهۆی لەناوچوونی شارستانی هیتی یەکان. لێرەدا

نـاتوانرێ لەمـەڕ لـەناوچوونی شارسـتانی هیتییـەکان قسـە بکـرێ، بـەڵکو زۆرتـری بـڕوا لەسـەر ئەوەیـە کەشارسـتانی هیتییـەکان لـەناو شارسـتانی میللـەتانی دیکـەدا کـە لـەنێوانیاندا میللەتـە هێرشـبەرەکانن تواوەتـەوەو. هـەندێ لـەم هینـدۆ ئەوروپییانـە لەتـەك مینوسـییەکاندا یـا خـاوەنی شارستانیی(کرت) بۆ سووریاو میسر ملیان ناوە کەرەنگە ئـەوان هـەمان هیکسۆس بن کە لەکۆتایی سەردەمی ناوەڕاستی مێژووی میسردا هێرشیان بردووە بۆ ئەو زەوییە.

ئاکسـی‌یەکانیش بـۆ سـەرزەمینی ئەسـڵی خۆیـان قـبرس و کیلیلیـان و سـاردنی‌یەکان بـۆ جـەزائیری عـەرەبی و ئەتروسـکەکان بـۆ ئیتالیـاو فەلەسـتینی‌یەکان بـۆ فەلەسـتین گەڕاونەتـەوە. لـێرەدا بەڵگـە لەسـەر لێکنەترازانی رەگەزیی سامی_ ئارامی بەرچاو دەکەوێ و ئەم تێکەڵبوونی رەگەزییـە تـا ئێسـتاش بەردەوامی خۆی پاراستوە. ئەگـەرێ لەئارادایـە کـە بەپێچەوانـەی هـەندێ لەمێژوونووسـان و دێریننـاسـان لەمـەڕ دانیشـتوانی سەرەتایی سـەرزەمینی عیلام کـەپێیان دەوتـرا کۆیلـەکانی حەبەشـی، هـەمان کـۆچ و رەو رۆڵـی خـۆی بینیـوە. چونکـە مەبەسـت لەکۆیلـەکانی یـا رەشەکانی(قولەڕەشەکانی) حەبەشی رەنگە ئەوەبێ کە لەمیانەی ئەنجامدانی گواسـتنەوەو راگوێـزو بازرگـانی کۆیلـە، گرووپـێ لەباشـووری خۆرئـاوای ئـێراندا جێگـیربوو بێتن و ژیـانی ئـابووری و لایـەنی رامیـاری و سـەربازی و فەرهەنگی‌یان پەیڕەو کردبێ.

دیـاکۆنوف لەوباوەڕەدایـە کـە لەقـەراغی کـەنداوی فـارس خـەڵکانێکی رەشپێسـت ژیـاون. بەگوێرەی ئـەم جـۆرە توێژینـەوە یەکـەمین دانیشـتوانی عیلام بەسیاپێسـتی حەبەشـی و رەگـەزی عیلامیـش کەهەرلەوانـە خـاوەنی بالای کورت، مووی لوول(ئالۆز)، چاوی بەقووڵاچوو، لێوی ئەستووربوون.

گریشـمن ئـەم بۆچوونـە دەربـارەی عیلامی‌یـەکان ناسـەلمێنێ و ئـەوان بەرەگەزی ئاسیانی دەزانێ. لێرەدا پێویستە ئەم خاڵە وەبیر بهێنرێتەوە کە ئەگـەر عیلامی‌یـەکان بەرەگـەزی حەبەشـی‌یەکان دابنێـین ئـەوا ئـەوانمان لەرەگەزی سامی و ئارامی‌یەکان نزیك کردۆتەوە.

# بەشی نۆ
# ڕێوشوێنی بان ئێران
# لە پێش کۆچ و لەسەردەمی کۆچی ئارییەکان بۆ ئەم بانە

بەبۆچوونی هەندێ لەمێژووناسان و نەتەوە ناسان لەتوێژینەوەیەکی بەربلاودا کە بەدرێژایی مێژووی ڕەگەزناسی، بەتایبەتی لەم سەدانەی دواییداو لەهەمووی لەبەرتر سەدەی ئەمێستاکە، لەگەڵ لێکۆڵینەوەی ئاسەوارە دۆزراوەکان لەگۆشەو کەناری بان ئێران و دەرهێنراوی گۆڕەکان و وردبوونەوە لەکەللەسەرو ئێسك و پروسکی بەدەست هاتووی مرۆڤ لەم گۆڕانە، بڕێ لەتوێژەران گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کەخەڵکی باکووری خۆرهەڵاتی ئێران لەدانیشتوانی دەڤەرەکانی پارت، خۆراسان، سەغد، مەرو، باکتریا، خوارزەم و هەرات-هتد بەرەگەزی میدیترانە لەقەڵەم دراون. تێکەڵبوونی ڕەگەزی ئارامی و سامی و ئێرانیش پێش هاتنی ئارییەکان لەوەدەچێ کە هەبووبێ. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە هەندێ لەجوولەکەکانی نیشتەجێی ئاسیای ناوەندی، هەندێ لەدانیشتوای باکووری ئێران و قەفقاز لەڕێی توێژینەوە لەسەر کەللە سەریان بەرەگەزێکی لێکچوو دادەنێن.

بەگوێرەی ئەو بەڵگەیە کاتی هاتنی ئێرانییەکان بەتەواوی بۆ ئێمە ڕوون نەبۆتەوە. لەلای باکوورو کەنارەکانی دەریای خەزەر خەڵکانێ کە بەباکووریی ناوبراون، هەروەها لەخۆرئاوادا خەڵکانێ لەرەگەزی میدیترانەیی لەجینسی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا هاتوونەتە ئەم

سەرزەوییەو لەهەمان کاتدا لە باشووری ئێران خەڵکانێ لەرەگەزی رەشپێست ژیاون.

کەللەسەرە دۆزراوەکان لەگۆڕەکانی دەڤەری(شاە تەپە)ئەوە نیشان دەدەن کە خەڵکی ئەو ناوە لەگەڵ خەڵکانێ کە لەدەوروبەری دەریای مازندەران ژیانیان بەسەربردوە هاورەگەزبوون و لەرەگەزی خەڵکانی هیندۆ ئەوروپایی‌بوون و ئەوانیان بەکەللەسەر درێژ یا(دولیکوسفال) ناوبردوە. کەللەسەرەکانی خەڵکی دەوروبەری(تەپە حەسار)یش لەجۆری دولیکوسفال و هاوڕەگەز لەگەڵ دانیشتوانی دەوروبەری دەریای خەزەر بەرەگەزی هیندۆ ئەوروپایی ناسراون. کەللەسەرانی دۆزراوە لە(شاە تەپە) پەیوەستە بەهەزارەی سێیەمی پێش زایین و(ئاورل شتین) ئەوانی لەجۆری دولیکوسفال دەستنیشان کردوە. گریشمن ئەو کەللەسەرانەی پەیوەندییان بەهەزارەی چوارەم و سێیەم و دوەمی پێش زایینەوە هەیە، بەلای زۆرەوە لەجۆری دولیکوسفال یا میدیترانەیی دەستنیشان کردوە. ئەو خەڵکانی میزۆپۆتامیا، شام، ئانوو، تورکستان، بلۆجستان و موهنجودارو بەهەمان نەژاد دەزانێ.

ئەو لەو باوەڕەدایە کە لەسەردەمی بەردو سەردەمی فلزی مس و برونز(مەفرەغ) رەگەزی میدیترانەیی لەنێوان دەڤەری میدیترانەو سنووری دەریای سند بڵاوەیان لێکردوە بۆ ژیان. لەدواییدا خەڵکانی(ئاڵپی) رەگەز لەگەڵ ئەواندا تێکەل بوون و لەدەوروبەری هەزارەی یەکەمی پێش زایین رەگەزی(پراکی‌سفال) هاتوونەتە ئێرانەوە. گیرشمن لەهەڵسەنگاندنێکدا توێژەران بۆ بۆچوونێ رێنمایی دەکا- کەزۆر دڵنیاکەر نییە-کەبەم جۆرە نەژادی ئێرانییەکان بەپێی سەردەمەکان بخرێتەبەر تیشکی توێژینەوەو بەیەك جۆرە رەگەزەوە پەیوەند نەبی: واتە خەڵکانی دانیشتوو لەبان ئێراندا

تا هەزارەی دوەمی پێش زایین لەرەگەزی کەلەسەر درێژ یا (دولیکوسفال)ی میدیترانەیی یا ئاسیانی بوون و لەهەزارەی دوەمی پێ زایین و ئەوەو دواش بەشێوەی (براکیسفال) یا کەللەسەرخڕ بوون. لەبەرئەوە پێویستە بان ئێران لەرووی جوگرافی و هەل‌ومەرجی ناوچەیی‌یەوە بەیەکێ لەناوچەکانی سەر رووی زەوی بژمێردرێ کە لەمێژەوە زۆر سەرنج راکێش و جێی هاتوچۆی زۆرو پێکدادانی میللەتان و خەڵکانێ بوە لەچەند رەگەزو تیرەیەکی جۆراوجۆری مرۆڤ لەسەر رووی زەوی. ئەم کارە خۆی بووە بەهۆی گۆڕانکارییەکی بەرفراوان لەتێکەڵبوونی رەگەزی و ئاڵوگۆری فەرهەنگی و شارستانی لەنێوان ئەم نەتەوەو خەڵکە رەگەزوتیرە جیاجیایانەدا. هەربەپێی ئەم بەڵگەیەش لەمەڕ رەگەزی دانیشتوانی ئەم بانە لەپێش هاتنی ئارییەکاندا ناتوانرێ بەتەنها پشت ببەسترێ بەیەك رەگەزەوە ناوی ببرێ.

(پێکدادانی ئارییەکان لەگەڵ فەرهەنگ و هونەری میللەتانی ئەسڵی)

ناوچەی سیلك لەئێراندا بەدرێژایی مێژووی دێریننناسی بایەخێکی تایبەتی هەبوە. تەپۆڵکەکانی سیلك لەباشووری کاشاندا هەمیشە سەرنجی دێریننناسانی بەرەوخۆی راکێشاوە. میللەتانی دێرینی سیلك لەسەرەتاوە دەشتنشین و بیابانگەربوون و لەدواییدا گوندنشین و خانووسازییان دەستپێکردوە. پاش ماوەیەك خەڵکانێ لەناوچەکانی باکووری خۆرهەڵاتی ئێرانەوە روەو ئێران ملیان نا. هەروەها لەلای خۆرئاوای ئێرانەوە هێرش و دەستدرێژی لەلایەن دانیشتوانی میزۆپۆتامیاوە بۆهەندێ ناوچەی ئێران کرا، بەتایبەتی خۆرئاوای ئێران وەئەمە سەرەرای وێرانی و تالانی و کوشتار کە لەئەنجامی ئەم دەستدرێژی و هێرشانەدا روویاندا، پەیوەندی نەتەوایەتیش پەیدابوو. لەبنچینەدا جەنگەکان لەپاڵ ئاسەواری نێگەتیڤی خۆیاندا کەهەژاری و وێرانی و کوشتارو بەدکاری دەخەنە ناوەوە

کەلتووریش دووبارە ئاڵوگۆڕ دەکەن. لەلای باکووری خۆرئاوای بان ئێرانەوە دیسان خەڵکانێ هاتنە ناوەوە کە لەتێکەڵبوونی ئەوان لەگەڵ میللەتانی رەگەزێکی دیکەدا بەڵگەنامەی یەکلاکەرەوە لەبەردەستدا نییە. رەنگە مادەکان، پارس و پارتەکان دوامیللەتانێ بووبێتن هاورێ لەگەڵ خێڵەکانیاندا چووبێتنە بان ئێران.

بەگوێرەی هەمان توێژینەوەو تیۆری پێکهاتەی نەتەوایەتی ئێران بەدرێژایی دووهەزارە واتە لەهەزارەی سێیەمەوە هەتا سەرەتای یەکەمین هەزارەی پێش زایین رەنگە گۆڕانێکی زۆر کەمی تیاروودابێ.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم میللەتانەی خوارەوە دەتوانرێ بەدانیشتوانی ئەسڵی ئێران(بان ئێران) لەپێش چوونی ئارییەکان بژمێردرێن. گرۆهی یەکەم خەڵکانێکن کە لەناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێوە تا ناوچەی سەرووی روباری دیالە ناسراون و بریتین لە گۆتییەکان کەزۆربەیان پەیوەندن بەناوچەکانی خۆرهەلاتەوە. ئەمجا لۆلۆبییان کەسنووری ئەمان زۆرتری بەرەو خۆرئاوا درێژبۆتەوە.هەروەها(کاسییان) کە لەناوچەی باشووری خۆرئاوا واتە لەناوچەی سەرووی روبارەکانی دیالەو کەرخە جێنیشتەبوون.

گرۆهی دوەم دانیشتوانی کەنارەکانی دەریای مازندەرانن کە بەکاسپییان ناسراون و بەلای هەندێکەوە دەخرێنە پاڵ عیلامی و کاسی‌یەکان وەلێ ئەم بۆچوونە لەلایەن هەموو کارناسانەوە پشتگیری لێنەکراوە. میللەتانی دیکەی دانیشتووی دەوروبەری دەریای خەزەر بریتین لە کادووسیان، گیلان، تەپوورییان یا تەبەرستانیان و ماردان یا ئاماردیەکان کە لەناوچەکانی نێوان سەرزەمینەکانی ژێر دەستەلاتی تەپوورییان و کادوسیان جێنیشتەبوون.

گرۆهی سێیەم خەڵکانێکن کە لەکەنارەکانی ئاوی باشووری پشتەی ئێران واتە لە کەنارەکانی کەنداوی فارس جێگیر بووبوون. ئەوانە رەنگە خەڵکانی رەشپێست بووبێتن کەزووتریش ئامارژەمان بۆکردن. پتر لەمە حوورییان لە دۆڵەکانی خۆرئاوای چیاکانی زاگرۆس دەژیان.

لەنێوان ئەم میللەت و تیرانە کەناومان بردن کاسییان لەرووی پێشکەوتن و فەرهەنگی بژێوییەوە خاوەنی تایبەتمەندی و دەرکەوتوویییەك بوون کە نموونەیان دەتوانرێ لەئاسەواری بەدەستهاتووی ناوچەی لورستان بناسرێتەوە. کاسییەکان لەدروستکردنی برێ لەو شوێنەوارە ناوبراوانە بەبرۆنزی لورستان یا گەنجینەی لورستان زۆر سەرنجراکێش بوون.

جارناجارێ تێکەڵبوونی فراوان و قووڵ لەنێوان هونەری ئێرانییەکانی سەدەی هەشتەم و حەوتەمی پێش زایین لەگەڵ هونەری کاسییان، گۆتییان، سکایان، کیمیریان- هتد بەرچاو دەکەوێ.

لەتوێژینەوەی هونەری مادەکان لەگەنجی زێویە نزیکی سەقز دووبارە لەم پەیوەندیی و تێکەڵبوونە پشتگیری کراوە. تێکڕا دەبێ بەیەك توخمی مێژوویی لەئێراندا بیربکرێتەوە، کە لەدوای کۆچی ئارییەکان بۆ بان ئێران هێدی هێدی و بەپشتیوانی هونەرو فەرهەنگی خەڵکی ناوخۆیی بەدەست هاتوە. گریشمن لەوباوەڕەدایە کە هونەری گۆزەگەریی چ وەك بەرهەم و چ وەك نەقش و نیگاری گۆزە هەروەها هەوێن بۆ پاراستنی شلەمەنی بەڵکو پاراستنی تۆوی خەلەش لەلای باکووری خۆرهەلاتی ئێرانەوە چۆتە بان ئێران.

لەسەردەم یاچاخی مێژوویی ئێراندا(کە زۆرتری مەبەست لە سەرەتای چاخی مێژووییە لە ئێراندا) زۆربەی لەخۆرئاواو باکووردا ئەم کارە لەزەمینەی هونەردا لەئارادابوە. ئەم چاخە بەلای هەندێکەوە بەسەردەمی

رووبەروو بوونەوەی شێوازی هونەرییەکان و لێکدانی کەلتوور یا بەوتەیەکی دیکە ناکۆکی نێوان دەشتەکی و نیمچە دەشتەکییەکانە. چونکە لەلایەکەوە دانیشتوانی سەرزەوی عیلام و کاسییان و لۆلۆیی و گۆتییەکان، لەلایەکی دیکەوە ئەو شارستانییەی لە میزۆپۆتامیادا هەبوە تەوەری بنەڕەتی ئەم بەیەکدا دانە یا ناکۆکییانە بوون.

لەم سەردەمە یالەم ماوەکەمەدا کە تاڕادەیەکیش درێژ خایەن بوە چەند نیشانەیەکی زۆر بەتایبەتی بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتی دێریننناسی و مێژوویی لەبەردەستدایە. داواکاری زۆرو پێویستی کەرەسەی کانزایی و بەرد بۆ بەکارهێنانیان لەپیشەسازی کارگەو بەرهەمهێنانی ئیشی دەستدا، ئێرانی وەك ناوچەیەکی بایەخدار دەستنیشان کردبوو، کە گرنگترین بازاڕی فرۆشتن و هاتوچۆو تێپەڕبوونی کاڵا یا بەوتەیەکی دیکە ترانزێتی گرتۆتە ئەستۆی خۆی و لەپەیوەندی لەگەڵ شارستانییە سەنتەری و خۆرهەڵاتییەکاندا دراوە بەسەرزەمینی ئێران، کە لەتوێژینەوەی ئاسەوارە هونەرییەکانی مادو سکایان و کیمیریان و ئاشوورییەکاندا ئەم رەنگڕێژییە پتر بەرجەستە دەبێ تێکڕا بۆچوونی هەندێ لەکارناسان لەسەر ئەوە چەسپاوە کەخەڵکی ئێران لەرووی شارستانییەوە زۆرتری لەگەل ئاسیای ناوەندی و لەرووی رەگەزی و تایبەتمەندییەکانی دیکەوە لەگەڵ خەڵکانی میدیترانەیی پەیوەندی هەبوە.

دیارە کە لەتوێژینەوەی مێژووی نەتەوەو میللەتە پێشوەکاندا دەبێ لەوە ئاگادارین کە پێکدادانی سەربازی و ناکۆکی نێوان ئەم میللەت و خێڵانە وەك چۆن زیان و وێرانکاری و لەناوچوونی مرۆڤ بەدوای خۆیدا دێنێ، لەهەمان کاتدا ئاڵوگۆڕی فەرهەنگیش وەگەڕ دەخا یا بەگوزارشتێکی دیکە دیاردەکانی فەرهەنگ لەلایەکەوە بۆلایەکی دیکە دەگوێزرێتەوە. گەلێ

نموونەی لەوبابەتە دەتوانرێ لەشوێنەوارو بەڵگەنامەکانی میزۆپۆتامیادا بەدەست بهێنرێ و بخرێتە بەرتیشکی توێژینەوە.

ئەو جەنگانەی لەچاخەکانی پێشوودا لەنێوان دەوڵەتانی میزۆپۆتامیادا روویداوە، تەنانەت بیروباوەڕی لەشوێنێکەوە لەم ناوچەدا بۆ شوێنێکی دیکە، بۆ نموونە لەباشوورەوە بۆ باکووری میزۆپۆتامیا گواستۆتەوە. لەمەڕ کاری هونەری و فەرهەنگی خەڵکانی ناوخۆی بان ئێران، پێش هاتنی ئارییەکان و چەسپاندنی سیستمی کۆمەڵایەتی و دەرخستنی فەرهەنگی تایبەتی خۆی لای مێژوو، دەتوانرێ جارێکی دیکە سەرنج لەم خاڵە بدرێ کە پێکهاتەی نەتەوایەتی بەرچاوی بەخۆیەوە نەدیوە. لەناوچەی نێوان دەریاچەی ورمێ تا ناوچەی سەرووی روبای دیالە گۆتییەکانی تیادا ژیاون کە بەناوچەی خۆرهەڵات زیاتر پەیوەست بوون.

ئەمجا لۆلۆییەکانیش زۆرتری بەرەو خۆرئاوا بڵاوەیان کردووە. کاسی یەکان لەدەڤەرەکانی باشوورو باشووری خۆرئاوا لە سنووری لاسەرووی رووباری دیالەو رووباری کەرخە جێنیشتەبوون. لەکەنارەکانی دەریای خەزەر میللەتانی کاسپی هەبوون کە بەکاسپییان ناسرابوون و ناوی ئەم دەریا(دەریای کاسپین) لەناوی ئەوانەوە وەرگیراوە. کاسپییەکان لەمێژووی ئێراندا رۆڵێکی گرنگیان هەبوەو لەباسی جوگرافیای مێژوویی ئێراندا ناوی کاسپیان لەتەك عیلامییان و دانیشتوانی ئۆراڵدا بەرچاو دەکەوێ وەك عیلام و کاسپی کە لەرووی جوگرافییەوە زیاتر پشتگیری لێدەکرێ هەتا عیلامییەکان کەزۆرتری سەرنجی توێژەران بۆ باشووری خۆرئاوای بان ئێران رادەکێشن.

# بەشی دە

## زمانی ئارییەکان و نووسینی ئێرانییەکان بەدرێژای مێژوو

لەپێشدا لەمەڕ پەیوەندی نەبچڕاوی زمان و ڕەگەز ئاخاوتنمان کرد، بەو واتایەی کەخەڵکانی سەرانسەری جیهان کە لەیەک ڕەگەزی هاوبەش بن زمانەکانیشیان دووبارە لەیەک خانەوادەن. ئارییەکان لەهەر سووچێکی ئەم جیهانەدا جێنیشتە بووبێتن خاوەنی زمانێکن لەیەک ڕەگ و ریشەی هاوبەش کە بەلێدوانی جۆراجۆر بەڵام لەبنەڕەتدا یەک، بەشێوەی هیندۆ ئەورووپایی، هیندۆ ئاریایی، هیندۆ ئەڵمانی بەدی دەکرێن. زۆر لەمێژوونووسان دەزانن کە ئارییەکان لەسەرەتاوە تائێستا دەستەڵاتی خۆیان یا مێژووی ئێرانیان بەگرنگ تەماشاکردوەو چەمکی ڕەگەزو زمانیان هەردەم پاراستووە بەدرێژای مێژووی ئێران زمانی ئێرانییەکان ڕێ وجێی خۆی بەهیچ زمانێکی دیکە نەداوە، وەلێ خانەخوێیەتی کردوەو ئاشنابوە بەزۆر وشە لە زمانەکانی بێگانە. بەڵام دەربارەی نووسین، بەدرێژای مێژووی ئێران کار بەپێچەوانەوەیە، واتە ئێرانییەکان بەدرێژای مێژوو هەرگیز داهێنەری نووسینێ نەبوون کەبتوانرێ بەنووسینی ئاریایی یا ئێرانی ناوببرێ. هەخامەنشییەکان نووسینی بزماری ناسراو بەنووسینی فارسی دێرینیان لەنووسینە بزمارییەکانی عیلامی، بابلی و ئەکادی(سۆمەری) وەرگرتووە. دوای رمانی دەوڵەتی هەخامەنشی نووسین بەشێوەی یۆنانی وەک دەوڵەت و ڕەسمی لەئێراندا باوبووە، وەلێ زمانی یۆنانی نەیتوانیوە لەنێوان کۆمەڵانی خەڵکی ئێراندا جێی خۆی بکاتەوەو لەجێگای زمانی فارسی بەکاربهێنرێ. ئەشکانییەکان بۆ ڕزگاربوون لەژێر باری فەرهەنگی هیلنی و هەروەها

نووسینی یۆنانی و دیاردەکانی دیکەی ئەم فەرهەنگە بەهرەیان لەئەلفبای ئارامی، سوریانی وەرگرتووەو نووسینی پەهلەوی ئەشکانی کە پەهلەوی باکووری، پارتی پەهلەویگیشیان پیٚوتوە، بۆ خۆیان داهیٚناوە. ساسانییەکان هەمان نووسینیان بەمیرات وەرگرتوەو ئەویان بەشیٚوەیەکی جوان و وەلامدەرەوەی پیٚداویستەکانی نووسینی نیوخۆیان خستۆتەگەڕ کە بەنووسینی پەهلەوی ساسانی یا پەهلەوی باشووری یا پارسیگ ناسراوە

دوای رمانی دەوڵەتی ساسانی نووسینی عەرەبی کە پەیوەندی بەمیللەتانی سامی و ئارامییەوەیە جیٚی نووسینی پەهلەوی گرتەوە. کەوابوو ئەم ئەنجامە بەدەست دیٚ کەئیٚرانییەکان، هەموو نووسینەکانی خۆیان بەدریٚژایی میٚژوو لەمیللەتانی سامی و ئارامی رەگەز وەرگرتووە. زمانی هیندۆ ئەوروپایی لەسەرەتاوە، دوای جیٚگیربوونی میللەتانی ئاریایی لەبان ئیٚراندا، لەلایەن مادو پارس و میللەتە بچووك و گەورەکانی دیکەوە بەکارهیٚنراوەو بەرەچاوکردنی بارودۆخی جۆراوجۆری جوگرافی و هەل ومەرجی زۆرجیاوازی هەریٚمیی بان ئیٚران ئەم زمانە لەقاڵبی چەند دیالیٚکتی جیاوازدا لەلایەن میللەتانی ئاریایی رەگەزەوە بەکار دەهیٚنرا. لەسەرەتاوە تا ناوەڕاستی یەکەمین هەزارەی پیٚش زایین، لەبەشیٚکی زۆری ئیٚراندا، زمانە ئیٚرانییەکان، بەهۆی زۆربوونی ژمارەی خەڵکانی ئاریایی رەگەزەوە کە زۆر لەمیللەتانی ناوخۆیی(ئەسڵی) وەك زووتر ناوی خۆیان و فەرهەنگەکەیانمان برد، لەژیٚر گوشاری ئارییەکاندا وازیان لەخانەو کاشانەی خۆیان هیٚنابوو، لەلایەن میللەتانی ئیٚرانەوە ئەو زمانانە لەپیٚشتر بوونیٚکی بەرچاویان بەخۆیانەوە دی. وەدەستهیٚنانی ئەم لەپیٚشتربوو نەلەلایەن میللەتانی ئیٚرانە(ئاریاییە)وە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوە بۆسەر فەرهەنگی دانیشتوانی ئەم مەرزوبوومەو دەستی بالای هەبوە.

ئاخافتن بەزمانی ئاریایی- ئێرانی بەخێرایی فەرهەنگ و هونەرو شارستانی خەڵکی خستەژێر رکێف و رۆشنایی خۆیەوە. دیاکۆنف لەوباوەڕەدایە کەهەمان بوون بەئاریایی و جەخت لەسەر ریشەی رەگەزیی زۆری لەمێژوونووسان ناچارکردووە کە مێژووی میللەتانی ئێرانی(ئاریایی) بەم جۆرە بۆچوونە بنووسن. ئەگەر بەیەکێ لەم کۆمەڵانی خەڵکە کەدەچنەوە سەر ئارییەکان دەست پێبکەین بابەتەکە ئاشکراتر دەبێ و ئێمە لەکاریگەریی چەمکی نەژادو زمانی ئاریایی نزیکتر دەکاتەوە. یەکەمین دەوڵەت کەبەشێوەیەکی رەسمی و بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان لەقاڵبی حکوومەتێکی مێژووییدا، لەسەرچاوەو باسە مێژووییەکانی یۆنانی و ئاشووری و هی دیکەش بەدڵنیاییەوە ناوبراوە دەوڵەتی مادە.

مادەکان کەباسی ئەوان بەدرێژی دەکەین وەك هیرۆدۆت باسیان دەکا پێش یەکگرتن و دامەزراندنی دەوڵەت لە چەند تیرەیەکی زۆر دروست بووبوون کەبەشێوەیەکی پەرت و بڵاو دەژیان ئەم تیرانە بریتیبوون لە بووسیان(بووزەکان)، بوودییەکان، ستروخاتیان، موغان، پارتاکنیان، ئاریزانتیان کە لەدوای یەکگرتن رابەرێکیان بۆخۆیان هەڵبژاردووەو دەوڵەتێکیان دروست کردووە. لەنێوان ئەم تیرانەدا تیرەی ئاریزانتیان لەدیدی زمانناسییەوە زۆر سەرنج رادەکێشێ و ئێمە لەپەیبردن بەنەخشەی ئارییەکان لەفەرهەنگی سەرەتایی و مێژوویی خەڵکی ئێران نزیکتر دەکاتەوە. تیرەی ئاریزانتییەکان یەکێکن لەگرنگترین تیرە لەناو ماددا کە لەنەخشەسازیدا دەستیان هەبوە. وشەی(ئاریزانت) لەدووبەشی ئاریاو (زنتو) پێکهاتوە. بەشی یەکەم بەواتای ئاریایی و بەچەمکی(رەسەن)و(ئازاد)و(وەجاخزادە) (خانەدان) هاتووەو بەشی دوەم واتە(زنتو) بەواتای قەبیلە، توخم، بنەماڵەو خانەوادەیە.

تێکرا وشەی ئاریزانت بەواتای(لەهۆزی ئارياییە). توخمی زمانی ئارییەکان بەهۆی ئەم بەڵگەوەیە کە بەرتری خۆی لەبەراورددا لەگەڵ ئەو زمانانەی کەباوبوون لەنێوان میللەتان و تیرەکانی دیکەی دانیشتووی بان ئێران بەدەست هێناوە. دوای ئەو(دوای ئاریزانت) دەتوانرێ هۆزێکی دیکە کە موغانن لەرووی زمانناسییەوە باس بکرێ. وشەی ماگووس(ماغووس) لەیۆنانیدا کەزمانێکە لەبنەماڵەی زمانە ئێرانی‌یەکان لەگەڵ وشەی(موگو) واتە موغ یا پێشەوای ئایینی یەکن و خاوەنی رەگ و ریشەیەکی هاوبەشن. تیرەی موغان کە یۆنانییەکان کاری چاوبەست و جادووگەری دەخەنە پاڵیان دیارە پێشەوای ئایینی و لەریزی کاهینەکاندابوون لەسەرانسەری سنووری مادداو هێدی هێدی لەسەرانسەری ئێراندا پەرەیان سەندووە. موغان رێنمایی و زانستی خۆیان بەزمانی ئێرانی فێری خەڵکی دەکردو راگەیاندنی ئایدۆلۆژی ئەوان بەزمانی ئێرانیبووە. بەوتەی دیاکۆنف لەسەدەی حەوتەمی پێش زایین بەدواوە بەلای زۆرەوە ناوی کەسانی تیرەکانی مادو لەدواییدا شاکانی ماد کە سەرچاوە مێژووییەکان تا ئێستا بەئێمەیان راگەیاندوە بەئاشکرا ریشەیان لەزمانی ئێرانیدا هەیە. لەوانە(هووخشترە)یە سێیەمین شای ماد کەبەواتای فەرمانڕەوای باشە، ئەم ناوە لەلایەن یۆنانییەکانەوە بە کیاکسارس ناوبراوە.

زیاد لەتیرەی ئاریزانتیان تیرەکانی پارتاکنیان و ئستروخانیان دیسان لەرووی زمانەوانییەوە ریشەی ئێرانییان هەیە. بەم شێوەیە دەتوانرێ زمانی مادەکان لەگرووپی زمانە ئێرانییە ئارییەکان بژمێردرێ کە بەبۆچوونی برێ لە رۆژهەڵاتناسان و توێژەرانی زانستی زمانناسی لەسنووری زمان و نووسراوە کۆنەکانی ئێرانیدا، زمانی رەسمی دەوڵەتی مادبووە. ئەم زمانە لەهەمان کاتدا زمانی هاوبەشی هەموو هۆزەکانی مادبووە زمانی

ئێرانییەکان لەسەردەمی هەخامەنشیدا بەزمانی فارسی کۆن ناسراوە کەبێگومان درێژەی هەمان زمانی باوە لەسەردەمی مادەکانداو ئەمە بۆچوونی هەموو کارناسانی مێژووی سەردەمی مادو هەخامەنشییەو هەندێ لەمەش پتر تێپەڕیون و وەك(تیودۆر نولدکە)، ڕۆژهەلاتناسی ئەلمانی لەو بڕوایەدان کەنووسینی بزماری باو لەسەردەمی هەخامەنشییەکاندا میراتییەکە لەسەردەمی مادەکانەوە بەهەخامەنشییەکان گەیشتوە.

ئەو لەوباوەڕەدایە کە ئەگەر هەخامەنشییان ئەوەیان لەمادەکانەوە بۆ نەمابێتەوە خۆیان نەیاندەتوانی لەم ماوە کورتەدا خاوەنی نووسینێکی واپێشکەوتووبن.

# کۆمەڵی دووەم

# مادەکان

## بەشی یەکەم: سەرچاوەکانی مێژووی مادەکان

ناوی مادەکان بەلای زۆرەوە پێش هیرۆدۆت(٤٨٥-٤٢٥پ.ن) لای یۆنانییەکان زانراوە. لای مێژوزانان ئاشکرایە کە هیرودۆت بۆئەوەی خۆی ئاماژەی پێبکات لەئاسەواری نووسەران بەتایبەتی مێژوونووسانی یۆنانی و غەیری یۆنانی، پێش سەردەمی خۆی بەشێوەیەکی فراوان لەدانانی مێژوودا سوودی وەرگرتوە. یەکێ لەم کەسە ناسراوانە(هەکاتە)-Hecato-ی مێژوونووسی سەدەی شەشەمی پێش زایین ە کە لەسەرچاوە مێژووییەکاندا بەئەندازەی هیرۆدۆت ناسراو خۆشەویست نییە، وەلێ ئاسەواری(سنووورداری) ئەو جێگای سوود لێوەرگرتن بووە بۆ مێژوونووسانی دواتری یۆنان کە هیرودت یەکێکە لەوان. وادەردەکەوێ کە هیرودۆت ویستبێتی بەناونەبردنی سەرچاوە پێشووەکان و مێژوونووسانی یۆنانی پێش (سەدەی پێنجەمی پ.ن) پتر نرخ و بایەخ بدا بەنووسینەکانی خۆی لەپێش ئاسەواری یۆنانی لەئاسەوارە نووسراوەکانی میزۆپۆتامیا و لەیاداشت نامەکانی پاشایانی ئەو دەوروبەرە بەتایبەتی لەنێوان بیرەوەرییەکانی داگیرکەرانی ئاشووری لەگەڵ ناوی مادا ئاشنا دەبین. سەلمانسەری سێیەم(شەلمەنصەری سێیەم) پاشای ئاشوور لەسەدەی نۆهەمی پێش زایین لەیادنامەیەکدا کەبەهی ساڵی(٨٣٧)ی پێش زایین زانراوە ئاماژەی بەبیست و حەوت فەرمانڕەوا کردووە کەباجیان داوە بەو کە

لەنێوان ئەوانەدا مادو پارسیشی تێدابووە پاشای ئاشوور لەم یادنامەدا کەجۆرێ لە سەرکەوتننامەی ئەم ئیمپەراتۆرە بەهێزەی ئاشوورە بەباسی ناوە جوگرافییەکانی ئەو سەرزەمینانەی گوێڕایەڵی ئەوبوون تێنەپەڕیوە. ئەم شێوە لەنێوان پاشایان و داگیرکەرانی پێشوودا باوبووە کەژیاننامەو ناوی ئەوشوێنانەی دەستیان بەسەرداگرتووە بنووسن و وەك یادگارێ بیهێڵنەوە کەئەمە خۆی جۆرێکە لەمێژوونووسین.

لێرەدا پێویستە بوترێ کە لەئێرانی دێریندا، دووبارە بەتایبەتی بەهۆی هەندێ لەپاشایانی هەخامەنشییەوە وەك داریووشی یەکەم (٥٢٢-٤٦٨پ.ز) نووسینی رووداوەکان کە جۆرێکە لە مێژوونووسین بەهەمان شێوە باوبووە. سەلمانسەری سێیەم/ پاشای ئاشوور دوو شوێن بەناوی ئامادای و(پارسوماش)ناودەبا کە لەنێوان ئەوبیست و حەوت شوێنانەدا بوون کە فەرمانڕەواکانیان باجیان بەو داوە فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ کردووە. لەپێش سەلمانسەری سێیەمدا دووبارە فەرمانڕەوایانی ئاشوور لە سەرانسەری لای خۆرئاوای ئێراندا دەستیان رۆیشتووەو ئەوەیان لە ئاسەواری نووسراوی خۆیان و یاداشت نامەکانیاندا بەدرێژی باس کردووە هەروەها سەرانسەری(میزۆپۆتامیا)ش لەهێرشی پاشایانی ئاشوور بێبەش نەبوون.

لەناو لێکۆڵینەوەی سیاسەتی پەل‌وپۆهاویشتنی ئاشوورییەکاندا ئەم جۆرە بەیان و راگەیاندنە لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئاشوورییەوە چەندجار باس کراوە. سارگونی یەکەم کەنازناوی سارگونی گەورەی پێدراوە لەهەزارەی سێیەمی پ.ز(٢٥٨٤-٢٥٣٠پ.ز)دا بەوجۆرەی کە لەپاشماوەی ئاشوورییەکاندا دراوەتە پاڵ ئەو وتوویەتی: ((من نیازم هەیە کەسەرانسەری میزۆپۆتامیا بخەمە ژێر دەستەڵاتی خۆم و لەباکوورەوە بۆ

باشوور هەمووی بگرم‌و شمشێری خوێنینم لەئاوی کەنداوی فارسدا بشۆم)).

سارگۆنی گەورە لە بەدواداچوونی ئەم سیاسەتە بەتایبەتی لەسەرزەمینی دەوڵەمەندو پێشکەوتووی سۆمەردا، چاوی تێبڕیوەو بەدوژمنایەتی ئەو بەرامبەر بەسۆمەرییەکان لەئاسەواری سۆمەرییەکاندا ئاماژەکراوە. ئەو خستنە ژێر رکێفی سەرزەویی سۆمەرییەکانی لەڕیزی پێشەوەی بەرنامەی داگیرکردنەکانی خۆیدا باس کردوە.

بەوهۆیەوە کەخودی سارگونی گەورە لەناوچەی ئەکەدەوە راپەڕیوە ئەم ئامانجە ئاشکرا دێتە بەرچاو. سەرچاوەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئاشوور دەبێ بەسەرزەمینی ئەکەد دابنرێ چونکە سارگونی یەکەم وەك مێژوو باسی دەکا، یەکەم جار حکوومەتی خۆی لەسەرزەمینی(ئاکادە Accad, Akkad)دامەزراندوە. ناوی یەکەمجارو کۆنی ئەکەد ئاگادە Agadaبووە- وەسەرزەمینی ئەکەدو سۆمەر بەپاڵ یەکەوە بوون‌و هەمیشە لەمێژوودا پێکەوە باسیان دەکرێ. لەدواییدا حکوومەتی ئاکادییەکان بۆ باکووری نێوان دووروبار(میزۆپۆتامیا) پەلی کوتاو دەوڵەتی ئاشووری هێنایە کایەوەو لەم روەوە توێژەرانی سەردەم دامەزراندنی دەوڵەتی ئاشوورییان لەمێژووی ئەکەددا گونجاندووەو هەزارەی سێیەمی پێش زایین بەبنچینەی دامەزراندنی ئەو دەزانن‌و بەهەمان بەڵگە سێ‌خولی مێژووی ئاشوور لەلایەن هەندێ لەتوێژەرانەوە بەدروستی هەڵنەهێنجراوەو ئەم بابەتە لێرەدا شوێنی باسی ئێمە نییە.

# بەشی دووەم

# سەرزەمینی ماد

سەرزەمینی ماد کە لەبەردە نووسراوەکانی سەردەمی هەخامەنشی لەژێر ناوی ماداو لەئاسەواری مێژوونووسانی یۆنانیدا(مذیا) هاتووە، لەبەردەنوسی سەلمانسەری سێیەمدا کەهی سالی ٨٣٥(پ.ز)ە بە(ئامادای) باسکراوە. دوای ئەوکاتە لەئاسەواری ئاشوورییەکان و نووسراوەکانی دواییدا کەپەیوەندی بە میزۆپۆتامیاوە هەیە بە(ماتای)و(مادای) ناوی هاتوە. رەنگە لەگوزارشتە فراوانترەکان و سەرچاوەی دیکەدا بە(ئۆمان ماندا) کە بۆ تێکڕای سەرزەوییەکانی باکووری خۆرئاوای ئێران بەکار دەهێنرا ناوبرابێ. (ئۆمان ماندا)یان بەشوێنی وتوەکە لەسەدەی هەشتەمی پێش زاییندا کەسایەتییەك بەناوی دیوکس هۆزە ئێرانییەکانی یەکخستوەو دەوڵەتێکی بەهۆی ئەم رێکخستنەوە دروست کردووە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی تاچ ئەندازەیەك و تاکوێ ئاشوورییەکان بەهۆی هێرشە سەربازییەکانی خۆیانەوە بۆ سەرزەمینی مادو بەرەو خۆرهەڵاتی میزۆپۆتامیا پێشڕەوییان کردووە؟ جێگای جیاوازی بۆچوونی مێژوونووسانە.

لەئەنجامی هێرشەکانی(سکیت)دا لەسالی ٦٢٦ی پ.ز مادەکان لەئاشوورییەکان کەمتر زیانیان لێنەکەوتووە. لەسالی (٦١٢پ.ز)دا مادەکان بەفەرمانڕەوایی کیاکسار یارمەتی بابلیەکان دەدەن کە لەژێر دەستەڵاتی حکوومەتی نیوپولاسارد دابوون بۆ وێرانکردنی نەینەوا. بەم شێوەیە ئیمپەرلتۆرییەتی ئاشوورییەکان بەتەواوی لەناودەچێ. بەهۆی ناتەواوی و

کەموکورتی هەواڵە جەنگییەکانی ئاشوورییان باسی ریزبەندی پاشایانی ماد بەتەواوی لەتوانادا نییەو ئەوەی ئەمڕۆ باسی دەکەن جێگای دڵنیایی نییە. بەگوێرەی بنەمای نەخشەی هیرۆدۆت ئەوان بریتین لە دیوکس، فرائورتس، کەیاکسارس، ئاستیاگس. ئەوەی بەتەواوی جیاوازە لەنەخشەی هیرۆدوت نەخشەی (کنسیاس)ە کە(دیودورسیسیلی)ش پەیڕەوی ئەوی کردووەو لەشوێنێکی دیکەدا باسی ئەم جیاوازییەیان دەکەین.

ئیمپەراتۆرییەتی ماد لەساڵی(٥٥٣پ.ز) بەهۆی هێرشی (کوروش)ەوە دەڕووخێ و بەتەواوی لەناودەچێ. دروستکردن و هەندێ جار چاککردنەوەی دیواری ماد کەبەهۆی نەبووکەدنەسرەوە (بخت النصر) دەست پێدەکا لەسەردەمی حکوومەنی جیهانی هەخامەنشیدا لەگەڵ مەترسی مادەکانیشدا تەواوبوو. پارسەکان وێرای ئەوەو یەکسەر بەدوای ئەم سەرکەوتنەدا لەساڵی(٥٤٦پ.ز)دا شاری سارد پایتەختی لیدی و لەساڵی ٥٣٩پ.ز بابل داگیردەکەن. دەوڵەتی ماد وەك دەوڵەتی پارتەکان کە لەوەودوا لەسەرهەمان سەرزەمین دروست بووە یەك دەوڵەتی فدراتیڤ و فئوودال(دەرەبەگایەتی) بووەو بەتەواوی لەگەڵ دەوڵەتی داریوش دا جیاوازبووە کە حکوومەتێکی چەسپاوو دەمەزراوبووە بەپێی پلان و بڕیاردانی ناوەندی لەلایەن پاشایەکەوە بووە. دەوڵەتی ماد خاوەنی چەند پاشایەکی بچکولە بووە پێدەچێ کەسەرچاوە عەرەبییەکان چۆن(پاشایانی خێڵەکانیان) بۆ ئەشکانییەکان بەکارهێناوە، بۆ مادەکانیش ئەوە دەست بدا. دەربارەی بنەمای حکوومەت و دامەزراندنی دەوڵەتی مادو رێکخراوە پەیوەندیدارەکان بەو دەوڵەتەوە شارەزاییەکی ورد لەدەستدا نییە. چونکە بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتی پێویست و تەواو لەلای توێژەران دەست ناکەوێ و ئەمەش

زۆری بەهۆی نەبوونی بەڵگەنامەو نیشانەکانی دێرین ناسی پەیوەندیدار بەم سەردەمەوەیە.

سەنتەرەکانی حکوومەتی مادەکان وەك(ئەکباتان)و(ڕگا)یا(رەی) لەنزیکی تاران کەتا ئێستا ئاسەواریٚ لەوسەردەمە بەدەست نەهاتووە هەڵنەکەنراون. مادەکان کە هۆزەکانی ئەوان وەك هیرۆدۆت لە کتێبی یەکەمی خۆیدا باسیان دەکاو هۆزی موغان یەکێك بووە لەوهۆزانە، شکۆمەندیو تایبەتمەندییان لەپارسییەکان زیاتر هەبووە کە لەباشوورو باشووری خۆرهەلاتی سەرزەمینی ماددا دەژیان.

پارسەکان لەهەموو نەتەوەو هۆزیٚ لەمادەکانەوە نزیکترن و بێگومان لەرەگەزێکی هاوبەشن. ئەگەرچی لەمەودوا مادەکان لەدوای سەرکەوتنی پارسەکان بەسەریاندا لەحکوومەتی پارسەکاندا(هەخامەنشیان) لەرووی تایبەتمەندییە رامیاریو کۆمەلایەتیو داراییەوە وەك پارسەکان سوودمەند نەبوون، بەلام لەدەولەتی هەخامەنشیاندا گرنگترین فەرمانبەرانی دەولەتیو خاوەنی پۆستو پایە لەنێوان مادەکاندا هەلبژێردرابوون. مادەکان لەنێو هێزەکانی پاراستنی گیانی دەربارەییانی هەخامەنشیدا بوونو هەروەها هەندیٚ لەئەندامانی سوپای دە هەزار کەسی نەمریان دامەزراندبوو.

سگۆتییان، سوبارییەکان، حوورییان، میتانییەکان،ماننەکان، ئۆراتووئییەکان دانیشتوانی پێش هاتنی ئارییەکانو دیارە پێش مادەکانیش لەبان ئێراندا بەتایبەتی لەلای خۆرئاواو باکووری خۆرئاوای ئەم بانەدا هەبوون. وەك هیرۆدۆت باسی دەکا مادەکان یەکەمین خەڵکانیٚ نەبوون کە لەئێراندا جێنیشەبووبێتن. هیرۆدۆت باسی دەکا کە ئەکباتانو سەرزەمینەکانی دیکەی مادەکان دە پارێزگایان دەگرتەخۆ.

دانیشتوانی ئەو شوێنانە پابەندبوون بەوەی کەساڵانە چوارسەدو پەنجا تالانی زیو بدەن (تالان: taleat کێشی‌بووە کە لەیۆنانی کۆندا نزیکەی ٢٦ کیلۆگرام بووەو تالانی زیو نزیکەی ٥٦٠٠ فرانك بوە/ وەرگێڕ).

جلی ئونیفورم(یەکجۆر)و شێوەی چەکدارییان بەجیاو بەوردی لەنەخشەکانی تەختی جەمشیددا وێنە کێشراوە. زمانی مادەکان لەزمانی گشتی ئێرانییەوە نزیکترە تا زمانی پارسەکان. لەمەڕ زمانی مادەکان و ئەگەری بوونی نووسین لەنێوانیاندا، راوبۆچوونی کارناسانی مێژووی ماد وەك(تیئودور نولدکە)و(جیمز دارمستتر) لەشوێنی خۆیدا باس دەکەین و ئەم بەڵگە کە ئیمپەراتۆری ماد توانیویەتی بەدەسەنەلاتترین دەوڵەتی رووی زەوی، واتە دەوڵەتی ئاشوور لەکۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا لەناوبەرێ، ئایا توانای نووسینی هەبوەو خاوەنی زمانێکی رەسمی‌بووە یا نەء؟ کاتێ سەرچاوە مێژووییەکان لەبەشەکانی شارستانی‌وفەرهەنگی مادەکان بەڵگەو شارەزابوون لێیان دەخاتە بەردەمی توێژەرانەوە، دیارە باوەڕی ئەم توێژەرانە لەبارەی ئەوەوە کە مادەکان توانای نووسینیان نەبووەو خاوەنی نووسین نەبوون بەتەواوی لاواز دەکا. هیرودۆت لەمەڕ فەرهەنگی مادەکان و چۆنیەتی وردەکاری ئەوان لەبەڕێوەبردنی کاروباری وڵات و باری کۆمەڵایەتی و تەنانەت جۆری جلوبەرگ و پۆشاکی مادەکان، بەتایبەتی کەرەسەی بەرگری و چەکی جەنگییان، بەجۆرێکی هەمەلایەنی ئەم کارە بەتوێژەران دەناسێنێ، کە بێگومان دەبێ بەشێکی بەرچاو لەشارستانی پارسەکان لەمادەکان وەرگیرابێ یا بەمیرات بۆیان مابێتەوە. بەو جۆرە کە هەنووکە ئاماژەی بۆکرا زمانی مادەکان لەبەراورد دا لەگەڵ زمانی ئێرانییەکانی سەردەمی هەخامەنشی لەزمانی میللەتانی ئێرانی رەگەزەوە نزیکترە.

بەوردبوونەوە لەلایەنەكانی ژێـر دەسـتەڵاتی حكوومـەت و جێگـیربوونی مادەكان ناوی ناوچەو دەڤەرەكانی ماد بەپێچەوانەی ناوی دەڤەرەكانی ژێـر دەستەڵاتی حكوومەتی پارسەكان، وردترو ئاسانتر دەتوانرێ دەستنیشان بكرێن، بەتایبـەتی دەتوانـرێ جـەخت لەسـەر ئـەم بۆچوونـە لـەگوندەكان و ناوچە بچووك و گەورەكانی كرماشان، هەمەدان و ئەسفەهان بكرێ.

هەموو ناوچەی كوردستان بەباكووری لورسـتان و ئازربایجـان و تـاران و ئەسفەهانیشەوە مادبووە. شارێی(شەقامەرێی) ناسراو لە دەروازەی ئاسیا كە لەبابلەوە بۆ ئـەكباتان(عـێراق بـۆ هـەموان) دوو ناوچـەی مـادی لەیـەك جوداكردۆتـەوەو دیـاری كـردوون واتـە مـادی بـاكوورو مـادی باشـوور كەباشتروایە بوترێ مادی سەروو و مادی خواروو.

سەرچاوە جوگرافییەكانی یۆنانی و رۆمـی دێریـن و تەنانەت سەرچاوەی سـوریانیش، ناوچـەی سـەرپێڵیان بەجوداكـەرەوەی دووبەشـی سـەروو وخوارووی ماد زانیوە.

دەڤـەری مـاد كـە لەلێكۆڵینـەوەی سـنووری حكوومـەتی پارتیـان و ساسانییان لەلایـەن مێژوونووسـان و جوگرافیـا زانانـەوە نـاوبراوە، لەسـەر بنەمای باسكردنی جۆراوجـۆرو بەیوشـێوەی كـە لەسـەردەمی ئیسلامیدا باسكراوە، لەئەستۆیدابووە كە بەدانیشتوانی بەسرەو كووفە پـارەی زەوی و پـارەی سـەرانە بـدا. لـەم دواییانـەدا بـۆ سـەرزەمینی مـاد نـاوی ئالجیبـال بـەكارهێنراو ئەمـە بـەهۆی بـاری جوگرافـی و هەل ومـەرجی ناوچـەیی ئـەم سەرزەمینەوەبوە كە كوێسـتانە. هـەروەها نـاوی(عـێراقی عەجـەم) لەلایـەن مێژوونووسـانەوە بـەكارهێنراوە. ناولێنـان و باسـی نـاوی دەریاچـەكان و شوێنەكانی دیكـەی پـەیوەندیدار بەسـەرزەمینی مـادەوە بـەپێی سـەرچاوە ئایینیـەكانی ئـێرانی كـۆن، لەهـەموو چاخـە جیاوازەكـاندا، لەگـەڵ چـەند

جیاوازییەك لەبووچوونەکاندا، شایستەی باس و توێژینەوەن. نموونەی بەرجەستەی ئەم رایە دەتوانرێ لەباسی دەریاچەی (ورمێ) لە ئازربایجان بەدەست بهێنرێ. ئەم دەریاچە لەسەرچاوەکانی ئێرانی کۆندا بەدەریاچەی(چچست) ناوبراوەو دوای ئەوە بەدەریاچەی ئورومیەو رەزائیە ناوی گۆڕدرا. بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان گۆڕانی ناوی دەریاچەی ئورمیە لە چچستەوە بۆ دەریاچەی ئورومیە لەسەردەمی ئەشکانییەکاندا بووە. بڕێ لەو ناوانەی لەلایەن هەخامەنشییەکانەوە بەکارهێنراوە پێشینەیەکی مادی هەیە کە یەکێ لەوانە ناوی(کۆرش)ە بەواتای کرێکار وکارگەرو تەنانەت کرێگرتە (بەکرێ گیراو) کە لەدواییدا دەگمەن و رەنگە لەئەنجامی وەرگێڕان و بۆچوونی هەڵەی هەندێ لەمێژوونووسانەوە وەك دیاکۆنف گۆڕدرابێ.

موغان کە لەزمانی فارسی دێریندا بەشێوەی تەنها(مەگووش)و لەزمانی یۆنانیدا(ماگووس)یا(ماغووس) هاتووە لەگەڵ فەرهەنگی کۆنی ئێراندا پەیوەندیی دێرینی هەیە. هیرۆدۆت موغان بەناوی یەکێ لەچەند هۆزێ دەناسێنێ. لەشوێنێکی دیکەدا بەپێناساندنی هۆزەکانی مادو نەخشەی ئەوان لە نەخشەدانان بۆ حکوومەتی مادەکان و مانەوەی ئەو دەوڵەتەو تەنانەت رمانیشی هەڵدەسین. وەك هیرۆدۆت باسی دەکا تیرەی موغان چینی رۆحانییان لە حکوومەتەکانی ئێراندا(مادەکان و پارسەکان) پێکهێناوەو. داب ونەریتێکیان پەیرەو کردووە کە لەوەودوا بەشێوەی پلەو رێبازی ئایینی لەرێ و رەسمی ئێرانییەکاندا باو بووەو کاری پێکراوە.

لەوانە شێوەی ناشتن و شاردنەوەی مردووان بەرێبازی پاکژکردن و شێوەکانی شتن، لەناوبردنی گیاندارانی زیانبەخش، پەرستن و رێزلێگرتنی سەگ، فامیل(خێزان) پێکەوەنان. هەرچەندە دژی موغان بزاوت و هزری

ئایینی و بیروبۆچوونی خێڵەکی لە خۆرهەڵاتی ئێرانداو دەستەڵاتی رامیاری لەباشووری خۆرئاوای ئێراندا لەئارادا بووە، کەچی موغان زۆر بەپەلە خۆیان تێکەڵی کاروباری سیاسی و ئایینی کردووەو بەشێوەیەکی خێرای گەشەسەندوو بوون بەخاوەنی دەستەڵاتی رامیاری. ئەمەش لەسەردەمی مادەکان و دوای ئەوان لەسەردەمی حکوومەتی ساسانییەکاندا بەئاشکرا دیارو بەرچاوبوو. بەرزبوونەوەی پلەی موغان لەدەوڵەتی ساسانیدا لە(٢٢٤-٦٥٢ز) بەشێوەیەك جێی سەرنج بووە کەبەلای زۆرەوە هەموو پایە حکومەتییەکان لەژێر چاودێری ئەم رۆحانییانە دابووە. موغان(ئایینی یەکان)ی سەردەمی ساسانییەکان ئەوەندە بەهێزبوون کەتاجیان دەنایەسەر شاو یابەدەرکەوتنی تاوانێکیەوە تاجیان لەسەری دادەگرت و دەستەڵاتیان لێدەسەندەوەو بە زۆرەملی پەلکێشیان دەکرد بۆ زیندان.

ئەم رۆحانییانە لەسەردەمی ساسانییەکاندا دژی هەمووڕێبازێکی تازەی کەسانی وەك(مانی)و(مەزدەك) راوەستان دەستەڵاتی ئەوان تەنها لەبواری کاروباری ئایینیدا نەبووەو بەس، بەڵکو دژایەتی مەسیحییەت و خەبات بۆ وەرگرتنی دەستەڵات و دەستێوەردانی کاروباری سیاسەتی ناوخۆو بگرە سیاسەتی دەرەوەو کاروباری ئابووری و دادوەری و سەربازی لەسنووری دەستەڵاتەکانی ئەواندا بوو. لەگەڵ ئەم درێژەپێدانەشدا سەرچاوەی دروستبوون و رێ وجێ و کاروباری راستەقینەی موغەکان لەرابردوویەکی دووردا ناتوانرێ دیاری بکرێ و بناسرێ. لەڕووی زمانەوانییەوە لە دەربڕین و راڤەی یۆنانییەکاندا موغ بەواتای جادووگەرو چاوبەستکارە لەسەرچاوەکانی ئێرانی سەردەمی هەخامەنشیدا(مەگووش) هەڵدەگرێ بەواتای گرووپ و باند بووبێ. موغان بەشێوەی چەند روویەکی خەباتگێڕ،

بەڕێوەبەرانی ڕێورەسمی ئاییني و قوربانی، پەیوەندیدارانی سەرسەخت بە(دوو خواییەوە) (ثةنەوییەتەوە)ناسراون.

ثةنەوییەت: ئەوانەن کە بڕوایان بەدوو پرنسیپ هەیە وەك بڕوا بەدووخوا یا بەپرنسیپی چاکەو پرنسیپی بەدکاری- وەرگێڕ وادیارە موغان هەڵگرانی هزری ئاییني و داب و ڕێبازی خۆرئاوای ئێرانن و بەهەمان بەڵگە هەندێ لەتوێژەران بێئەوەی هیچ بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنت و بنەمای توێژینەوەیەکی ڕاست و دروستیان بەدەستەوەبێ، بێهوودە هەوڵ دەدەن موغان بەگرووپێ دابنێن کە لەمیزۆپۆتامیاوە هاتبێتن و ڕەگ و ڕیشەیان لەئەندێشەی کاهینانی پەرستگاکانی ئەو دەوروبەرەبێ دەبێ بگوترێ کەلەم ڕووەوە سەرچاوەکانی مێژووی یۆنانیش پشتیان پێنابەسترێ. هەروەك چۆن هیرۆدۆت لەم بارەوە باس و لێدوانی دژبەیەك و نەگونجاو دەخاتە بەردەستمان. هیرۆدۆت وەك باسمان کرد هەندێجار موغان بەفێرکارو زۆرتر بەشاگردانی (قوتابیانی) پێشەوایانی ئلیینی ئێرانی سەردەمە کۆنەکان دەزانێ و هەندێ جاری دیکە ئەوان لە کاهینانی پەرستگاکانی بابل جیاناکاتەوەو کاری موغان و بەوشێوەی کەوترا هیرۆدوت هەم وەك ئەوانی دیکەی یۆنانی دەربارەی هەڵسەنگاندنی ڕێوجێ و پلەوپایەو کارو کردەوەی موغان ئەوانی وەك کلدانییان(کاهینانی پەرستگاکانی بابلی) بەناوی-ئەستێرەناسان، لێکدەرەوەی خەون و پێشبینیکارو جادووگەران ناو بردووە.

هەندێ لەتوێژەران ئەم بۆچوونەی هیرۆدۆتیان بەڕاست و دروست وەرنەگرتووەو لەوباوەڕەدان کەئەم کارانە پێشینەی لەناو دەستەی موغاندانییەو موغانەکان لەبنچینەدا بەناوی ڕابەرانی کۆمەڵگاو کەسانی ژیرو ئەندێشەدار کەخەڵکییان بۆ وەرگرتنی ڕەوشتی جوان و ئاییني

خودایـان بـانگ کردبـێ ناسـیوە. ئـەم دەسـتە لـەتوێژەران موغانیـان بەبنیاتگوزاری هزری ئاییینی زانیوە، گەرچی ئەم هزرانە لەسەرەتاوەو تـا سـەردەمێکی درەنـگ لـەدوای دروسـتبوونی ئەنجومـەنی موغـان لەگـەڵ ئەفسـانەگەری و تاڕادەیـەك جادووگـەری تێکـەڵبوون کـە لەلاپـەڕەکانی داهاتوودا لەو روەوە ئاخافتن دەکەین.

# بەشی سێیەم
# پاشایانی ماد

بەلای رۆژهەلاتناسانەوە دیاکۆ(٧٠١-٦٥٥پ.ز) کە لەمێژووی هیرۆدۆتدا ناوی(دیۆکس)ەو لەسەرچاوە مێژووییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەکانی دوایی بە(دیووك) ناوی هاتووە، یەکێبووە کە پەیوەندی بەشەش تیرەکەی حکوومەتێکی رەها دەزانێ کە بەناوی پاشاوە سەرۆکایەتی کردووە. وەك هیرۆدۆت باسی دەکا ئەو بەچاولێکردن لە دەربارەی شاهانی ئاشوور بەرنامەکانی میوانداری و پێشوازیی سەڵتەنەتی بەشێوازی ئیمپەراتۆرانی ئاشوور بەجێهێناوە. بەگوێرەی ئەو باسە بەهۆی دڵسۆزی و دادو لێهاتوویییەوە بۆتە جێگای سەرنجی ئەندامانی تیرەکانی مادو بەپادشای ئەوان هەڵبژێردراوە.

ئەو یەکەمین جار لەساڵی ٧٠٨پ.ز بەناوی رابەرو فەرمانڕەوا لەنێو هۆزەکانی مادا هەڵبژێردراو بەچەند بەهانەیەك لەپاش حەوت ساڵ لەم پۆستە کەنارگری کردو لەدواییدا بەوەرگرتنی دەستەلاتێکی فراوانەوە بەناوی پادشای بێرکابەر لەساڵی ٧٠١ی پێش زایینەدا وەکو سەرۆکی حکوومەتی ماد جێگیربوو. دەربارەی هەنگاوەکانی ئەو بۆ چەسپاندنی فەرمانڕەوایی خۆی و چۆنیەتی دروستکردنی کۆشکی سەڵتەنەتی شکۆدارو قایم لەئەکباتانا (هەمەدانی ئێستا)و بریاردانی یاساو پێشوازی شاهانەی جۆراوجۆر لەشوێنێکی دیکەدا باسی لێوە دەکرێ.

ئەو نزیکەی نیو سەدە جڵەوی سەڵتەنەتی بەدەست بووەو زۆرتری ئەم ماوەیەی بۆ یەکپێگرتنی تیرە پەرت و بڵاوەکانی ماد تەرخانکردووە.

سەرچاوە مێژووییەکانی یۆنان کارو ئەرکەکانی ئەویان زۆر بەسەخت و دژوار باسکردووە، چونکە لەپاش یەکگرتنی ئەم تیرانە لەساڵی(٧٠٨)ی پێش زاییندا زۆری پێنەچوو سەرلەنوێ ئاژاوەو پشێوی لەنێو مادەکاندا پەرەی سەندو دەستدرێژیی و گوێنەدان بەیاسا، دزی و کوشتار باڵی کێشا بەسەر ناوچەکانی ئەم تیرانەدا. هەندێ لەسەرچاوە مێژووییەکان مێژووی چوونە سەر تەختی ئەویان لە سنووری(٧١٥پ.ن)دا لەقەڵەم داوەو لەهیرۆدۆتەوە دەگێڕنەوە کەئەو بەناوی دامەزرێنەری ئیمپەراتۆرییەتی ماد وەك دیلێکی جەنگیی لەلایەن ئاشوورییەکانەوە بۆ سووریا دوورخراوەتەوە. هۆی شکست و دەستگیرکردنی ئەو بە بەرگریکردن لەکیمیریان دەزانن کە لەگەڵ سارگۆنی دووەمدا لەجەنگدا بوون.

سارگۆنی دوەم لە ٧٢٢-٧٠٥ی پێش زایین پاشای ئاشوورییەکان بووەو هەموو تەمەنی فەرمانڕەوایی خۆی واتە ماوەی حەڤدەساڵ لەجەنگی ئەربیل(ئۆربیلۆ) لەگەڵ عیلامی یەکاندابەسەربردووە. کیمریان و مادەکان بەو ئومێدەی کەسوپای ئاشوور ماندووو بێهێز بووەو هەلێکی باش رەخساوە بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵیاندا لەگەڵ سوپای ئاشووردا کەوتنە جەنگەوە سارگۆنی دوەم دیسان ئەوانی تێشکاندو دیائاکۆ بۆشام دوورخرایەوە. ئەو سەردەمەیان لە سنووری(٧٢٠)ی پێش زایین داناوە.

ئەوچەند ساڵێکی وەك دەستگیرکراوێ لەلایەن سارگۆنی دووەمەوە لای ئاشوورییەکان بەسەربردوەو مادەکانیش وەك ژێردەستەو باجگوزاری ئاشوورییەکان دوچاری هەژاریی و سەرلێشێوان بوون. ئاشوورییەکان دیائاکۆیان بەناوی ئەوەوە کە هەمیشە وەك گوێڕایەڵێکی ئاشوورییەکان بمێنێتەوەو باجی خۆی بەرێك و پێکی بگەیەنێتە دەرباری ئاشوورو لەهەموو سەربازی بۆ ئاشوورییەکان لەکاتی تووشبوونی جەنگدا بگرێتە

ئەستۆی خۆی، ئازاد کردو لەدواییدا ئەو بەناوی رابەری مادەکان و رەنگە پادشای مادەکانەوە هەڵبژێردرا. ناوی ئەو لەسەرچاوە ئاشوورییەکاندا هاتوەو شوێنی فەرمانڕەوایی ئەویان بەئەکباتان یاماڵی دیائاکو(خانووی دیائاکۆ) داناوە.

فرورتیش(٦٥٥-٦٣٣پ.ز) دووەم پاشای ماد کە لەمێژووی هیرودۆتدا بە(فرارتس)یا(خشسرتیە) بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان ناوی هاتوەو کوڕی دیائاکۆی دامەزرێنەری دەوڵەتی مادە. ئەو لەسەرەتاوە رێگای باوکی خۆی هەڵبژاردوەو بەبێ بەرنامە لەگەڵ ئاشوورییەکاندا کەوتە جەنگەوە. ئەو هەرچەندە ئاگاداری چارەنووسی ناخۆشی باوکی خۆی بووە کەلەلایەن ئاشوورییەکان کەوتە جەنگەوەو لەساڵی (٦٣٣پ.ز)دا بەدەستی ئاشوور بانیپاڵ کوژراوە. لەسەرەتای ساڵەکانی سەڵتەنەتی ئەودا سکیتەکان کەلقێکی هیندۆ ئەڵمانی بوون ولەناوچەیەك لەنێوان دەریای مازندەران و قەفقازی ئێستادا دەژیان لە رێڕەوی دەربەند قەفقازەوە بۆ سەرزەمینی ماد ملیان ناوەو چەند بەشێکیان لەزەوی و زاری مادەکان داگیرکردوە.

بەسەرنجدان لەساڵنامەو بەڵگەنامەی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتی ئاشوورییەکان، سەرچاوە تازەکان، سەردەمی فەرمانڕەوایی فرورتیشیان لە دەوروبەری نێوان ساڵی ٦٧٥-٦٥٣پ.ز داناوە. بەگوێرەی ئەم بەڵگەنامانەو بەسەرنجدان لەبابەتەکانی سەرچاوە ئاشوورییەکان، لەدوای هاتنی سکیتەکان یاسکایان بۆ سەرزەمینی ماد، ئاسارهادوون کوڕی سەناخریب یا (سەنخەریب)و باوکی ئاشوور بانیپاڵ لەم هەلە سوود وەردەگرێ و بۆ بەرگرتن لە هێزی روو لەزیادەی مادەکان، کچی خۆی دەدا بە(بارتاتوا) ئەمیری سکایان(بەئاشووری) و پرۆتۆتیاس (بەیۆنانی) وەك لەهیرۆدۆتەوە دەگێڕنەوە تا بتوانێ سکیتەکان بکا بەهێزێکی بەتوانا بۆ رووبەڕووبوونەوە

دەگەڵ ئەو مادانەدا کە ڕۆژانە بەهێزتر دەبوون. بەپێی ئەم هەواڵانە مادەکان ماوەی ٢٨ساڵ وەك باجگوزاری سکایان(سکیتەکان) واتە لەساڵی ٦٥٣-٦٢٥پ.ز) لەمێژوودا دانراون و لەم ماوەدا سکایان بەناوی هاوپەیمانانی ئاشوورو فەرمانڕەوایانی ئاسیای بچووك دەست بەکاربوون.

ئەو(فرورتس) هیچ کاتێ سازشی لەگەڵ ئاشوورییەکاندا نەکردووەو لەسەر داوای میللەتی ماد کەئەو فەرمانڕەوایان بوە جەنگی ڕاگەیاند. وادیارە لەسەرەتای جەنگەوە تاڕادەیەك سەرکەوتنی بەسەر ئاشوورییەکاندا بەدەست هێبنابێ، وەلێ لەجەنگێکی دیکەدا دەکوژرێ. دەربارەی ئەو دەڵێن کە بۆ فراوانکردنی سەرزەوی ماد لەلای خۆرهەڵات و باشوورەوە هەوڵیداوە، کە بەشێ لەو سەرزەوییانەی خستوویەتی‌یە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە سەرزەوی پارس بووە کەلکێکی دیکەی میللەتانی ئاری تیا جێنیشتەبوون. بەبۆچوونی هەندێ لەمێژوونووسان، هەرچەندە فرورتریش لەجەنگدا لەگەڵ ئاشوورییەکاندا شکستی هێناو بەوبۆنەوە سەری تێداچوو بەڵام ئەو جەنگە زەمینەی خۆشکرد بۆ جەنگێ کە کوڕەکەی(کیاکسار) درێژەی پێدا تا ڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشوور. هووخشترە (٦٣٣-٥٨٤پ.ز) کە(ئووخشترە)شیان پێدەوت و لەهەموو سەرچاوە یۆنانییەکاندا بە کیاکسارس ناسراوە، کوڕی فرورتیش و وەچەی دیائاکو بووە.

سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەویان بەنزیکی ساڵانی(٦٢٥-٥٨٥پ.ز)نووسیوە. ئەو بە بەدەستەڵاتترین و مەزنترین شای ماد ناسراوە. هیچکام لەپاشاکانی ماد تەگبیرو بیرتیژی ئەویان نەبووەو بۆ پاراستنی سەربەخۆیی مادو تێکشکاندنی ئیمپەراتۆرییە زەبەللاح و خوێنخۆرەکان، وەك ئەو ئامادەنەبوون بۆ خۆبەختکردن. ئەو سوپای مادی بەشێوەی مۆدێرن و پێشکەوتوو سازکردو توانای جەنگی ئەم سوپایەی بەشێوەیەك

پەرەپێدا کەبتوانێ لەگەڵ سوپای بەهێزی ئاشووردا بکەوێتە جەنگەوەو چۆکی پێدا بدا.

هەندێ لەسەرچاوە مێژووییەکان لەو باوەڕەدان کەئەو سوپای مادی بەشێوەی سوپای ئاشوور ئاراستەو ئامادەکردوەو سووربووە لەسەر ئەوەی ئیمپەراتۆرییەتی بەهێزی ئاشوور لەناوبەرێ.

لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەدا بەراستی و شێلگیرانە تۆڵە سەندنەوەی باوك و باپیری خۆی لەدەوڵەتی ئاشوور بەشێوەیەك باس دەکرد کەجێی بڕوا نەبوو. مێژوونووسانیش لەگەڵ ئەودا وەك پاشاکانی دیکەی ماد تەنها بەهۆی سەرچاوە مێژووییە یۆنانییەکانەوە ئاشنابوون. لەمێژووی سەردەمە دێرینەکاندا، کەمتر میللەتێ هەیە کە وەك مێژووی ماد بەهۆی نەبوونی هەواڵ و بەڵگەنامەو دۆکیۆمێنتەوە لەتاریکیدا مابێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە دادوەری لەمەڕ مێژووی مادو کاروکرداری پاشایانی ماد پڕە لە ئاڵۆزیی و ناسازی. هەندێ لەسەرچاوەکان ئامادەکردنی سوپای کیاکسار بەهۆی کاریگەریی سوپای سکایانەوە لەقەڵەم دەدەن.

تەنانەت تێشکانی ڕێکخستنی سوپای ماد لەسەردەمی پێشوودا، واتە لەسەردەمی باوك و باپیریدا کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئاشووردابوون دەخەنە پاڵ ئەو مەسەلەیە. ئەو سوپایەکی نوێی ڕێکخست کە لەجیهانی ئەو سەردەمەدا بە بەهێزترین سوپا دەژمێردرا.

ناتوانرێ ئەو بەپارێزەری یەکگرتن لەگەڵ کیمیریان و پارسەکاندا دابنرێ کە لەسەردەمی فروتشی باوکیدا ئەو یەکگرتنە هەبوە، بەڵکو ئەو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە سەربازییەکانی خۆی هاوپەیمانێکی نوێی دۆزیەوە کە ئەوەش بابلیەکان بوو ڕۆژگاری سەرکەوتنی ئەو بەسەر ئاشوورییەکانداو چۆنیەتی ئەو سەرکەوتنە لەشوێنێکی دیکەدا باس دەکەین. ئەو بەشێوەیەك

دڵنیاو سووربوو لەکارەکەیدا کەچاکیلێکرد بەلادا بۆ گرتنی چەند بەشێکی گرنگ لەئاسیای بچووك، بەتایبەتی سەرزەمینی لیدی(لودیا، لیدیە، لوودی، لیدیا) ئاخاوتن لەو روەوە لەمەودوا دێ. ئەو هەمووەدەڤەرەکانی باکووری نێوان دووروبار(میزۆپۆتامیا)ی لەدوای هەرەس پێهێنانی دەوڵەتی ئاشوور خستە ژێر دەستی خۆیەوە. ئەو دەڤەرەکانی خۆرهەلاتی روباری دیجلە، بەدوای ئەویشدا ئەرمەنستانی لکاند بە ئیمپەراتۆرییەتەکەی خۆیەوە. گرتنی ئەرمەنستان لەکاتێکدا روویدا کە لکەکانی دیکەی میللەتانی ئێرانی سەرزەمینی(ئورارتۆ)یان خستبوە ژێر رکێفی خۆیانەوەو زمانی خۆیان لەوێدا رەواج پێدابوو.

دواپاشای ماد لەلای رۆژهەلاتناسان و کارناسانی مێژووی ئێرانی کۆن، بەتایبەتی مێژووی ماد(ئاستیاگ)ە کە هیرۆدۆت بە(ئاستیاگس) ناوی بردووە. ئەو لەسەرچاوە بابلییەکاندا بە(ئیختۆویگۆ)ناوبراوە. هەندێ ئەو بە زەحاك(ئاژدیهاك)یا کەسایەتییەکی مێژووی ئێران دەزانن. ئەو کوڕی هوخشتەر(کیاکسار) سێیەمین شای مادە. ئەو لەگەڵ(ئارینیس) کچی(ئالباتیس)ی پاشای لیدی بوون بەهاوسەری یەك. ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کە رێکەوتنی نێوان مادولیدی بەدوای یەك جەنگی بێهوودەدا کەبوو بەهۆی خۆرگیران (بەلای ئەوانەوە) بەهێز بکەن. سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو کەلەمەودوا بەوردی لێی دەدوێین لە ٥٨٤-٥٥٤ی پێش زایین بووە هەندێ لەسەرچاوە مێژووییەکان سەڵتەنەتی ئاستیاگ بە ٥٨٥-٥٥٠پ.ز وهەندێکی دیکە بە٥٨٤-٥٥٩پ.ز دەزانن.

لەسەردەمی ئەودابوو کە سەرزەمینی ماد سەربەخۆیی خۆی لەدەست داو ئەوسەرزەمینە دەبێ بەپارێزگایەکی ژێردەستی پارسەکان(ویلایەتی پارسەکان) کەتازە دەستەلاتیان گرتبووە دەست.

# بەشی چوارەم
# پاشاکانی ماد بەگوێرەی باسکردنی هیرۆدۆت

١. دیوکس بەپێی بۆچوونی هیرۆدۆت یەکەمین پاشای مادە کەپاش یەکگرتنی شەش هۆزە گرنگەکەی ماد- کە لەشوێنێکی دیکەدا باسکرا- ماوەی پەنجاوسێ ساڵ بەناوی پادشای مادەوە فەرمانڕەوابووە. هیرۆدۆت ئەوی بەپیاوێکی خاوەن ویژدان، دادپەروەر، ئارام و دروستکار ناوبردووە ئەم رەفتارە جوان و بەرزەی ئەو بەئەندازەیەك جێی سەرنج و پشتگیری ئەندامانی هۆزەکانی مادبووە کە لەنێو خۆیاندا ئەو هۆزانەشیان پێناساند کە لەوەپێش نەیاندەناسی و ئەوانیان هان دەدا بۆ هەڵبژاردنی دیوکس وەك پاشای مادەکان. ئەو لەمەڕ لێکۆڵینەوەی سکاڵای خەڵکیدا هەرگیز فەرمانی ستەمکارانەی دەرنەکردوەو بۆ باڵادەستی یاساو داد، هەوڵێکی زۆری داوە. ئەو رابەری شەش هۆزی مادبووە وێرای ژمارەیەکی زۆری دیکە لەتیرەکانی دی.

ئەو هەموو خەڵکانی مادی گوێڕایەڵی خۆی کردو دەستەڵاتی بێ رکابەرو رەهای هەبوە. ئەو کوڕی(فرا ئورتس)ەو کوڕەکەی ئەویش کەدوەم شای مادو جێنشینی ئەوبووە بەهەمان ناو ناسراوە. لەهەمان کاتدا هەنگاوەکانی دوایی دیوکس کەزۆرتری لە دەستەڵاتی رەهای ئەو دەدوێ، لەپاش هەڵبژاردنی یەکجاری ئەو بەپاشای ماد دەستی پێکردوە. وادێتە بەرچاو کە رابەری مادەکان بەپشتبەستن بەو پلەوپایەی بەدەستی هێنابوو، دەبێ خۆی لەوانی دی جیابکاتەوە. بیرۆکەی ئەم خۆجیاکردنەوەو خۆلە بەرترازانبنە بەسەر خەڵکیدا ئەوی پاڵ پێوە ناوە کە فەرمان دەرکا کۆشکێکی بۆ دروست

بکەن، لەوێدا ژیان بەسەربەرێ و خۆی لەخەڵکی بشارێتەوە.(راڤەی ئەوە لەشوێنێکی دیکەدا هاتووە).

ئەو دوای ئەوەی جڵەوی دەستەڵاتی گرتەدەست، لەگەڵ ئەو هەموو ئازادی و دادپەروەرییەدا کەزووتر نیشانی دابوو نەیتوانیوە کۆمەڵگا وەك پێویست بەئازادی و ئاسایش بگەیەنێ.

ئەو تەنها دەستەڵاتی بەسەر مادەکاندا بەلاوە بەس نەبوو. وەك هیرۆدۆت باسی دەکا دیوکس دەستیکرد بەدامەزراندنی یەك سیستمی چاودێری کردنی خەڵکی کە وادیارە بەیارمەتی موغەکان ئەوەی بەدەست هێناوە. هەرچەندە ئەو ئەم شێوەکارەی دژ بەخەڵکی ماد لەدەربارو نەریتی فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکانەوە فێر بووبوو، بەڵام بوو بەخشتی بینایەك کە لەوەودواش لەسەردەمەکانی دیکەی مێژووی ئێرانی کۆندا پایەدارو بەردەوام بێ. دانانی سیستمی سیخوڕی پادشا لەسەردەمی هەخامەنشییەکاندا، بەتایبەتی لەسەردەمی دەستەڵاتی داریوشی یەکەمدا(٥٢٢-٤٨٦پ.ز) کە لەجێگای چاوو گوێی پادشادابووە، بەکاریگەریی ئەم هەنگاوەی دیوکس بەزلتر لەخەڵکی دەزانی و بەو هۆیەوە نەیدەویست لەهەموو کاتێکداو بۆ هەموو کەسێ خۆی دەربخاو ببینرێ.

ئەم رەفتارە دەبێ بەداهێنان و هەنگاونانی خودی(دیوکس) بزانرێ، چونکە هیرۆدۆت ئەوەی بەوەرگرتن لەشوێنێکی دیکەوە باس نەکردوە.

٢. فەرائۆرتس: کوڕی دیوکس لەدوای مەرگی باوکی کە پەنجاوسێ ساڵ پاشای مادبووە دەستەڵاتی کەوتە دەست. ئەو لەدوای وەرگرتنی دەستەڵات تەنها بەفەرمانڕەوایی مادەکان قایل نەبوو، بۆیە هێرشی کردەسەر پارسەکان. بەو هێرشە سەرکەوتوەی خۆی پارسەکانی وەك یەکەمین میللەتی گوێڕایەڵی ماد لێکرد ئەمە یەکەمین بزاڤی سەربازیی ئەوو یەکەمین

هێرشی ئەوبووە بۆسەر میللەتێکی دیکە. هێنانە ژێر ركێفی پارسەكان بوو بەهۆی بەهێزکردنی پتری مادەکان و ئەو تواناو پڕکێشی یەی دا بەفەرارتس کە(ئاسیا)ش بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. لەوەودوا ئەو یەك بەدوای یەکدا هێرشی دەبرد بۆسەر میللەتانی دیکەو گەلێ میللەتی دیکەی خستە ژێر رکێفی خۆیەوەو کردنی بەدۆستی مادەکان.

هەروەها زەمینەی خۆشکرد بۆ هێرش بردن بۆسەر حکوومەتە بەهێزەکان و سەرزەوییە دەوڵەمەندەکان کەیەکێ لەوانە سەرزەمینی ئاشوورو ئیمپەراتۆرییەتی بەتواناو فراوانی ئەوانە. ئەو هێرشی بردەسەر ئاشوورییەکان و رووی هێرشی کردە شاری نەینەوا کە پایتەختی ئاشوور بووو لەوێ دەژیان و ئەم ئاشوورییانە لەپێشتردا فەرمانڕەوای گەلێ لەمیللەتان بوون، وەلێ لەوکاتەدا کە فرارتس هێرشی برد بۆ سەر ئاشوور ئەوان تەنها کەوتبوون، چونکە هاوپەیمانەکانیان لێ جودا بووبووەوە هیرۆدۆت دەڵێ: هێرشی فرائەرتس بۆسەر ئاشوورییەکان سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ئەو دوەمین پاشای مادبوو، بیستودوو ساڵ دەستەڵاتی بەدەستەوە بوو، بەشێکی زۆری سوپاکە لەم جەنگەدا لەناوچووو هەر بەوجۆرە کە لەسەرچاوەکانی میزۆپۆتامیاوە بەدەست دێ، ئەو بەدەستی ئاشوور بانیپاڵ کە ماوەیەکی کەم لەوەوپێش سەرزەمینی عیلامی گرتبووو پادشای ئەوان(خووم بان کالداش)ی دەستگیرکردبوو کوژرا.

هیرودوت دەربارەی چۆنیەتی مەرگی ئەو هیچ نالێ. کیاکسارس: لەدوای مەرگی فرارتس کیاکسارس بوو بەجێنشینی ئەو کوڕی فرارتس کوڕی دیوکس بوو. وادیارە ئەو زۆر جەنگاوەرتر بووە لەوانەی پێش خۆی. ئەو یەکەم کەس بووە کە خەڵکی لەئاسیادا بەگوێرەی ریزبەندییەکی تایبەت پۆلێن کرد. ئەو بۆ یەکەم جار فەرمانی دا کەهەموو جودا لەیەك بژین و

ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. رم بەدەستان، تیروکەوان داران، سوارەکان زۆرتر لەناو یەکدا تێکەڵبووبوون و لەیەك جیانەدەبوونەوە. ئەو ئەوکەسەبوو کە لەگەڵ لیدییەکاندا کەوتە جەنگەوە.

لەراستیدا لەهەمان جەنگدابوو کە رۆژی تیابوو بەشەو، ئەو سەرانسەری ئاسیای لەبەشی سەرەوەی هالیس(روباری هالیس قزل ئیرماقی ئێستایە)ی خستە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو دوای ئەوەی کە هەموو بوون بەژێردەستەی ئەو، کۆی کردنەوە، ئەمجا چاوی بڕیە گرتنی نەینەوا هێرشی بۆکرد. ئەو بەو بیانووەوە هێرشی برد بۆ نەینەوا کە تۆڵەی باوکی خۆی و خەڵکانی ماد لەئاشوورییەکان بسەنێتەوەو نەینەوا لەناوبەرێ. لەوکاتەدا کە ئەو زاڵبوو بەسەر ئاشوورییەکانداو شاری نەینەوای گرت، سوپایەکی گەورەی سکایان دژی ئەو کەوتنە جەنگەوەو لەشکرەکانی سکایی بۆ سەرزەمینی ماد ملیان نا.

فەرمانڕەوایی سوپای سکایان لەئەستۆی(مادیاس)ی پادشای سکاکاندابوو. ئەو کوڕی پرۆتوتیاس بوو. ئەوان هاتبوونە ئاسیا(ئاسیای بچووك)، دیارە ئەوەش دوای ئەوەبوو کە کیمرییەکانیان لەئەوروپا دوورخستەوەو لەبەرچاو نەمان و بەدوای هەڵاتوەکانیاندا دەگەڕان. لەدواییدا ئەم سکایانە هاتنە سەرزەوی مادەکانەوە. ئەم سکایانە دوای هاتنە سەرزەوی مادەکان دەستیان کرد بە چەپاوڵ و ئاژاوەو پشێوی نانەوە. توانای ڕووبەڕوو بوونەوەو وەدەرنانی ئەوانیان نەبوو. بەپێی باسی هیرودۆت ئەو سکایانە بیست وهەشت ساڵ لەو رۆژگارەدا بەسەر ئاسیادا فەرمانڕەوابوون و بەهۆی توندوتیژی ودەستدرێژی ئەوانەوە وێران و چۆڵبوو. ئەم سکایانە لەهەموو میللەت و تیرەیەك بەجیا باجیان وەردەگرت. ئەو باجەی کەسکایان بۆ ئەوانیان دیاری دەکردو ناچاریان دەکردن

ئەنجامی بدەن. پتر لەم باج و خەراجەش تالانی سامان و پێداویستەکانی ژیانی ئەم میللەتانە لەرەفتارو کردەوەکانی ئەم سکایانەبوو.

پاشتر کیاکسارس و مادەکان ژمارەیەکی زۆری(زۆربەی) ئەم سکایانەیان کوشت و ئەم کوشتارە دوای ئەوە روویدا کە ئەوانە بۆ میوانی مادەکان بانگهێشت کرابوون و هەموویان(سکایان) مەست بوون و بەم جۆرە مادەکان خۆیان لەژێر دەستەلاتی ئەم سکایانە رزگار کردو بوون بەفەرمانڕەوایان، فەرمانڕەوای ئەوانەی کە رۆژێ پێشتر مادەکان ژێر دەستەیان بوون و باج و خەراجیان دەدانێ.

هیرودۆت دەڵێ: ((هەمان ماد نەینەوایان گرت))-چۆن ئەوان نەینەوایان گرت؟ لە داستانێکی دیکەدا باسی دەکەین-. ئەوان ئاشوورییەکانیان جگە لەوانەی لەبابلدابوون وابەستەی خۆیان کرد. لەدواییدا کە کیاکسارس چل ساڵ لەناو مادەکاندا فەرمانڕەوایی کرد کۆچی دوایی‌کرد. لەم چل ساڵەدا فەرمانڕەوایی سکایانیش لەسەرخاکی مادەکان رەچاوکراوە. ئەم کیاکسارسەی کە لەنەوەی دیوکس بووشان بەشانی مادەکان لەگەڵ (ئالیاتس)دا کەپاشای لیدیابووە جەنگی بەرپاکرد. حکوومەتی مادەکان لەسەردەمی کوڕی ئەودا(ئاستیاکس) لەلایەن (کوروش)ی کوڕی (کامبیزس)ەوە تێشکاو دوای ئەوە دەستەلاتی پارسەکان پەرەی سەند، کە(ویزووس) پادشای لیدی گومانی‌کرد کە دەتوانێ جڵەوی دەستەلاتی روو لەزیادبوونی پارسەکان بگرێ بەلام سەرکەوتوو نەبوو کە بەسەرهاتی جەنگی کوروش و کورویزوس پاشای لیدی لە شوێنێکی دیکەو داستانێکی دیکەدا بەدرێژی باس دەکەین.

هیرۆدۆت دەربارەی کیاکسارس داستانێکی دیکە باس دەکاو دەڵێ: ئەوکاتەی کیاکسارس زاڵبوو بەسەر سکایاندا ئەوەی باش دەزانی کە ئەم

سکایانە لەهونەری جەنگی و ئەسپ سواری و راودا شارەزاییەکی فراوانیان هەیە، بۆیە بڕیاریدا کوڕەکانی خۆی بسپێرێ پێیان تا زمانی سکایان و هونەرە جەنگییەکانی ئەوان فێربن. هەروەها کیاکسارس شەیدای تیرهاویژی سکاکان بووبوو بۆیە کوڕەکانی خۆی پێسپاردن.

ئەم سکایانە هەرکاتێ بچوونایە بۆڕاو، گیانلەبەرێ یا چەند گیانلەبەرێکیان راودەکردو دەیانهێنایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە دەستی خاڵی لەڕاو گەڕانەوەو هەر لەوکاتەشدابوو کە کیاکسارس گەیشتە لایان. ئەو بەتوندوتیژی لەگەڵ سکایاندا رووبەڕوو بوەوە. سکایان کە ئەمەیان بینی وەك ئەوکەسانەی کەبیانەوێ نیشانەی دڵگرانی خۆیان بەرامبەر بەوستەمەی کەشای ماد لێیکردوون نیشاندەن هەڵسان بەکوشتنی یەکێ لەکوڕە وردیلەکانی پاشای ماد کەپێی سپاردبوون، کردیان بە کەباب.

سکایان ئەم کوڕە بچکۆلەیان بەشێوەیەك کردبوو بە کەباب کە لەکاتی ئاساییدا چۆن نێچیرێ راوبکەن دەیبرژێنن، ئەویشیان هەر بەوجۆرەئامادەکردبوو کە گوایا گۆشتی نێچیر. سینییەکەبابی ئەو منداڵەیان لەبەردەمی کیاکسارسدا دانا. کیاکسارس و میوانەکانی بەپەلە لەوگۆشتەیان خوارد. ئەو سکایانەی ئەوکارەیان ئەنجام دابوو بەپەلە کەوتنەڕێ بۆلای لیدییەکان و لە ئالیاتس کوڕی(سادیاتس)داوای پەناهندییان کردبوو. کیاکسارس کاتێ بەوەی زانیبوو کە گۆشتی کوڕەکەی خۆیان دەرخواردی خۆی و میوانەکان داوە زۆر پەرێشان بووو لە ئالیاتسی پاشای لیدی داواکرد کە ئەو پێرە لە سکایان بگەڕێنێتەوە. ئالیاتس بەوجۆرەی نەکردو بەبێ گوێدان بە دەرخواستی شای ماد ئەوانەی لەداڵدەی خۆیدا هێشتەوە کە ئەمە بەتەنها دەیتوانی زەمینە خۆش بکا بۆ روودانی جەنگ لەنێوان مادو لیدیاییەکاندا.

٤. ئاستیاکس: ئاستیاکس کوڕی کیاکسارس بوو بەجێنشینی باوکی و بەڕێوەبردنی کاروباری ئیمپەراتۆرییەتەکەی باوکی گرتە ئەستۆی خۆی. باوکی دوای چل ساڵ سەڵتەنەت کۆچی دوایی کرد. ئاستیاگس کچێکی هەبوو ناوی(ماندانە)بوو. ئاستیاگس خەوێکی دیبوو کە ئاودابووی بەسەر شارەکەی ئەوانداو لافاو هەموو ئاسیای داگیرکردووە. ئەوکاتە ئەو(ئاستیاگس) بڕوای بەخەون لێکدەرەوەکان قایم بووو خەونەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە، بەڵام کەگوێی لەوەڵامی ئەوان بوو کەوتە ترس و لەرزەوەو بەتەواوی ترس باڵی کێشا بەسەریاو لەترسا ماندانەی کچی نەدابەشوو بەهیچ کەس لەمادەکان بەتایبەتی بەخزمانی خۆی.

ئاستیاگس کچەکەی خۆی دابەشوو بەیەك پارسی بەناوی(کامبیزس)ەوە. ئەو بەباشی ئەوەی دەزانی کەئەم کابیزسە لەخانەوادەیەکی باش هەڵکەوتوەو جێی بڕواو پشت پێبەستنەو خۆڕاگرو بەئارامە. ئەو تەماشای ئەم کەسایەتییەی وەك یەکێ لەمادەکان دەکرد کەناسراوو مام ناوەندی بێ. ئەوکاتەی کەماندانە شووی بەکامبیزس کردو بووبە هاوسەری لەهەمان ساڵدا ئاستیاگس خەوێکی دیکەی بینی.

ئەم خەونە بەم شێوەبوو کە لەناوسکی کچەکەیدا مێوێك خەریکە دەڕوێ و ئەم مێوە بەشێوەیەك لەگەشەکردندابوو کەوا دەردەکەوت هەموو ئاسیا بکا بەژێرەوە. کاتێ ئەو خەونەی دیو لای خەونلێکدەرەوەکان گێڕایەوەو لەئەنجامی خەونەکەی ئاگاداربوو فرمانیدا کچەکەی کە دووگیان(ئاوس)بوو لەسەر زەوی پارسەکانەوە بهێنرێتەوە بۆ پایتەختی ماد. کەهێنایان ئەم کچە دووگیانەی خۆی خستەژێر چاودێرییەوە تا ئەو منداڵەی لەدایك دەبێ یەکسەر بکوژرێ، چونکە خەونلێکدەرانی موغ وەها خەونەکەیان بۆ لێکدابووەوە کە ئەوکچەی منداڵێکی دەبێ لەجێی ئەودا دەبێ

بەپادشا. ئاستیاگس ئارەزوومەند نەبوو بەهیچ جۆرێ ئەمە رووبداو ئەم خەونە بێتە دی.

ئەو بەپەلە(هارپاگووس) کەیەکێبوو لەخزمەکانی خۆی‌و بەئەمەکترین کەسی ماد بوو وکاروباری تایبەتی ئەوی ئەنجام دەدا بانگهێشت کرد بۆلای خۆی‌و بەم جۆرە دەستی کرد بەئاخافتن لەگەڵیدا: ((هارپاگووس! کارێ من بەتۆی دەسپێرم بەکارێکی لاوەکی‌و بێبایەخ تەماشامەکەو بەکارێکی سادەو سانای تێمەگە. من بەرامبەر بەخۆت بەدبین مەکەو مەبە بەهۆی فەوتاندنی ئەگەر وەهابێ خەڵکانی دیکەش بەهەمان چارەنووسی خەفەتباری‌خۆت گرفتار دەکەیت‌و ئەوانیش لەناو دەبەیت. ئەو منداڵەی کەماندانە هێناویەتیە جیهانەوە هەڵبگرەو بیبەرەوە بۆماڵی خۆتان‌و بیکوژەو بیسپێرە بەخاك بەهەرشێوەیەك کەخۆت بەباشی دەزانی)).

هارپاگ وەڵامی پاشای دایەوە: ((پاشا! تاهەنووکە هیچ کاتێ لەلایەن منەوە کارێکت نەدیوە کە بەپێچەوانەی ئارەزووو خواستی بەرێزتان بووبێ من بۆ ئەمەو دواش هەروا دەمێنمەوەو نامەوێ بەهیچ جۆرێ هەڵەی وابکەم کە بەپێچەوانەی ئارەزووی تۆوەبێ. ئەگەر ئارەزووی تۆ وەهابێ‌و لەسەر ئەوە سووربیت کە ئەوکارە پێویستە بەوشێوە ئەنجام بدرێ دەبێ منیش بەئەمەك بم‌و بەتەواوی فەرمانی بەرێزتان جێبەجێ بکەم)).

لێرەدا پێویستە بۆساتێ گفت‌وگۆی نێوان ئاستیاگ‌و هارپاگ واز لێبهێنین‌و هەوڵ بدەین هارپارگ بناسین‌و بەرووبەروو بوونەوەی ئەو لەگەڵ دواپاشای ماددا ئاشنا بین، چونکە پەیوەندییەکانی ئەم دوانە لەگەڵ یەکدا بەتایبەتی رابردوویان پێکەوە زۆر چارەنووس سازو بەتایبەتی لەم بوارەدا کاریگەرییەکی گرنگی هەیەو چارەنووسی ئیمپەراتۆرییەتی ماد دیاری دەکا.

هارپارگ دوای ئەوەی وەلامی پادشای بەوجۆرە دایەوەو پاش ئەوەی منداڵە لەدایکبووەکە کەبڕیاربوو بکوژێت ئامادەکرا بەدەم گریانەوە خۆی کرد بەماڵی خۆیاندا. دوای گەیشتنە ماڵەوە ئەو ئاخافتنەی لەنێوان ئەوو ئاستیاگدا روویدابوو بۆ هاوسەرەکەی خۆی گێڕایەوە. ژنەکەی دوای ئەوەی گوێی لەو ئاخاوتنەی ئەوبوو هاتە دەنگ و وتی: ((چۆن بیری لێدەکەیتەوە؟ وچۆنت بڕیارداوە؟ گەرەکتە چی بکەیت؟ ئەو لەوەلامدا وتی: ((بەوشێوەنا ئاستیاگ فەرمانی داوە. نەخەیر ئەگەر بیرو ئەندێشەی لەوە بەدتریش لەمێشکیدا سووڕبخواو لەوەش توندڕەوتربێ کەخۆی باسی کرد، من بەخواست و ئارەزووی ئەو ناجوولێمەوە دەستی یارمەتی بۆکەس درێژ ناکەم کە بیکوژێ. چونکە ئەم منالە لەسەرێکەوە خزمی منەو لەلایەکی دیکەوە ئاستیاگ پیرەو منداڵێکی نێرینەی نیە کەجێنیشینی ئەوبێ. بەم هەل ومەرجەی کەئەو کوڕی نییە ببێ بەجێنشینی و دوای ئەوەش کە کچەکەی بوو بەجێنشینی ئەوو جڵەوی دەستەلاتی کەوتە دەست، ئەوکچەی کەهەنووکە کوڕەکەی بەیارمەتی من سەری تیابچێ، بێگومان ئەوە دەبێ بەگەورەترین مەترسی کەیەخەی من دەگرێ. باشە لای تۆش وەهانیە؟ دیارە بۆ سەلامەتی من دەبێ ئەم منداڵە بکوژرێ، بەلام نەك بەهۆی منەوە بەڵکو بەهۆی یەکێ لەوانەی کە لەدەوروبەری ئاستیاگن یا خزمی خۆین کەدەبێ یەکێ لەوانە بەبکوژی ئەم منداڵەبێ.

نەك کەس وکاری من. هارپاگ لەئەندێشەی ئەوەدابوو کە ئەم کوشتنە بەهیچ جۆرێ پەیوەندی بەوەوە نەبێ و دەستی ئەو بەخوێنی منداڵی ماندانە سوورنەبێ. ئەو بیری لەتەگبیرێ کردەوە کەپێویستە یەکێکی لەبار بۆ ئەم کارە مەترسیدارە بدۆزرێتەوە. لەلایەکی دیکەوە، هارپاگ لەمەترسییەکی دیکە بیری دەکردەوە کەئەویش نەبوونی جێنشینێکی نێرینەبوو بۆ

ئاستیاگ. بەم جۆرە هیرۆدۆت لەزمانی هارپاگەوە دەگێڕێتەوە((کەئەو مەترسییەی لەوانەیە رووبەرووی ببێتەوە بەهۆی بەرپرسیاربوونیەتی لەو مەسەلە کە ئەگەر بێتوو ماندانەی کچی ئاستیاگ لەجێگای باوکیدا بچێتە سەر تەختی سەڵتەنەت، لەم بارودۆخەدا ماندانە کەسێ دەبێ کە منداڵەکەی بەهۆی منەوە یا بەکۆمەکی من(هارپاگ دەڵێ) لەناوچووبێ بێگومان ئەوکاتە گەورەترین مەترسی روودەکاتە من. دەیسا وانیە؟! ئاشکرایە پاشا ئەوکارەی بەراستی خستۆتە ئەستۆی من و هیچ رێبازێکیش بۆ دەربازبوون لەژێر ئەم بارە قورسە گومان نابەم. بۆ سەلامەتی خۆم دەبێ ئەم منداڵە بکوژرێ بەڵام نەك بەهۆی منەوە))..

ئەمە وتەی هارپارگ بوو دەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئاوا بەترسەوەو بە پەرێشانی‌یەوە بۆی باس دەکرد. ئەو بۆیەکێ دەگەڕا کە بەهیچ جۆرێ لەوەوە نزیك نەبێ بەڵکو لەکەس‌وکارو خزمانی خانەدانی سەڵتەنەتی مادبێ.

هیرۆدۆت دەڵێ: ئاستیاگ چاوەڕوان بوو کە ئەم کارە بەدروستی و بەوردی لەلایەن هارپارگەوە ئەنجام بدرێ و هارپارگیش توانا و پرکێشی سەرپێچی فەرمانی پادشای لەخۆیدا نەدەبینی و نەیشی دەویست بەهیچ جۆرێ ئەم کوشتنە بەهۆی ئەوەوە یا بەهۆی کەس‌وکاری ئەوەوە ئەنجام بدرێ، بەڵکو هەردەبێ لەلایەن خانەدانی سەڵتەنەتییەوە یا بەدەستی یەکێ لەدەوروبەرو خزمانی ئاستیاگەوە جێبەجێ بکرێ.

# بەشی پێنجەم

## پادشایانی ماد وەك کتزیاس باسیان دەکا

کتزیاس(کتسیاس) پزیشکی دەرباری داریووشی دووەم و پزیشکی ئەردەشیری دووەم کە کوڕو جێنشینی داریووش بووە بەهۆی بەهرەگیرییەوە لە بەڵگەنامەکانی ئارشیفی سەڵتەنەتی بەرهەمە بەناوبانگەکەیدا(پەرسیکا) پاشایانی ماد بە دەکەس و تێکڕای ماوەی فەرمانڕەواییان بە سێ‌سەدو چل ساڵ نووسیوە. ئەم دە پاشای مادە بەپێی نووسینی کتزیاس بەم شێوەیە:

١. ئارباکیس Arbakis ٢٨ ساڵ پادشایی.

٢. مائوو داکس Maodakes ٥٠ ساڵ پادشایی.

٣. سوسارمس Sussarmes ٢٨ ساڵ سەڵتەنەت.

٤. ئەرتیکاس Artikas ٥٠ ساڵ سەڵتەنەت.

٥. ئاربی یانیس Arbi yanis ٢٢ ساڵ پادشایی.

٦. ئەرتایس Artayes ٤٠ ساڵ پادشایی.

٧. ئەرتینیس Artinis ٢٢ساڵ پادشایی.

٨. ئەستی بەراس Astibaras ٤٠ ساڵ پادشایی.

٩. ئەسپەنداس Aspandas ٢٥ سال پادشایی.

١٠. ئاستیگاس Astigas بۆماوەی ٣٥ ساڵ پادشایی.

ئەم شێوە لەگەڵ نەخشەی پادشایانی ماد بەگوێرەی نووسینی هیرۆدۆت جیاوازە. چونکە وەك لەپێشدا باسکرا هیرودۆت پادشایانی ماد بەچوارکەس دەزانێ کە نزیکەی سەدەو نیوێ پاشاییان کردووە.

(تیئودور نۆلدکه) شارەزای مێژووی ماد لەو باوەڕەدایە کە کتزیاس ئەم زانیارییانەی بەپێی باسەکانی خودی مادەکان نووسیوەو مادەکان خۆیان گەرەکیان بووە بەم شێوەیە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیان زیاد بکەن.

بەوردبوونەوە لە درێژی پادشایی هەندێ لەپاشاکانی ماد کە لەچەند کاتێکی چون یەکدا ژیاون وادێتە بەرچاو کە هەندێ لەوانە فەرمانڕەوای هەندێ لە هەرێمەکان بووبن کە لەهەمان کاتدا جڵەوی کاریان لەچەند ناوچەیەکی جیاوازدا لەدەستدابووە.

# بەشی شەشەم

# مادەکان لەتێڕامانێکی گشتگیرو فراواندا

لەساڵی(٨٣٥ پ.ز) دا سەلمانسەری سێیەم. پاشای ئاشوور لەبەردە نووسراوەکانی خۆیدا سەرزەمینی پارسوا(پارس) یا ئێران و(مادا) یا سەرزەمینی ماد، هەروەها خودی مادەکان لەخۆرئاواو باشووری خۆرهەڵاتی دەریاچەی ورمێ ناو دەبا هەردوو میللەتەکە واتا مادەکان و پارسەکان، لەسەر بنەمای دوایین شوێنی نیشتەجێبوونیان پێویست بوو لەکۆچکردنیاندا بەرەو باشوور، بۆ ماوەی نزیکەی سەدەو نیوێ بەردەوام بن مادەکان دوو سەدەیان لە سەرەتای حکوومەتەکەیانەوە، وەك مێژوو وسەرچاوە مێژووییەکان دەگێڕنەوە، لەجەنگدا، لەگەڵ پاشایانی ئاشوور تێپەڕاند. وەلێ بەدرێژایی ئەم جەنگانە پاشایانی ئاشوور نەیانتوانیوەئەو ناوچانەی لەژێر دەستەڵاتی مادەکاندابوو داگیر بکەن و بیانخەنە پاڵسەرزەمینی ئاشوور.

بەپێی باسکردنی هیرۆدۆت(دیائاکۆ) لە دەوروبەری ساڵی ٧١٥ پ.ز وەك دیلێکی جەنگی ئاشوورییەکان دەنێردرێ بۆ سووریا. هیرودۆت ئەو بەدامەزرێنەری دەوڵەتی ماد دەزانێ. بەگوێرەی ئەم باسەو لەسەر بنەمای چەند سەرچاوەیەکی دیکەی مێژوویی کیمیریای لە دەوروبەری ساڵی ٧٢٠ پ.ز(رووسا)و پاشای ئورارتو بەتەواوی تێکدەشکێنن. سەرزەمینی ماندووی ئورارتۆ هەرچەندە لەلایەن دیائاکۆی مادییەوە یارمەتی دەدرێ بەڵام ناتوانێ بەرامبەر ئەو هەموو هێرشە یەك بەدوای یەکەی سارگونی دوەمدا رابوەستێ.

لەساڵی(٧١٤)ی پێش زاییندا ئورارتو هەشت هێرشی لەلایەن سارگونەوە دەکرێتە سەرو خۆی رادەگریو دیائاکو ساڵێ پێش دوا هێرشی سارگونی دووەم بۆ شام(سووریە) دوور خرابووەوە. سەردەمی فەرمانڕەوایی دیائاکو لەنێو مادەکاندا وەك لەمەولا بەدرێژی باسی دەکەین دەبێ بەساڵی ٧٠١-٦٥٥پ.ز دابنرێ.

فرورتیش کە سەردەمی حکوومەتی ئەویان بەدروستی لە ٦٥٥-٦٣٣ پ.ز داناوە ئەو هەڵەی کە باوکی لەپەیوەندیدا لەگەڵ ئاشووردا کردبووی دووبارە دەکاتەوە.

ئەو دیسان بەیەکگرتن لەگەڵ کیمیریان و پارسەکاندا هێرش دەکاتە سەر ئاشوورییەکان وەلێ شکستێکی گەورە دەخواو لەجەنگدا دەکوژرێ و وەك دەگێڕنەوە کە لەسەرەتای ساڵەکانیفەرمانڕەوایی ئەودا هێرشبەرانی سکایی کەبەشێ لەهیندۆ ئەڵمانییەکان بوون و لەنێوان دەریای خەزەرو قەفقازدا جێنیشتەبوو بوون لەرێگای دەروازەی دەربەندەوە دەگەنە سەرزەمینی مادەکان. (ئاسارهادوون) دەیەوێ بەفێڵ کچەکەی خۆی مارە بکا لە(بارتاتوا)ی فەرماندەی سکاکان، بەو ئومێدەی بتوانێ لەشکرێ بەرامبەر دەستەلاتی مادەکان کە رۆژانە لەزیادبووندا بوو دروست بکا. بەگوێرەی ئەم باسانە سکایان بۆ ماوەی بیست و هەشت ساڵ واتە لەساڵی ٦٥٣-٦٢٥ پ.ز فەرمانڕەوای ئاسیای پێشەوە دەبن. دەبێ وەبیر بهێنرێتەوە کەئەم باسە بەشێوەیەکی دیکەش هاتووە کە لەلاپەڕەکانی ئەمەودوادا روون دەکرێتەوە.

هووخشترە یاکیاکسار کەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەویان بەساڵی ٦٣٣-٥٨٤ پ.ز داناوەو هەندێ ئەم سەردەمە بە(٦٢٥-٥٧٥ پ.ز) دادەنێن، لەشکری مادەکان سەرلەنوێ رێك دەخاتەوەو لەسەر بنچینەی نموونەی

لەشکری ئاشووررییەکان دایدەمەزرێنێ. ئەو بەدوژمنایەتی لەگەڵ جێنشینەکانی ئاشوو بانیپاڵدا بیپەروا درێژە پێدەداو نەینەوا گەمارۆ داگیر دەکا، وەلێ بەهۆی هێرشی گرۆهێ لە سکایانی هێرشبەر کە لەسەر داواو بەرێنمایی (سین شاریش کون) بۆ سەرزەمینی مادەکان ملیان نابوو واز لەگەمارۆی نەینەوا دێنێ و پاشەکشە دەکاو لەدواییدا لەساڵی ٦١٦ی پێش زایین لەگەڵ (نەبو پۆلاسار)ی پاشای کلدە(بابل) یەکدەگرێ.

ئەو لەپێشدا تێکدەشکێنێ و پاشان لەساڵی ٦١٤ دووبارە هێرش دەکاتە سەر ئاشوورو لەساڵی ٦١٢ لەگەڵ(نەبو پولاسار) نەینەوا داگیر دەکەن. ئەو دەڤەرانەی وابەستەبوون بەئاشوورەوە لەخۆرهەلاتی روباری دیجلەدا دەکەونە ژێر دەستەلاتی مادەوە. لەساڵی ٦١٠ باکووری میزۆپۆتاما دەخرێتە سەر دەوڵەتی ماد. پتر لەوەش کیاکسار ئەرمەنستانیش داگیر دەکا. دەگێرنەوە کە لکەکانی دیکەی ئێرانی لەم ماوەدا ئیمپەراتۆرییەتی ئورارتۆ لەناو دەبەن و دەستی بەسەردا دەگرن و زمانی خۆیان لەم سەرزەمینەدا پیادە دەکەن. لەدرێژەپێدانی ئەم سیاسەتە دەستەلاتخوازانەدا (کیاکسار) لەرێگای(ئەنتی تاوروسەوە) کە رەنگە کێوەکانی ئەناتۆلی بێ لەرێرەوی خۆرئاواوە تا روباری(هالیس)ی سنووری ولاتی لیدی پێشرەوی دەکا و لەبەرواری ٥٨٥/٥/٢٨ی پێش زاییندا بەهۆی خۆرگیرانەوە، ئەم جەنگە بەبێ سەرکەوتنی هیچ لایەك رادەوەستێ و بەهۆی ناوبژیوانی بێلایەنگیری نەبووکەدنەسری دوەم پاشای بابل جەنگ کۆتایی دێ. لەم روەوە لە لاپەرەکانی ئەمەودوادا بەدرێژی دەدوێین.

سی(٣٠) ساڵی رەبەق لەخۆرهەلاتدا ئاشتی لەنێوان دەستەلاتە مەزنەکاندا وەك لیدی، ماد، بابل(کلدانییەکان)و میسر سەقامگیر دەبێ. لەپاڵ ئەوەدا (کیلیکیە) کە سەرزەمینێکی تارادەیەك بچووك و دەوڵەتێکی

کەم توانا بووە لەژێر فەرمانڕەوایی(سینیسیس)دا دەتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ.

لەساڵی(٥٥٢پ.ز)دا کوروشی دوەم، پاشای(ئەنشان) بەرامبەر ئاستیاگ(٥٨٥-٥٥٠پ.ز) لەجەنگێکدا ماد سەربەخۆیی خۆی لەدەست دەداو دەبێتە پارێزگایەکی ئیمپەراتۆرییەتی پارسەکان بەخێرایی دادەمەزرێ.

(ئەکباتان)ی پایتەختی مادەکان هەروەك جاران بۆ پاشایانی هەخامەنشی وەك پێگەو پایتەخت دەمێنێتەوە. بەگشتی لەسەرەتادا پارس و ماد کە لەڕووی زمان و فەرهەنگەوە زۆر لەیەکەوە نزیکن بەیەك میللەت دادەنران. یۆنانییەکان کاتێ ئەم دوو میللەتە ئێرانییەیان مەبەست بووبێ لەباسە مێژووییەکانی خۆیاندا لەژێر ناوی مادەکاندا ناویان هێناون. ماوەیەکی زۆر لای هەندێ لەمێژوونووسانی یۆنانی پارسەکانیان(هەخامەنشییان) وەك پێشتر بەمادەکان ناودەبرد، بەڵام لەبەرئەوەی مێژوونووسان لەدەستنیشانکردندا کەوتوونەتە هەڵەوە نابێ ماد بەپارس بزانرێ.

# بەشی حەوتەم
# مادەکان لەهەڵسەنگاندنی میژوونووسە تازەکانی خۆرئاوادا، بەتایبەتی نەتەوەناسان

لەپێشدا پێویستە بوترێ کەجیاوازی بۆچوون لەنێوان مێژوونووساندا دەربارەی مێژووی سەردەمە کۆنەکان زۆرە. هەروەها ئەو جیاوازییە لە هەڵسەنگاندن و پێناسەی مادەکانیشدا هەیە کە بەکورتی باسی دەکەین. بۆیەکەمین جار لەسەر بەردەنووسراوەکانی ئاشووریدا لەساڵی(٨٣٦پ.ز)، مادەکان(بەئاشووری مادای) لەخۆرئاوای ئێراندا، لەو دەڤەرەی کە لەدواییدا پایتەختی مادەکان دانراوە واتەئەکباتانا.

(هەمەدانی ئەمڕۆ)، ناویان هاتوە. سەردەمی کۆچی ئەوان لە خۆرهەڵات یا باکووری خۆرهەڵاتی ئێرانەوە نازانین. رەنگە ئەو سەردەمە زۆر لەپێش هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە نەبووبێ. خێڵ و میللەتانی هاوسێی ئەوان، لەلاپاڵی کێوەکانی زاگرۆسدا وادەردەکەوێ کەزۆربەیان ئێرانی نەبوون. یەکەم نەتەوەی خزم لەگەڵ ئەواندا دەتوانرێ بەپارسەکان دابنرێ کە ئەو سەردەمە لەباشووری سەرزەمینی مادا، لەدەڤەری خورەم ئابادی ئەمڕۆدا لەناوچەی(پارسواش)یا(پارسوماش) جێنیشتەبووبوون. ئەم جێنیشتوانەی ناوچەی پارسواش(پارسوماش) بۆ دەڤەرێ کە دواتر بەناوی ئەوانەوە ناونراوە واتە پارس(فارسی ئێستا) کۆچیان کردوە. لەدەوروبەری ساڵی(٧٥٠پ.ز)دا میللەتانی هیندۆ ئەڵمانی و هەروەها ئارییەکان و

له‌وانه‌ش میلله‌تانی کیمیریان، له‌ڕێگای کێوه‌کانی قه‌فقازه‌وه، له‌سه‌ره‌تادا چه‌ند ده‌ستێکی قورسیان له‌سه‌رزه‌مینی ئۆرارتۆ(ئارارات) وه‌شاندو به‌شێوه‌یه‌کی به‌ربلاو هه‌ندێ له‌وانه به‌ره‌و باشووری خۆرئاوا که‌وتنه‌ڕێو پێشڕه‌وییانکرد.

ده‌وروبه‌ری ساڵی(٦٩٠پ.ز) (فریگیه) یان له‌ناوبردو چه‌ند هێرشێکی تازه‌یان له‌ساڵی ٦٥٢دا سه‌رزه‌وی(لیدی) یان وێرانکرد. لکێکی دیکه‌ی ئه‌وان له ڕاڕه‌وی باشووری خۆرهه‌ڵاتدا درێژه‌یان به‌پێشڕه‌وی خۆیان داو له‌ژێر فه‌رمانڕه‌وایی(تووشپا)دا که‌ئه‌مه له‌هه‌مان کاتدا ناویشه بۆ پێگه‌و سه‌نته‌ری دامه‌زراوه سه‌ربازییه‌کانیان ، له‌ساڵی ٦٧٩دا مه‌ترسییه‌کی گه‌وره بۆ ده‌وڵه‌تی ئاشوور دێنێته ئاراوه. له‌دامه‌زراندنی یه‌ك ده‌وڵه‌تو فه‌رمانڕه‌وایی به‌رده‌وام له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌وه له‌هیچ هه‌وڵو به‌ڵگه‌نامه‌یه‌کی مێژووییدا زانیاری به‌ده‌ست نایه‌ت.

باڵاده‌ستیو هێزو توانای دانیشتوانی سه‌رزه‌مینی ماد له‌سایه‌ی لاوازکردنی(ماننه‌کانه‌وه) به‌ده‌ستی ئاشووریو ئۆرارتوویه‌کان، به‌شێوه‌یه‌ك بووه که‌وه‌ك سه‌رچاوه ئاشوورییه‌کان باسی ده‌که‌ن، هاوکێشه‌ی ڕامیاریو سه‌ربازی ئه‌م ده‌ڤه‌ره تێك ده‌دا. پێویسته بوترێ که ده‌وڵه‌تی ماننه‌کان به‌سه‌ر ناوچه‌کانی باکووری خۆرئاوای ئێراندا فه‌رمانڕه‌واییان ده‌کرد. له‌ساڵی ٧١٥پ.ز سارگۆنی دووه‌م، دیائاکو که‌وێده‌چێ له‌گه‌ڵ ماننه‌کاندا هاوپه‌یمان بووبێ، ده‌ستگیر ده‌کاو به‌پێی ئاره‌زووی سارگون که‌دووباره له‌گه‌ڵ عیلامی‌یه‌کانیشدا له‌جه‌نگدابوو(جه‌نگی ئه‌ربیل له ٧٢٢-٧٠٥ی پێش زایین) میلله‌تانو هۆزه سه‌ربه‌خۆیی خوازه‌کان سه‌رکوت ده‌کرێنو له‌هه‌واڵێکی دیکه‌دا سارگۆنی دوه‌م، دیائاکۆ(دیوکس)، به‌مه‌به‌ستی

جڵـەوگرتن لـەیاخیبوون لەوناوچەیـە دوور دەخاتـەوەو لەشـام بـەدیلی دەیهێڵێتەوە.

ئەمجا فـەرمانڕەوا(خشـترتیە) کـە یۆنانییـەکان بـە(فەرائـەرتس) ناویـان بردوە، سەرزەمینی خۆی لەژێر دەستەڵاتی ئاشوورییەکان ئازاد دەکا. بەڵام دیـارە ئەمـە بـەدوور دەزانـرێ چونکـە فروتریـش لەجـەنگدا لەگـەڵ ئاشـوورییەکان بەدەسـتی ئاشـوور بانیپـاڵ دەکـوژرێ. تیرەکـانی هینـدۆ ژەرمەنی سکایی لەرێگای باشووری رووسیەوە بەرەو باکووری خۆرئاوای ئێران کۆچیان کردوەو بەپێشڕەوی خۆیان درێژە دەدەن وچەند دەستێ لە کیمیرییەکان دەوەشێنن و ناچاریان دەکەن بەپاشەکشە چونکە ئاشوور لەم سـەردەمەدا لەگـەڵ پارتـاتوا(پـروتوتیـس)ی پادشـای سـکایان دژی مـادو کیمیریـان یـەکدەگرێ. لـەپاش ساڵی ٦٣٠ پێش زایین سکایان(سـکیتەکان) سـەرزەمینی سووریە ویـران دەکەن. دامەزرێنـەری دەسـتەڵاتی مـەزنی ماد واتە کیاکسار بەیەککگرتن لەگەڵ بابلدا لەساڵەکانی(٦١٦تـا٦٠٨)ی پێـش زایین دەوڵەتی ئاشوور لەناودەباو چەند بەشێکی گەورەی بان ئێران دەخاتە ژێـر دەسـتەڵاتی خۆیـەوەو لـەدواییدا لـەپاش گراتنـی ئەرمەنستان بـەرەو ئاسیای بچووك پێشڕەوی دەکا.

# بەشی هەشتەم
# هۆکانی یەکگرتنی هۆزەکانی ماد

بەگوێرەی باسەکانی هیرودۆت، مادەکان بەشێوەی پەرت وبڵاو لەچەند کۆمەڵگەیەکی تیرەییدا دەژیان و بەهۆی چەند یاسایەکی پڕ لەزەبروزەنگەوە کە سەپێنرابوو بەسەر زەوییەکەیاندا لەرەنج و ناخۆشیدابوون. ئەم گرفتە تەنها بۆیەك تیرە نەبوو، بەڵکو هەموو تیرەکان لەم بارە ناخۆشەدا دەژیان. بەپێی باسکردنی هیرودۆت دیائاکۆ وەك ئەندامی یەکێ لەو هۆزانەی لەناوچەی کوێستانیدا دەژیان، پێش ئەوەی بەرابەری مادەکان هەڵبژێردرێ ناوونیشان و رێزێکی تایبەتی هەبووە. دیائاکۆ ئەم رووبەروو بوونەوەو پێکادان و ستەم و دەست درێژی نێوان ئەم تیرانەی لەناو خۆیاندا بەچاوی خۆی دیبوو. هیرودۆت باسی فەرمانڕەوایی ستەم و دەستدرێژی بۆسەر تیرەکانی ماد پێش یەکگرتنیان دەکا. ئەمە لەبارودۆخێکدا بووە کەتیرەکانی ماد هەریەکەیان بەشێوەیەك خاوەنی سەربەخۆیی بوون.

دیائاکۆ(دیووکس بەیۆنانی) کوڕی فرورتیش(فرارتس بەیۆنانی) لەهزری دامەزراندنی یەك حکوومەتی تەنها بووە کەلەوکاتەدا مادەکان لەگوندەکان بەشێوەیەکی پەرت وبڵاو دەژیان.دیائاکۆ لەو رێزو ناوبانگەی لەنێوان هۆزەکانی ماددا هەیبووە سوودی وەرگرتووە بۆ ئەوەی مادەکان یەکپێبگرێ. ئەو خۆی وەك کەسایەتییەکی پەیوەندیدار بەفەرمانڕەوایی دادپەروەرو یەکگرتن، بەمادەکان ناساندبوو لەم بوارەدا بەمرۆڤێکی خۆشەویست ناوبانگی دەرچووبوو ئەو ئاگای لەو راستیەبوو کە مرۆڤی ستەمدیدەو بەشخوراو بەهۆی ئاژاوەو بێ یاسایی و ستەمەوە چۆن ئازار

دەچێژێ. هیرودۆت گەورەترین کەرەسەی خۆبردنە پێشەوەی دیائاکۆ بەشارەزایی لەیاساکان و ئاسایشی خێزانی و ژیانی بەکۆمەڵ لەنێوان تیرەکاندا ناودەبا. کاتێ مادە نیشتەجێبووەکانی ئەو گوندەی دیائاکو ژیانی تێدا بەسەردەبرد لەنیازی پاکی ئەو ئاگاداربوون و راستگۆیی ئەویان بۆ دەرکەوت ئەویان بەناوبژیوان و دادوەری خۆیان هەڵبژارد. هیرودۆت باس دەکا کەچۆن دیائاکۆ لەئەندێشەی دەستەڵات وەرگرتنی رەهاو بێرکابەر لەنێو مادەکاندابوو ودابەشکردنی دەستەڵات و دەستێوەردان لەکاروباری جێبەجێکردنی فەرمانڕەوایی بەراست و دروست نەدەزانی. بەرەفتاری جوان و دادپەروەری و فیزی ئەم رابەرییەی بەناوی دادوەرەوە وەرگرت. ئەم کارەی دیائاکۆ رێزو ئافەرینێکی زۆری بۆئەو بەدیاری پێشکەشکرد. بەواتەی هیرودۆت ئەم هەنگاوەی دیائاکۆ ئەوەندە جێی رێزو نەوازشی خەڵکیبوو کەدانیشتوانی گوندەکانی دیکەیشی بەرەو ئەو راکێشاو هەموان بڕیاریاندا کە دیائاکۆ بەفەرمانڕەواو ریشسپی خۆیان بزانن.

ئەم راگەیانانە بۆ داکۆکی لە دیائاکۆ ئەوەندە فراوان بوون کە لەناو مادەکاندا ئەو باوەڕە بەهێزبوو کە دیائاکۆ تەنها کەسێکە پەیڕەوی دادپەروەری بکاو بێجگە لەو کەسێکی دیکە یاساو داد نازانێ.

ئەم هەوادارانەی ئەو پێرپێڕ دەچوون بۆلای و ناکۆکی و گرفتی خۆیان لای ئەو باس دەکردو تەنها لەگەڵ ئەودا دەدوان و ئیدی بەپێویستیان نەدەزانی بۆ نەهێشتنی ناکۆکییەکانیان بچنە لای یەکێکی دی. دیائاکۆ تەنها بەناوی دادوەر لای تیرەکانی ماد ناوی دەرنەچووبوو وبەس بەڵکو ئەو بەپشتیوانێکی قایم و بەتوانا دادەنرا بۆ ئەنجامدانی کاروبارو تەیارکردنی مادەکان کە بتوانن رووبەرووی دەوڵەتە بەهێزەکانی ئەو ناوە خۆیان راگرن کە لەشوێنێکی دیکەدا ئاماژەی بۆ دەکرێ. هیرودۆت لەوباوەڕەدابوو کە

یەکگرتنی مادەکان لەو سەردەمەدا کارێ نییە نکووڵی لێبکرێ بەڵکو زۆر پێویستە. ژمارەی ئەوانەی دوای دیائاکۆ کەوتبوون و پەیوەندییان پێوەکردبوو بەشێوەیەکی لەبەرچاو روو لەزیادکردن بوون و بەوتەی هیرودۆت لە ژمارانە دەهاتن. ئەوان بەکردەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەو بەسەر هەموو ئەو کاروبارانەی پەیوەندی بەناکۆکی نێوان مادەکانەوە هەیە ئاگادارەو دەتوانێ کۆنترۆڵیان بکاو بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکییانە پەیڕەوی دادی دەکرد بۆیە لەلایەن هەموانەوە کردەوەکانی پەسەند بوون.

دیائاکۆ هێدی هێدی بەم ئەنجامە گەیشت کەپاڵە پەستۆی ئەو کارانە لەسەری و رووکردنە لای ئەو لەهەموو لایەکەوە بەئەندازەیەکە کەناتوانێ بەرامبەر ئەوکارانە خۆڕاگر بێ و بەوشێوە ناوبژی نێوان مادەکانی بۆناکرێ. دیائاکۆ بیری لە نەخشەیەك کردەوە کەخۆی پێ لەم بارە قورسە دەرباز بکاو هەمیشە لەئەندێشەی ئەوەدابوو کە رێبازێکی لۆجیستی بدۆزێتەوە تا ئەوکەسانەی ئەویان هەڵبژاردبوو لێی دووربکەونەوەو ئەویش واز لەو بەرپرسیارییە بهێنێ. ئەم کارە نەك تەنها لای مادەکان بەڵکو لای خودی دیائاکۆش ئاسان نەبوو وخستنەرووی لەو بارودۆخەدا بەرژەوەندی تێدا نەبوو. هیرودۆت لەو باوەڕەدابوو کە دیائاکۆ هێشتا لەپلەو پۆستی پادشا یا رابەرێکی رامیاریی ئەوتۆدا نەبوو کە هەموو ئیشێکی لەبەر بڕوا وەلێ بڕیاری دابوو کەئەم بەرپرسیارییەی وەك دەمچەرمووی مادەکان لەئەستۆیدابوو واز لێبهێنێ. ئەم کارە بۆ ئەو بێکەڵکەو ئیدی ناتوانێ هەموو بەرژەوەندییەکانی ژیانی خۆی لەو رێیەدا بەخت بکا ئەو مەسەلە بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی دزی و پشتگوێ خستنی یاسا سەرلەنوێ، کەڕەنگە ئەم دزی و دەرچوون لەسنووری یاسایە، لەو رۆژەوە باسی کەنارگیری دیائاکۆ کەوتبووە ناوەوە لەنێوان مادەکاندا بەربلاوتر بووبێ و زۆر

لەوەوپێش خراپتر بووبێ. لەم ڕووەوە ئەو مادانەی لەگوندەکاندا جێنیشتەبوون لەگەڵ یەکدا کۆبوونەوەو کەوتنە ڕاوێژکردن. هەموویان لەیەك بۆچووندا ڕێك بوون کەئیدی ناتوانرێ درێژە بەو بارە ناهەموارە بدرێ، بەڵکو دەبێ تەگبیرێ بکرێ تائەم گیروگرفتە لەڕەگەوە چارەسەر بکرێ‌و زاڵ بێن بەسەریدا.

بێگومان درێژە کێشانی ئەو بارودۆخە ژیانیان لێ تێك دەدا. لەبەرئەوە مادەکان چوونە سەر ئەو بڕوایەی کە پێویستە پادشایەك هەڵبژێرن کە دەستەڵاتدار بێ لەنێوانیانداو چاودێری کاروبارو هەل‌ومەرجی کۆمەڵگای مادەکان بکا. تالەو ڕێگایەوە ئاسایش‌ودڵنیایی بۆ ئەو خەڵکە دابین بکەن‌و خەڵکی بتوانن درێژە بەکارو پیشەی خۆیان بدەن‌و ناچار بە بەجێهێڵانی خانەو کاشانەی خۆیان نەبن.

خۆ ئەگەر وانەکەن، بەوتەی هیرودۆت بەهۆی هەل‌ومەرجی ناهەموارو نەبوونی یاساو بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو بەدکارییەوە دەبێ سەرزەمینی خۆیان بەجێبهێڵن. زۆربەی بەو جۆرە بیریان لێدەکردەوەو بۆ چارەسەرێ دەگەڕان‌و زانییان کەدەبێ پادشایەکی بڕکابەر دابنێن کە دەستەڵاتی تەواوی بەسەر مادەکاندا هەبێ. وادەردەکەوێ کەخودی دیائاکۆ ئەم ڕێنمایی‌و ڕاگەیەندنانەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گرتبووە ئەستۆی خۆی‌و ئەندامانی هۆزەکانی لەم بارەوە هان دەدا کەدەست بکەن بەهەڵبژاردنی پادشایەك دەستەڵاتی تەواوی هەبێ.

زووتر وتمان کە دیائاکۆ بێزاربوو لە دەستەڵاتی سنووردارو کاتی. ئەو دەیویست بەناوی ڕابەر یا پادشای بڕکابەر لەسەر گشت هۆزەکانی ماد فەرمانڕەوابێ، چونکە بەوتەی هیرودۆت ئەوکاتەی ئەندامانی تیرەکانی ماد بەدڵگەرمیەوە وپێش لەدەستچوونی هەل دانیشتن‌و کۆبوونەوەیان ئەنجام

دەدا تا بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، دوو دڵبوون لەوەدا کەچ کەسێ بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێرن. بەڵام ئەو کەسە تەنها دیائاکۆ بوو کە لەلایەن هەموانەوە پێشنیاز کرابوو وجێی پەسەندی هەموان بوو، بۆیە لەم روەوە لەئەنجامی ئەم راوێژانەدا هەموو لەسەر ئەوە رێکەوتن کە دیائاکۆ وەك پاشای خۆیان هەڵببژێرن.

دوای ئەوە دیائاکۆ داوای لێکردن کە کۆشکێکی بۆ دروست بکەن، کۆشکێ بێ شایستەی پلەو پایەی پادشایی بێ. پتر لەوەش ئەو فەرمانیدا کەچ کۆشك و چ خۆی بەهۆی تیروکەوان بەدەستەوە بپارێزرێن. مادەکان بۆ گوێڕایەڵی لە پادشایەك کەخۆیان هەڵیانبژاردبوو لەو شوێنە کەخۆی بۆی دیاری کردبوون کۆشکێکی قایم و گەورەیان دروست کرد. دیائاکۆ ئەم دەستەڵاتەی وەرگرت کە لەنێوان تیروکەوان بەدەستەکاندا کارامەترین و بەئەزموونترینییان هەڵبژێرێ. ئەو دوای ئەوەی کە لەسەر تەختی پادشایی دانیشت، داوای کرد لەمادەکان کەشارێ دروست بکەن و بۆ ئەو مەبەستە هەموو توانای خۆیان یەکبخەن و تا ئەوکارە ئەنجام نەدرێ واز لەهەموو کارێکی دیکە بهێنن. مادەکان لەم روەیشەوە ملکەچی فەرمانی ئەوبوون و زۆر بەدڵگەرمیەوە لەسەر ئارەزووی پاشا دەستیان دایە دروستکردنی شارو بەناوی پایتەختەوە لەمێژوودا ناسرا.

ئەو شوورەی بەرزو قایمی دروست کرد وشارێکی بنیادنا کە ئەمڕۆ (ئەکباتانا)ی پێدەڵێن. لەم شارەدا شورەی بازنەیی چووە بەناویەکدا. ئەم بینا گەورە بەشێوەیەك دروستکرابوو کەهەر شورەیەك لەشووراکەی پێش خۆی بەرزتربوو. سەرزەوییەك کە ئەم شارەی بەم شوورە بەرزانەوە تێدا دروستکراتوە بریتییە لەگردێ. وادیارە کە خەڵکێکی زۆر لەم کارەدا بەشدارییان کردبێ و بۆ ئەوەی ئاستی شارەکە بەرزتربێ گردەکەیان

گەورەتر کردوە. ژمارەی شووره بازنەییەکان حەوتە. لەکام شووره کەزۆرتر کەوتۆتە ناوەوە کۆشکی پاشاو گەنجینەکانی تێدابوە. بەرزترین دیوار لەم ساختمانەدا بەرامبەر بەدیواری (ئاتن ئەثینا)یەکەتیبەو قەراغی هەر دیوارێ رەنگێکی تایبەتی هەبووە. یەکەمیان سپی، دووەم رەش، سێیەم سوور، چوارەم شین و، پێنجەم دیوار سوورێکی کاڵ، دوو شوورەی سەرپەڕ، یەکێ زیوین و ئەوی دی ئاڵتوونی.

ئەم بینایە کە دیوارەکانی بەم شێوەبووە دیائاکۆ بۆ کۆشکی خۆی دامەزراندوەو خەڵکیش بەچوار دەوریدا جێنیشتەبوون. کاتێ کاری دروستکردنی ئەم بینایە تەواوبوو دیائاکۆ ئەم فەرمانانەی دەرکرد: یەکەم فەرمانی ئەو ئەمەبوو کەنابێ هیچ کەس بچێ بۆلای پاشا یا بەگوزارشتێکی دیکە نابێ بچێتە دەرباری شا. هەموان دەبێ داخوازییەکانی خۆیان لەڕێگای ئەو کارگوزارانەوە کە پادشا دایمەزراندوون بگەیەنن پێی. نابێ کەس تەماشای پادشا بکا، هەرچەندە ئەم فەرمانە بۆ هەموان سووکایەتی پێکردن بوو. نابێ کەس بەرامبەر بەشا پێبکەنێ یا تف رۆبکاتە سەر زەوی.

ئەو بەم جۆرە خۆی لەبەرچاوی خەڵك دەشاردەوە، بەڵام دیارە ئەمە لەبەرئەوە نەبووە کە ئازاریدەروونی یاران و دۆستان وهاوتایانی خۆیبدا، ئەوانەی کە لەبنەماڵەیەکی ناشایستە نەبوون و لەپیاوەتی و پلەو پایەی کۆمەڵایەتیدا هیچیان لەو کەمتر نەبووە.

دیائاکۆ ئەوەی باش دەزانی کە ئەگەر ئازاری یاران و کەسانی دەوروپشتی خۆیبدا دوورنییە کە ئەوانە لەپایەی ئەو کەم بکەنەوە، لەبەرئەوە ئەو تەنها ئەوەی مەبەست بوو کە بەهۆی ئەم فەرمانانەوە خۆی وادەربخا کەئەو پیاوێکی ئاسایی نیەو لەگەڵ خەڵکیدا جیاوازەو ئەم لەخەڵکی لەبەرترەو تایبەتمەندی خۆی هەیە.

هیرودۆت واباس دەکا کە دیائاکۆ دوای جێبەجی کردنی ئەم فەرمانانەو دوای ئەوەی خۆی بە پادشای بێ چەندوچوون و سەرکەوتوو دانا، بڕیاریدا کەئەم یاسایانە دەبێ بەتەواوی جێبەجێ بکرێن. پێویستە ئەو خەڵکە سکاڵای خۆیان بنووسن و بینێرن بۆلای ئەو تا ئەو لێیبکۆڵێتەوەو رای خۆی لەسەر دەربڕێ و پێیان رابگەیەنێ. خۆهەر راوبۆچوونێکیش ئەو هەیبێ دەبێ جێبەجێ بکرێ و کەس سەرپێچی نەکا.

دیائاکۆ بەمجۆرە لەگەڵ دادگاکان و مافی خەڵکیدا دەیویست (داد) جێبەجێ بکا. هیرودۆت دەڵێ: ئەوکەسەی تاوانێکی بکردایە، بێشەرمی‌یەکی نیشان بدایە، لەفەرمانەکانی سەرپێچی بکردایە، بەگوێرەی تاوانەکەی سزا دەدرا. بۆ ئەوەی ئاگادارو شارەزابێ لەکارو کردەوەی ئەو خەڵکەی لەسنووری دەستەڵاتی ئەودا دەژیان سیخوڕو چاودێرێکی زۆری لەناو خەڵکیدا بڵاوەپێکردبوو کەئەمەش دووبارە یەکێبوو لەفەرمانەکانی ئەو.

دامەزرێنەری پادشایی مادەکان ئەم کارمەندانە(سیخوڕانە)ی وەك چاووگوێی خۆی بۆ ئاگاداربوون لەکاروباری وڵات دانابوو.

پێویستە بوترێ کە رێکخراوێکی سیخوڕی زۆر پێشکەوتوو لە سەردەمی داریووشی یەکەمدا(٥٢٢-٤٨٦پ.ن) بەچاولێکردن لەم هەنگاوە دانراوەو دەبێ ئەوە بزانرێ کە رەگ و ریشەی ئەو دەستگایە لەسەردەمی مادەکان و سەردەمی فەرمانڕەوایی یەکەم پادشای مادەوە سەرچاوەی وەرگرتوە.

# بەشی نۆهەم

# تیرەكانی مادو تایبەتمەندییەكانی ئەوان

بەپێی باسكردنی هیرودۆت مادەكان خاوەنی چەند تیرەیەكی فرەبوون. ئەو گرنگترینی ئەم تیرانە كەشەش تیرەی سەرەكیبوون و لەیەككگرتنی مادەكاندا بەشدارییان كردوە بەم شێوە باسی دەكا: تیرەی بووسیان(بووسەكان)، تیرەی پارتاكتەكان(پارتاكنیان)، ستڕۆخاتیان، ئاریزانتەكان، بوودەكان، ماگناكان(ماگنیان) دواتیرەیە كە بەوان تیرەی(موغان) وتراوە. ناوی موغ وەك پیاوی ئایینی لەدواییدا، لە مێژووی ئێراندا بەفراوانی و بەردەوام بەكار هێنراوە كە لەدواییدا باسی لێوە دەكەین یۆنانی‌یەكان ئەوانیان بەجادووگەرو چاوبەستكار دەناساندو بەموغ لەزمانی یۆنانیدا(ماگووس) دەوترا.

پیرینا گەرچی ناوی ئەو شەش تیرەی لەمێژووی هیرودۆتەوە وەرگرتبوو، بەلام هێشتا جیاوازییەكی كەم بەهەڵە هاتوە لەناوەكانی ئەم تیرانەدا بەرچاو دەكەوێ، كەئەو تیرەكانی ماد بەم ریزبەندییە دەناسێنێ: بووسەكان، پارتاكنەكان، ستروخاتەكان، ئاری سانتەكان، بوودەكان، موغەكان. بەپێی ئەم بنەمایە وەك لەهیرۆدۆتەوە دەگێڕنەوە وادەردەكەوێ كە لەپێش یەكپێگرتنی تیرەكانی مادەوە لەلایەن دیائاكۆوە (بەیۆنانی دیوكس)، كە مێژوو ئەو بەیەكەمین پاشای مادەكان ناودەبا، هەریەكە لەم تیرانە بەشێوەیەكی جودا لەیەك ژیاون و خاوەنی سیستمی رامیاری و كۆمەلایەتی سەربەخۆبوون. وەها دەردەكەوێ وەك هیرودۆت دەڵێ كە مادەكان لەپێش دروستكردنی دەوڵەتدا بەشێوەیەكی پچڕپچڕ ماوەی پێنج سەد ساڵ یا

نیوەی یەك هەزارە(لە ١٢٧٤-٧٥٤پ.ن) لەژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی ئاشووردا بوون، وەڵێ ئەمە لەنووسراوە گلێنەکانی ئاشووریدا پشتگیری لێنەکراوە.

بەپێی بۆچوونی هیرۆدۆت بۆماوەی پێنج سەدە لەبەشی سەرووی ئاسیادا فەرمانڕەواییان کردووە. ئەوانەی کە لەپێش هەمواندا لەکۆت و زنجیری ئەوان رزگاریان بوو مادەکان بوون. خەبات و جەنگەکانی ماد بۆ بەدەستهێنانی ئازادیبووەو لەم پێناوەدا کۆشش و خەباتێکی زۆریان کردووەو بوێرانە لەگۆڕەپانی تێکۆشاندابوون.

زۆر لەمیللەتان و هۆزو تیرەکانی دیکەش بەچاولێکردن لە مادەکان سەرپێچییان لە فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان کردووەو بەوتەی هیرودۆت تێکڕای دانیشتوانی کیشوەری ئاسیا ئازادی خۆیان لەکۆت و زنجیری ئاشوورییەکان بەدەست هێناوە. بەڵام هیرودۆت بۆ گۆڕانکارییەکانی دوای ئەم ئازادییە روویداو گەڕانەوەی مادەکان بۆژێر دەستەڵاتی ئاشوورییەکان ئاماژەناکاو تەنها ئەوەندە دەڵێ: کە مادەکان سەرلەنوێ ملکەچی مادەکان بوونەتەوە. وادەردەکەوێ کە مادەکان- وەك لەسەرچاوە ئاشوورییەکاندا هاتوە بەیەکجاری ملکەچی ئاشوورییەکان نەبوون و ناوبەناو لەژێر دەستەڵاتی ئاشوورییەکان دەردەچوون تا لەکۆتاییدا بەهۆی یەکگرتنیانەوە سەربەخۆیی خۆیان هێدی هێدی بەدەستهێناو لەپاشدا ئیمپەراتۆری ئاشووریان لەناوبرد.

لەنووسراوە بەردینەکانی ئاشووری لەمەڕ ژێردەستەبوونی مادەکان بۆ ئاشوورییەکان بەم جۆرە هاتوە:

تیگیلات پیلیسەر(فالازەر پیلیسەر)ی یەکەم، کە لەسنووری ساڵی (١١٠٠پ.ن) فەرمانڕەوای ئاشووربووە لەشکرکێشی کردوە بۆ چەند

ناوچەیەك کەبەپێی جوگرافیای مێژوویی دواتر بەشێ بووە لەسنووری مادەکان. ئەو لەزاگرۆس یا چیاکانی کوردستان تێپەڕی، بەڵام هیچ ناوی مادەکانی نەهێناوەو ناوەڕۆکی نووسراوەکانی ئەو لەپێرستێکی کورتدا باسی ئەو ناوچانە دەکا کەئەو بەهۆی لەشکرکێشییەکانیەوە خستوونیەتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە. سەلمانسەری دووەم(شەلم نەسەر) لەساڵی(٨٤٤پ.ز)دا لەگەڵ لەشکرەکانیدا گەیشتۆتە دەڤەری (نەمری) کەئێستا بەکوردستان ناسراوە، داگیری کردوە. پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کەئەم دەڤەرە زووتر بۆماوەیەکی دوورو درێژ لەژێر دەستەڵاتی بابلیەکاندا بووەو فەرمانڕەوایی بابلی ئەوێ ناوی(مەردوك مۆدەیك) بووە. ئەو فەرمانڕەوایە کە لەشکری ئاشوور هێرشیان برد، رایکردو گەنجینەو سامانەکانی کەوتە دەست ئاشوورییەکان و بووبە بەشێ لەدەستکەوتەکانی دەستەلاتدارانی ئاشووری. بەگوێرەی ئەم سەرچاوانە لەدوای هەڵاتنی فەرمانڕەوای بابلی سەلمانسەری سێیەم کە داگیرکەری ئاشووریبووە یەکێکی بەناوی (یانزو)وە کە لەکاسیەکان بووە بۆ فەرمانڕەوایی ئەم دەڤەرە ناردووە، وەلێ لەبەرئەوەی یانزو گوێڕایەل نەبووەو سەرپێچی لەفرمانەکانی سەلمانسەر کردوە، پاشای ئاشوور(سەلمانسەر) دووبارە لەساڵی(٨٣٨پ.ز)دا لەشکرکێشی بۆئەو دەڤەرە کردۆتەوەو بەم لەشکرکێشییە مەودای داگیرکردنەکانی ئاشووری بۆ باشووری ئێران درێژە پێداوە. ئەو یاخیبووان و سەرپێچیکەرانی ناچارکردوە بەخۆشاردنەوەلە جەنگەڵەکانداو ناوچەی نزیکی ئەم شوێنەی کە(پارسوا)یا(پارسوماش)بووە خستۆتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو بیست و هەشت ئەمیرو فەرمانڕەوای ئەو شوێنانەی دیل و ملکەچی خۆی کردوە. ئەو لەدرێژە پێدانی لەشکرکێشییەکەیدا تا سەرزەمینی(ئامادای) پێشڕەوی کردووەو گەیشتۆتە

دەڤەری(خەرخار) وێدەچێ کەخەرخار ناوچەی کرماشانی ئێستا بووبێ.
ئەو دەگەڕێ بەدوای(یانزوو)داو دەستگیری دەکاو دەیبا بۆ ئاشوور.

ئەم هەورازو نشێوە لەمەڕ میللەتانی ماد کەلەو ماوە مێژووییەدا هەبوە، واتا لەکۆتایی هەزارەی دوەم و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین، هەروەها لەسەدەی نۆیەمی پێش زایین، کە ئێمە تەنها لەگەڵ ناوی جوگرافی سەرزەمینی ماد(ئامادای)ئاشناین، ئەو هەورازو نشێوە دوای ئەو سەردەمەش هەربووە، چونکە سارگوونی دوەم(٧٢٢-٧٠٥پ.ز) بەگوێرەی سەرچاوە ئاشوورییەکان دیائاکۆی وەك دیلێکی جەنگ لەدوای تێشکان دوورخستۆتەوە بۆشام.

لەم روەوە لەسەرچاوە ئاشوورییەکاندا کەناوەڕۆکی ئەو کەم تازۆرێ لەگەڵ باس و هەواڵەکانی یۆنانیدا دەگونجێ بەم شێوە هاتوە: سارگونیدوەم(بەئاشووریی شاروکین) لەساڵی(٧٢٢پ.ز)دا لەگەڵ فەلەستین کەوتوەتە جەنگەوەو شاری(سامرە)ی داگیر کردوەو ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکی کوڕانی ئیسرائیل(بەنوو ئیسرائیل) بەدیل گرتووەو بردوونی بۆ ئاشوورو بەوپێیەی کە لەسەرچاوە ئایینیەکانی میللەتی یەهوود(تەورات)دا هاتووە، ئاشوورییەکان دیلەکانی جەنگیان بۆ شاری(کالح)و(خابوور) (لەسەر روباری جووران یا لەتەنیشت روباری جووران)و شارەکانی ماد بردوەو لەوێ جێنیشتەی کردوون. لێرەدا مەبەست لەشارەکانی ماد ئەو سەرزەمینانەیە کە لەسەردەمی تیگلات پیلسەری چوارەمدا خراونەتە سەر ئیمپەراتۆری ئاشوور. بەپێی هەمان بەڵگەنامە سارگونی دوەم چەند ساڵ دوای ئەو رووداوە لەگەڵ خەڵکانی(ماننای)دا کەوتۆتە جەنگەوەو پادشای ئەوان کە(دیائاکۆ)ی ناوبوە بەدیل گرتووە خەڵکانی ناوبراو لەئازربایجان و لەبەشی باکووری دەریاچەی ورمێ دەژیان و لەگەڵ مادەکاندا خزمایەتییان

هەبوە. پێدەچێ کەئەم رووداوە لە سەردەمێکدابووبێ کەهەندێ لەهۆزە ناسراوەکانی ماد لەیەکیەتی (ماننا)کاندا کەدژی ستەم و زۆری بەربڵاوی ئاشوورییەکان دروست بووبوو بەشدارییان کردبێ و دیائاکۆ وەك فەرمانڕەوایەکی جەنگی بزاڤی سەربازی و ئازادیخوازی و داوای سەربەخۆیی لەدژی ئاشوورییەکان رابەری دەکرد.

لەو سەردەمەدا نەدەتوانرا دیائاکۆ بەپاشای مادەکان ناوببرێ. دیائاکۆ، بەگوێرەی سەرچاوەی یەهوودی و ئاشووری و پشتگیری مێژوونووسانی یۆنانی، لەگەڵ ئەوەدا کە لەناو ئاشوورییەکاندا داباوبووە کە هەرکەس لێیان یاخی ببێ و ملکەچی فەرمانەکانیان نەبێ، نایەڵن بەسەر زیندووبێ کەچی ئەویان وەك دیلێ هێشتەوەو رەوانەی شام(حەمات-(حماه)یان کرد. هەندێ لەسەرچاوە مێژووییەکان دیائاکۆ بەهەمان کەس دادەنێن کە لەباسەکانی (هیرودۆت)دا بەناوی(دیوکس)ەوە ناوبراوەو بە یەکەم پاشای ماد ناوبراوە. یەکێ لەو بەڵگانەی پشتگیری لەم مەسەلە دەکا گومانی چون یەکبوونی ناوی دیائاکۆی پادشای ماد لەگەڵ ناوی هەمان کەسدا کە ئاشوورییەکان ئەویانبۆشام، بۆ(بیت دیائاکۆ) واتە ماڵی دیائاکۆ دوور خستبوەوەو لەوێدا دیل بوە. لەدوای ئەم شکستەی دیائاکۆو دەستگیرکردنی فەرمانڕەوا، بیست و دووکەس لەمیرو گەورەپیاوانی ماد کەوتن بەسەر دەست وپێی پادشای ئاشوورو سوێندی وەفادارییان بۆ خواردو سەرسپاردن و ملکەچی خۆیان پێ راگەیاند.

لەمەڕ دۆزی هۆزەکانی مادو بارودۆخیان لەپێش دروستبوونی دەوڵەتی مادا چەند باسێکی جۆراوجۆر بەدەست گەیشتووەو بۆئەم باسە جیاوازانە لێکۆڵینەوەیەکی زۆری دژ بەیەك ئەنجامدراوە بنەمای جیاوازی ئەم بۆچوونانە، شوێن و پێگەی ئەم هۆزانەو، بارودۆخی ناوچەکەیان، وباری

جوگرافـــی،شــــوێنی ژیانیـــان، هەل‌ومـــەرجی ناوچـــەییان‌و شــــێوەی بەرهەمـهێنانیان‌و باری ژیانیانـە. هــەندێ لـەو بـاوەڕەدان کەئـەم هۆزانــە لەسـنوورێکی زۆر فراوانــی جوگرافیـدا ژیـاون کـە لەباشــووری خۆرئــاوای دەریای مازندەرانەوە دەست پێدەکاو هەموو پارێزگای ئازربایجانی ئێستاو تەنانــەت بڕێ لـەپارێزگای گیـلان‌و کوردسـتان‌و کرماشانیشــی گرتۆتــەوە کەبـەوەوە نەوەستاوە بەڵکو ناوچەیـەك لـەناوەندی ئێران‌و سـەرزەمینەکانی (ڕەی)لـەم سـنوورەدابوون کەناوچـەی ئەصفــەهانی هەنووکـەش کەبـەپێی سەرچاوە دێرینەکان ناوی(پارتاکنا)بوە لەنێو ئەو سنوورەدابووە.

سەرانسەری لای خۆرهەڵاتی عیلام کەبەشی باشووری پارێزگای ئیلامـی ئێستایە دەبێ لـەم سنوورەدا بووبـێ. گومـان لـەوەدا نیـە کـەتیرەی موغـان‌و جێگـای دیاریکراویـان نـەبوە. ئـەندامانی ئـەم تـیرە بەشـێوەی کۆچـەری یـا کەسـانێ کەجێگـەو ڕێ‌و شـوێنیان تەنـها بـۆ ماوەیــەکی کــورت هــەبووبێ دووبارە بەجیاواز لەگەڵ خەڵکانی تیرەکانی دیکەدا کە بـەئاژەڵداری‌و ڕاوو هەندێ بە کشت‌وکاڵەوە خەریك بوون دابنرێ. گوتار دەربارەی ئەوەیە کە ئایــا ڕابـــەری ئـــەم یەکیەتییـــە واتـــە دیائـــاکۆ لـــەکام هۆزبـــوە؟ ئایـــا بەوتـەی(دیـاکونف)ە کە دەڵـێ ئـەو تەنـها گوندنشـینێك بـوەو بـەس کـە ئـەم بۆچوونـە بەتـەواوی ڕەت کراوەتـەوە. یـا بەوتـەی(هـیرودۆت)ە کەئـەو پلـەو پایـەی نـاوبژیوان‌و ڕابـەری کـەمێ لـەپێش دروسـتبوونی دەوڵـەتی مــاددا هـەبوە، کەبەم پێیـە دەبێ لە هـۆزی موغان بووبـێ‌و لـەم ڕووەوە لێکۆڵینـەوە بێ‌سوود نییە.

# بەشی دەیەم

# هونەری مادەکان

## ا- سەرەتا

ئەکباتان(Ekbatana)یا شاری هەمەدانی هەنووکە، پایتەختی مادەکان لەدروستکردنیدا چەند نیشانەیەکی زۆری لەپاشماوەکانی مادو هەخامەنشیان و پارتیان(ئەشکانییەکان) لەناوجەرگەی خۆیدا لێبەجێماوە. ئەم شارە هەردەم چاوەنواڕی دێریننناسان، توێژەران و ئاسەوارناسانە کەبەهۆی هەڵکەندنەوە چەند بەڵگەو نیشانەیەکی دیکە لەمێژووو هونەرو فەرهەنگی سەردەمە دێرینەکان بۆ خەڵکی بخەنەڕوو. وەك هیرودۆت دەڵێ توێژەران دەتوانن شاری ئەکباتان(هەمەدان) وەك پێوەرو نموونەیەك بۆ بیناسازی دروستکردنی شاری ئێرانی باس بکەن دۆزینەوەکانی سیلك(Sialk)و نووسینەکانی ئاشووری توێژەران لەو باوەڕە نزیك دەخەنەوە کە برێ لەم وێنەو نەخش و نیگاری ئاشوورییانە بەنیشانەی درەوشاوەی دروستکردنی شارەکانی ماد دابنرێ.

ئەکباتان وەك هیرودۆت دەڵێ(١٠٠-١٩٨) بەهۆی دیائاکۆ(Deiauko)وە داڕێژراوەو دروستکراوە. گۆڕانکارییە سیاسی و کولتوورییەکان و ڕووداوە سەربازییەکانی سەدەی هەشتەم و حەوتەمی پێش زایین بەڵگەو نیشانەی بەرچاون لەسەر فەرهەنگی پێشکەوتووی میللەتانی باکوورو خۆرئاوای ئێران و هەروەها دانیشتوانی خۆرهەڵاتی میزۆپۆتامیا(Mesopotamien). بەگوێرەی سەرچاوەو بەڵگەنامە بابلیەکان کە دەتوانرێ لەنێو ئەوانەدا پیرستی پادشایان و فەرمانڕەوایانی

سەرزەمینەکان بەدەست بهێنرێ، پەیوەندی بەرتەسکی کولتووری، بەتایبەتی سەربازی لەنێوان مادەکان، سکایان و کیمریاندا هەبوە.

هەندێ لەتوێژەران لەو باوەڕەدان کە دروستکردن و پەرەسەندنی بنچینەی هزری و هونەری مادەکان لەلایەن فەرهەنگ و پێوەرە کۆمەڵایەتی‌یەکان و یاسا سەربازییەکانی سکایان و کیمریان زۆر کاری تێکراوە. گوتار دەربارەی دامەزراندن و بنچینەی هونەری مادو سکایی و کیمریەکانە کە پێویستی بەهاوکاری خەڵکانێ بووە بۆ بەدەستهێنانی شارستانی کەڕەنگە لەلایەن (عیلامی-کاسپی)یەکانەوە داڕێژرابێت و هاتبێتە کایەوە.

## ب- هونەری بیناسازی (تەلارسازی)

لەمەڕ بیناسازی مادەکان شتێکی وەها لەبەردەستی توێژەراندا نیە، تەنها ژمارەیەك گۆڕی لەبەرد دروستکراو نەبێ کە پەیوەندی بەو سەردەمەوە هەیەو دەتوانن هزرێ لە بیناسازی ئەو سەردەمە نیشان بدەن. ئەم گۆڕانە لەدەروونی تاوێر هەڵکەندراوەو لەنیشانە بەرچاوەکانی تەختە بەردینەیەکە لەسەر پایە بەردینییەکان دانراوەو نەخشی بنمیچی گۆڕەکان تەواو دەکا. لەوانەیە مادەکان لەخانوو سازیشدا لەم جۆرە سەقفانە لەدەروازەی خانوەکانیان سوودمەند بووبێت. ئەو جۆرە بینایە لەهاویندا جڵەوی گەرمای زۆری خۆری گرتوەو لەزستاندا تێپەڕبوونی خۆر بۆناو خانوو ئاسان دەکا. هەخامەنشییەکان بۆ دروستکردنی تەختی جەمشید لەم شێوە بەهرەیان وەرگرتوەو هەنووکەش لەو دەڤەرەدا، لەو شێوازە پەیڕەوی دەکرێ. ئەو گۆڕانەی باسکرا خاوەنی یەك ڕاڕەوی دالان ئاساو دوو ژووری بچکۆلەبوون کەیا بەشێوەی دوونهۆم دروستکرابوون یا لەتەنیشت یەکەوە، لەدەروازەی دووەمدا دیوارێکی بچکۆلە لەیەکی جیاکردوونەتەوە. ئەم

گۆڕانە (قەبرانە) بۆ ناشتنی یەك یا سێ مردوو دەستی داوە(گەورەبووە). هەندێ لەم گۆڕانە چەند تاقێکی قووڵی تێدابووە بۆ ئەنجامدانی رێورەسمی قوربانی کردن لەو گۆڕانە گـۆڕی(دوککان داود)ە کە بەلای زۆرەوە وێدەچێ گۆڕی ئاستیاگ(Astyages)دوا پادشای مادبێ.

لەسەر دەرگای گۆڕەکان چەند هەڵکۆڵینێ هەیە لەناو بەردەکاندا بەرچاو دەکەوێ کە بەتایبەتی بۆ رازاندنەوەن. لەدەم دەروازەی (دوککـان داود)دا وێنەی پیاوێ دەبینرێ کـە لەدەسـتی چـەپیدا باقەیـەك لقـی گیـای پێیـەو دەستی راستیشی بەرەو ئاسمان بۆ پەرستن و نزا بەرز کردۆتەوە. ئەم شێوە خواپەرسـتی و پـەیرەوی ملکەچی‌یـە لەبەرامبـەر شـوێنە پیرۆزەکـاندا بەتێکڕایی لای عیلامییەکان باوبووە. ئاخافتن لەسەر ئەوەیە کە ئایـا ئـەم پیاوە وێنەکێشراوە موغێ یا پیاوێکی ئایینی بەرجەستە دەکا یا نیگاری خودی پیاوە مردوەکەیە؟ هەندێ لەتوێژەران بۆچوونـی دووەمیان پەسەند کـردوەو لـەوباوەڕەدان کـە ئەمـە نیگـاری خـودی ئەوکەسـەیە لـەو گـۆڕەدا نێـژراوە. لەلاسـەرووی دەرگـای گۆڕێکـی دیکـەوە، لـەنێوان کرماشـان و هەمـەدان، لـەنزیکی گونـدی(سـەحنە) کـە بـەزمانی خۆیـی(شـیرین و فـەرهاد)یا(فـەرهادو شـیرین)ی پێدەڵێـن، نەخشـی خـۆر لـەکاتی تیشـك پەخشکردندا دەبینرێ.

کاتێ مرۆڤ گۆڕستانەکانی(قزقاپان)و(سەکاوەند) لەگەڵ یەکدا بەراورد دەکـا، ئـەم پرسـیارە دێتـە کایـەوە کـە کاریگـەریی کولتـوورو هونـەری سکایی‌یەکان لێرەدا تاچ ئەندازەیەکە؟ وەگۆڕستانەکانی سەرەوە تاچ رادەیەك لەلایـەن هونـەری لوڕسـتانەوە کـاری تێکـراوە قزقاپـان لەبەرزاییـەکانی کوردسـتانی عـێراق لـەنزیکی گونـدی سورداشـەوەیە (Surdasch)و لەگۆڕسـتانە بەردینیـەکانی مادەکـان دەژمـێردرێ. لـەم گۆڕسـتانەو ئـەو

گۆڕستانانەی لەودەچن کوڵەکەو هەڵکەندنەکانی رووی بەرد هونەری سکایان بەرجەستە دەکەن. نموونەی ئەم کارەو بەراوردکردنی لەشوێنەکانی دیکەدا سەرنج راکێشەرە. لەم جۆرە هەڵکۆڵینانە لەباشووری رووسیاوە هەتا پشتی قەفقاز بەشێوەیەکی بەرچاو هەیەو جێگای سەرنجی دیرینناسان و توێژەرانی هونەرە دێرینەکانە. تێڕامانی ئەو وێنانەی لەسەر گۆڕستانەکانی باکووری رووسیاو دەوروپشتی قەفقازن ئەوە نیشان دەدا کە زۆربەی فەرمانڕەوایانی سکایی لەم گۆڕانەدا بەخاك سپێردراون و دەرەنجامی زانستی- مێژوویی لەمەڕ هونەرو چێژو وردەکاری هورنەرمەندانەی ئەم گۆڕستانانە ئەوە دەردەخا کەئەم گۆڕستانانە رێزو پەیوەندی فەرمانڕەوایانی سکایی سەبارەت بەپێشینانیان باس دەکا. بەگوێرەی ئەم تێڕامان و توێژینەوانە کاتێکی زۆر پێویست بوە بۆ ئامادەکردنی ئەم گۆڕانە.

**ج- گۆڕستانەکانی مادو رێورەسمی ناشتنی مردوو.**

لەیەکچوونی گۆڕەکان و تەنانەت رێورەسمی مردوو ناشتنی مادی- سکایی بەهۆی نەخشەکێشانی ئەم ئاسەوارە هونەرییانەوە دەتوانرێ دەستنیشان بکرێ. سێ چین سواغی ئاسك لەسەر رووی پایەی کورت، کەسەقفی گۆڕەکان دەپارێزن، سومبول و نیشانەی خوایانی جۆرن وەك میتراو ئاناهیتا. لەدەم دەروازەی ئەو گۆڕانەی کەپێدەچێ گۆڕی فەرمانڕەوایان بن وێنەی دووپیاو دەبینرێ، کەلەسەر دوولای سەکۆی ئاگردانەوە دانراون کەوانێکیان بەدەستەوەیە لە تیروکەوانی سکایان دەچێ.

هیرودۆت باسی ئەوە دەکا کە مادەکان تیر هاوێژیی کە تایبەت بووە بەجەنگاوەرانی سکاییەوە لەوانەوە فێربوون. کڵاو یا سەرپێچ لەنەخش و نیگاری سەر دەرگای گۆڕی پیاوانی ماد هەموو چون یەکن. جلی کورت یا

پالتۆی درێژ کەقۆلی درێژو فراوانیان هەیە لەسەر وێنەکان نیشانەیەکی دیکەی ئەوانە.

نموونەی ئاشکرای گۆڕی ناو ئەشکەوتی(قزقاپان) کەئەو وێنانەی باسکران بەتەواوی بەرجەستە دەکەن لەوانەیە بوترێ کەئەم شێوە جل‌و پۆشاکە بەشێوەیەك بوو کە ئەمڕۆش لەباکووری خۆرئاوای ئێراندا لەبەر دەکرێن. توێژەران لەو باوەڕەدان کەنەخش‌و نیگاری تیروکەوان نیشانەی دەستەلات‌و توانای پاشاییە. بەپێی ئەم ئەنجامە دەتوانرێ گومان لەوەدا نەهێلرێ کە لێی دواین موغێ(پیاوی رۆحانی) بەرجەستە ناکا بەڵکو فەرمانڕەوایێ یا جێنشینی فەرمانڕەوا دەنوێنێ. گۆڕە بەردینەکانی قزقاپان کەپەیوەندن بەسەدەی حەوتەم‌و شەشەمی پێش زایینەوە هەیە لە نموونە ئاشکراو بەرچاوەکانی ئەم شێوە ناشتنەی پاشایان‌و فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمەن.

لەسەکاوەند کە دەکەوێتە باشووری بێستوون لەسەر ئەو رێگا کە لوڕستان لەرێڕەوی شووش جیادەکاتەوە، دوو گۆڕ دیارن کە شێوەیەکی تایبەت‌و سادەیان هەیە. لەسەر دەرگای یەکێ لەوان نەخشی سەربەردی خۆیی بەرچاو دەکەوێ. ئەو نەخشە وەك هەموو نەخشێکی لوڕستان وایە. نەخشێکی دیکە یا وێنەیەکی لاوەکی لەوپەڕی سەکۆی ئاگرەکەوەیە. سەکاوەند لەناو خاکی لوڕستاندایەو تێڕامانی نیشانەکانی ئەم دوو گۆڕە مرۆڤ دەخاتە بیرکردنەوەی نیشانەکانی مادی‌و کیمیەری. بەڵگە بەدەستەوەیە کە ئەم دوو گۆڕە هی پاشایانی مادن. بەم جۆرەی ئێستا دۆزینەوەی خاوەنی ئەم گۆڕانە کەکێن لەسەر بنەمای مێژوویی پەیوەند بە پاشایان یا فەرمانڕەوایی دیاری بێگومان نابێ، وەلێ بەسەرنج لەجۆری

هونەرو تایبەتمەندییەکانی خەڵکی ئەوکاتە بۆ دیاریکردنی سەردەمەکەیان دوو دڵی نەگەرەکە.

لەمەڕ دیاریکردنی کاتی ئەم گۆڕانە تەنها بۆیەك سەدە یا نیو سەدە واتە پەنجا ساڵ لەوکاتە بەئاسانی ناخەملێنرێ، لەبەر ئەوە تایبەتکردنی هەر گۆڕەی بەپادشا یا فەرمانڕەوایەکەوە ئەستەمە. لەڕووی(کرۆنۆلوژی)یەوە ((ریزبەندی رووداوەکان))دەبێ ئەم گۆڕانە پەیوەندییان هەبێ بەنیوەی دوەمی سەدەی هەشتەمەوە یا نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمەوە لە پێش لەدایکبوونی مەسیحدا. ئەوی ئاشکراو روونەو چ لەرووی بنیادنانەوەو چ لەرووی کاتەوە تیۆرێکی راستە ئەوەیە کە نەخشەی وەك ئەم گۆڕانە لەئاسیای بچووك و زۆرترو نزیکتر لە(ئورارتو)بەدەست دەهێنرێ. ئەم خاڵە دەبێ لەبەرچاو بگیرێ کەلەم ناوچەدا لەپێش هاتنی مادەکان یا پێش وەرگرتنی دەستەڵات لەلایەن ئەوانەوە، تەنها یەك نموونەی گۆڕی بەردین. بەم شێوەو دارشتنە دروست نەکراوە.

لەتێرامان و لێکۆڵینەوەی ئاسەوارێ کەلەم دەستەڵاتەی سەر بەماد جێمابێ دەزانری کە زۆرتری بایەخی مێژوویی ئەو ماوە لەرووی فەرهەنگ و نرخاندنەوە لەوەدایە کە توانای مادەکان لەئامادەکردنی ئەو ئاسەوارەدا بایەخێکی زۆری هەیە. بەوتەی (گریشمەن) مرۆڤ نابێ نرخ و بایەخی ئەو ئاسەوارە بەکەم دابنێ. لەروویەکی دیکەوە ئەم جۆرە گۆڕانە چەند زەمینەیەکی نکوولی لێنەکراوە بۆ سەردەمی هەخامەنشی و گۆڕەکانی داریووش و جێنیشینەکانی ئەویش کەهەر لەم شێوەن روالەتی دیوارەکانی دەرەوەی ئەم گۆڕانە، لەیەکەم تێڕوانینەوە بەزۆری لەدیواری خانوو دەچێ. لەم رواڵەتەدا پادشا یا فەرمانڕەوا لەشوێنی پاسەوانێکدا (یاساوڵ)، بەرامبەر ئاگردانەکە راوەستاوەو وەك نیشانەو سومبولی پاشایی

تیروکەوانێکی بەدەستەوەیە. لەلاسەرووی ئەوەوە نەخشی خۆری هەڵاتوو بەرچاو دەکەوێ کە لەناوەڕاستی دەستەڵاتی هەخامەنشییەکاندا ئەم نەخشە بەشێوەیەکی دیکە وەك فریشتەیەکی باڵدار بەرجەستە دەکرا. بەهۆی سەرکەوتنی مادەکانەوە بەسەر ئاشوورییەکانداو فراوانکردنی سنووری ئیمپەراتۆری مادەکان و فراوانکردنی سنوورەکانی ئەم ئیمپەراتۆرییە تا ناوجەرگەی ئاسیای بچووك، رژانی سەرمایەو سامان لەدەڤەرێکی دەوڵەمەندەوە بەسەر ناوچەیەکی هەژاردا دەستی پێکرد. دەستکەوتەکانی ئەم سەرکەوتنە دەتوانرێ بەچەند شێوەیەکی جۆراوجۆر هەڵبسەنگێنرێن. شادی و خۆشی سەروەری مادەکان و شکۆو رێزیان کەبەهۆی ئەم سەرکەوتنە سەربازییە مەزنەوە بەدەستیان هێناوە بەتەواوی هەستی پێدەکرا پتر لەوە دەربارەی ئەم سەرکەوتنە دەتوانرێ بوترێ کەنەك تەنها سنووری جوگرافی ئیمپەراتۆری ماد فراوان بوو وبەس بەڵکو گۆڕەپانی پەیوەندییە هونەری و کولتوورییەکانیش لەهەموو لایەکەوە فراوانی بەخۆیەوە دی. بۆ نموونە دەتوانرێ هونەرمەندانی ئاڵتوونکاری(زەڕەنگەری) مادەکان باس بکرێن کە داریووش بۆ رازاندنەوەی کۆشکی نوێی خۆی لە(شوش) لە کارایی ئەوان سوودی وەردەگرت. وادەردەکەوێ کەهەتا پێش سەرکەوتنی مادەکان بەسەر ئاشوورییەکاندا هونەرمەندانی هونەری فلزکاری(کانزاکاری) شارەزایی و پسپۆری بەتایبەتی لەبواری کانزا گرانبەهاکاندا وەك زەرەنگەری لەشوێنەکانی دیکەدا فێربوون. گومان لەوەدا نیە کە ئەوانە لەلای هونەرمەندان و زەرەنگەرانی ئاشووری وماننایی و ئوراتوویی کە لەخزمەتی پاشایانی ئاشووردابوون ئەوکارە فێربوون.

گەرچی تا هەنووکە ئەم گومان و خەملاندنە هەبوە کە مادەکان لە دروستکردنی ئاسەواری هونەری و ئامادەکردنی کەرەسەی جەنگ و ئامێرو پێداویستەکانی راوو تەنانەت زین و لەغاوی ئەسپ و قاپ و قاچاغی ناومال لەکانزای مس و (برۆنز) و ئاسن و برنجەو چیکۆسازی سوودیان وەرگرتوەو ئەوانەیان بەکار هێناوە، بەڵام تا ئێستا بەڵگەو نموونەیەکی بەرچاو لەو روەوە بەدەست نەهێنراوە. هەروەها ئێمە ئاگادارین کە وردەشتەکانی بەرهەمی کارگەیی ئەوان، بێگومان بۆ چەند دەڤەرێکی زۆر دوورتر لەسەر زەمینەکانی ماد رەوانە کراون.

سلاڤییەکان ئەم جۆرە بەرهەمانەیان بەناوی مادەکانەوە بەجوان و باش لەقەڵەم داوە، چونکە(مس) لەزمانی رووسیدا(مدە)یە واتە کانزایەکە لەسەرزەمینی مادەوە هاتوە. ئەوە لەکاتێکدا بووە کە رووەمی‌یەکان ئەم کانزایەیان لەدورگەی(قبرس)ەوە هێناوەو ئەویان بەناوی جێی سەرەتای پەیدابوونی یا بەناوی وڵاتێ کە لەوێوە دەرچوە، واتە(کۆپرووم) ناویان لێناوە. زۆرتری شارەزایی توێژەران لەسنووری فەرهەنگی سەردەمی مادەکان لەبارەی هونەری ئەوانەوەیە. دەربارەی وێژە(ئەدەب)و زانستەکانی سەردەمی ماد شارەزایی‌یەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە. تێکڕای هونەری مادەکان لەرووی داڕشتن و شێوەی دروستکردنی ئەم ئاسەوارانەوە بەدووبەش دابەش دەکەن: بەشێ کە بەهونەری لوڕستان یا بەبرۆنزی لوڕستانەوە پەیوەندیدارە کە داڕشتنێکی سەرسووڕهێنەر بەیەکداچوو، بەتایبەتی وێنە چەماوەکانی زیندەوەران کە زۆربەیان خەیاڵین. بەشی دووەم بریتییە لەپاشماوەکانی گەنجی زیویە لەنزیکی سەقز کەوەك وتمان دەتوانرێ بە بەرجەستەکردنی هونەری مادەکان دابنرێ. بەگوێرەی چەند بەڵگەو نموونەیەك لەهونەری ئەو میللەتانەی شارستانیتربوون لە مادەکان

وەك ئاشوورییەكان، ماننائییـەكان و ئۆرارتووییـەكان، دڵنیـایی بەدەسـت دەهێـنرێ كـە هونـەری مادەكـان لاسـایی كردنەوەیەكـە لەهونـەری ئـەو میللەتانەی ناوبران. لەم زەمینەدا دەتوانرێ رازاندنەوەو نیشانەو نەخشی ئـایینی و پۆشـاك و وێنەكێشـان و نـەخش و نیگاری مـرۆڤ لەگـەڵ نموونـە ئاشـووری و ئۆرارتووییـەكاندا...هتـد بـەراورد بكرێـن و وەك یـەك تەماشـا بكرێن.

لەسەر بنچینەی توێژینەوەی دێریننـاسی توێـژەران لەزەمینـەی مێـژووی سـەردەمە دێرینـەكان، میللـەتانی خۆرهـەڵاتی وەك ئاشـوورییەكان و ئۆرارتووییـەكان لـەكاتی جـەنگدا خـاوەن كـارو پیشەوەرەكانیشـیان لەگـەڵ هـەموو دەسـتكەوتەكانی دیكـەی جـەنگدا بـۆلای خۆیـان دەبـردو لـەتواناو پسپۆری و دەسترەنگینیان بەهرەمەند دەبوون و شێوازی هونـەری شـێوەی جۆراوجـۆری تێدابـوو توێـژەران لـەو بڕوایـەدان كـە مادەكـان هونـەری تەلارسازی لەخەڵكانی(وان) پایتـەختی ئارارات(ئۆرارتـۆ) وەرگرتـوە چونكە لەمادەكانـەوە بینـاو بـەردو نووسـینی سـەربەردێ كـە بخوێنرێتـەوەو لێكۆڵینەوەی لەسەربكرێ بەجێنەماوە. دەربڕینی بۆچوونی لەمەفراوانتر كە وردەكاری ئەم چاولێكردنە نیشان بدا ئاسان نیە.

### گرنگترین ئاسەواری بەجێماو لەسەردەمی مادەكاندا بەم جۆرەیە:

١. شێرێ كە لەبەرد دروستیان كردوەو لەهەمەدانە. ئەم شێرە تا ساڵی ١٩٣٠ز بەپێوەبوەو وردە وردە ناتـەواو بـوەوو زیـانی پێگەیشـتووە، هـەندێ لەتوێژەران لەگوماندان كە ئایا ئەم جێماوە هـی مادەكانە یا پـەیوەندە بـە سەردەمی هەخامەنشییەكانەوە؟

٢. گۆڕێكـی لـەتاوێر هەڵكـەنراو لـەنزیكی سـەحنە(لـەنێوان كرماشـان و هەمـەداندا) كە لـەرووی دروستكردنی بەشـی نـاوەوەی پێچاوپێچـە لەسـەر

گۆڕەکەوەو لەلای سەرووییەوە لەسەر دەرگای گۆڕەکەنەخشی باڵداری خۆر کەنیشانەی فریشتەی ڕۆشنایی‌یەو لەخۆرهەڵاتی دێریندا زۆر باوبووە، دەکەوێتە بەرچاو.

٣. پەرستگا بەردیینەکانی(دوککان داود) لەسەر شەقامی نێوان کرمانشاو قەسری شیرین، هەروەها دوو گۆڕی ناوبراو بە قزقاپان و کوڕو کچ لەکەناری گردی شارەزوورو، تەنیشت دێی سورداش لەنزیك سلیمانی لەسەر ڕێڕەوی روباری زێی بچووك گۆڕی پەیوەندیدار بەپادشایانەوەیەو گومانی ئەوە دەبرێ کەقزقاپان گۆڕی کیاکساری سێیەمین شای مادو دوککان داود گۆڕی ئاستیاگ ی دواپاشای مادبێ. گۆڕی دوککان داود نزیکی سەرپێڵی زەهاوە. لەنیگاری بەرجەستەی دوککان داود وێنەی موغێك دەبینرێ کە کراسێکی درێژ دامێنی عیلامی لەبەردایەو باقەیەك گیای لەکاتی خواپەرستیدا لەدەستدایە. ئەتوانری ئەمە بەنیشانەی پەرستنی دیاردە سروشتییەکان لەناو مادەکاندا دابنرێ.

٤. گۆڕێکی دیکە لە لورستان، نزیکی سەرپێڵ کەناو دەبرێ بە ژووری فەرهاد بەناتەواوی ماوە.

٥. لەگوندی ئیسحاق ئاوەند، گۆڕێکی بچووك هەیە. نزیکی کرمانشاه، کەبەردێکی گەورەی تێدایەو وێنەی یەکێ لەکاتی خواپەرستیدا نیشان دەدا. لەمەڕ گەڕاندنەوەی ئەم شوێنەوارە بۆ مادەکان، مێژوونووسان یەك بۆچوونیان نییەو هەندێکیان بەپاشماوەی مادی نازانن.

٦. گۆڕێکی دیکە لەگەڵ نیشانەی فریشتەی باڵدار لەسەحنەی نێوان کرمانشاو هەمەدان.

٧. گۆڕێکی دیکەی گەورە لەنزیکی(میاندواو)لە شوێنەوارەکانی سەردەمی مادەکانە.

بەپێی ئەم باسە درێژە هونەری هەخامەنشی، بەتایبەتی هونەری بەردکاری و نەخش ونیگاری بەرجەستەو لەهەمووی گرنگتر هەڵکۆڵینی وێنەی زیندەوەران و خۆرو دیاردەکانی دیکەی سروشت، دەبێ لەچاولێکردن یا میراتی سەردەمی مادەکان بێ کەلەباسی هونەری هەخامەنشیدا لەو روەوە دەدوێین و وەك وترا داریووش شای هەخامەنشی لە هونەرمەندانی مادی سوودی وەرگرتوە.

چەند نموونەیەك لەگۆڕە بەردینەکانی سەردەمی ماد کەناسراون و دێریننناسان لەسەر ئەوە رێکەوتوون کە ئەوانە هی مادەکانن دەتوانرێ ئەم نموونانەیان لێ باسبکرێ:

یەك گۆڕی بەردینەی فەخرەکا Fachraka لەباشووری دەریاچەی ورمێ، کەزۆر دوور نییە لە(تەپەتەش)یا تەش تەپە(Tasch-Tepe) لەپارێزگای ئازربایجان. یەکێکی دی گۆڕی بەردینەی×فەرهادو شیرین)ە لە دەوروبەری شارۆچکەی سەحنە لە کوردستان.

چەند نموونەیەکی زۆرتری گۆڕە بەردینەکانی مادەکان لەنزیکی سەحنە ناسراون و بۆ هەندێکیان ئاماژەمان کرد. دەبێ وەبیر بهێنرێتەوە کە بەگوێرەی بۆچوونی دێریننناسان و توێژەران لەبارەی گۆڕەکانی مادەوە چەند روویەکی هاوبەش و چون یەکبوونێکی زۆریان لەنێواندا هەیە. هەر ئەو بەڵگە بۆ دیاریکردنی گۆڕە باسکراوەکان، بەتایبەتی گۆڕەکەی دوککان داود لەنزیکی شاری سەرپێڵی زەهاو، لەخۆرئاوای ئێراندا، لەسەر رێگای کرمانشاه- بەغداد، هیچ گومان لەوەدا ناهێڵێ کەهی مادەکانن و بۆ ئەوان دەگەرێنەوە.لەبەرئەوەی بەجیماوەی نووسراو کە پەیوەندی بەسەردەمی کۆنەوە هەبێ و زانیاری پێویست و کاریگەر دەربارەی مادەکان و ئاسەواری هونەرییان بەدەستەوەبدا کەمتر دەستدەکەون، بە بەراوردکردنی خودی

شوێنەوارە هونەرییەکان چ بریتی بێ لەکەل وپەلی خۆجوانکردن، قاپ و قاچاغ، دەفرە گلینییەکان، چەکەکانی جەنگ، ئامێری راوو پێداویستەکانی ناومالّ، یا بریتی بێ لەشوێنەواری تەلارسازی و گۆڕستانەکان، لەگەلّ شوێنەوارو نموونەکانی پێش دەستەلاّت و حکوومەتی مادەکان و نموونەی هاووێنەی ئەوانە لەسەردەمی هەخامەنشیدا، بەو بەراوردە دەتوانرێ تا رادەیەك وێنەیەکی هونەریی مادەکان بەدەست بهێنرێ. مێژوونووسان و سەرچاوە یۆنانییەکان کەدیارە بەسەرچاوەی مێژووی مادەکان دەناسرێن، تەنانەت لای ئەو سەرچاوانەش دەربارەی پادشایانی مادو پێناساندنی مێژووو لایەنە فەرهەنگییەکانیان جیاوازییەکی ئاشکرا لەڕاو بۆچووندا هەیە. لەم روەوە دەتوانرێ(کتزیاس) کە پزیشکی دەربارەی داریۆشی دوەم بەتایبەت شاژن پروشات، هاوسەری داریوش بووە، هەروەها پزیشکی ئەردەشیری دووەم کوڕی داریوشی دووەم بووە ناوببرێ کە دەردەکەوێ بەپێی بەلّگەنامەکانی گەنجینەی هەخامەنشی، مێژووی مادەکان جیاوازە لەگەلّ ئەوەی هیرۆدۆت دەربارەیان نووسیویەتی کە لەشوێنێکی دیکەدا لەوبارەوە دەدوێین.

# بەشی یانزەهەم

## گەنجینەکانی بەرهەمە هونەرییەکانی ماد

نموونەی بەرجەستەی ئەم گەنجینە(جەیحوون)ە. ئەم گەنجینە لانی کەم نەخشەیەك لەهونەری مادەکان دەخاتە بەردەست توێژەران. هەتا پێش لێکۆڵینەوەی وردی ئەم گەنجینە زانایانی شوێنەواری هونەری سەردەمی دێرین تەنها بۆ رادەربڕین ئەوەندەیان بەس بوو کە کێلانی ئاڵتوونی شمشێرێ کە لەمۆزەخانەی گەورەی بەریتانیایە وەك نموونە باس بکەن کە شوێنەوارێکە زووتر پەیوەندی بەگەنجینەی(ئەرس)ەوە هەبووە. نەخش یا گۆڕەپانی جەنگ کەلەوێدا دووسوار بەرمو تیروکەوان هێرش دەبەن بۆسەر شێرێ نیشانەی دەستڕەنگینی و جوانسازی هونەرمەندانی ئاڵتوونکاریی ئەو چاخەیە کە بێگومان فەرهەنگی هاوبەش و هونەری تێکەڵاو لەگەڵ توخمە گەلی ئاشووری، سکایی و ئورارتوویيدا بەرجەستەو ئاشکرا دەکا. کڵاوی پادشا، سەری بڵندەو تێکڕا سەری زیندەوەران نموونەیەکی ئاشکران بۆ پشتگیری لەهونەری تێکەڵاو کە مادەکان لەزۆر شوێندا بەجێیان هێشتووە. کۆنترۆڵ و توانای هونەرمەندان لەدروستکردنی ئەم شوێنەوارانە بەو شێوە جوانەی کە هەموو بینەرێ سەرسام دەکا،زۆرتری بەهۆی کاریگەریی هاوکاری ئەوانەوە بووە بۆ بەرهەمهێنانی پۆشاکی گونجاوو لەباری مرۆڤ پۆشاکی پاراستنی ئەسپ و شێوەی سواربوونی وڵاخەکانیان، لایەنی وێژەیی، کولتووری، هونەری و نەتەوەیی نیشان دەدەن.

لەمەڕ هونەری مادەکان دەتوانرێ بوترێ کە لەگەشەکردنی هونەری میللەتانی دیکە بەشێوەیەکی دروستکەرو تێکەڵاو سوودمەندبوون.

لێکۆڵینەوەی وردترو قووڵتری گەنجینەی ئەرس ئەو توانایە لای توێژەران دروست دەکا کەپەی ببەن بە بوارەکانی هونەر لەپێش دەستەڵات و حکوومەتی هەخامەنشییەکانداو شارەزای ئەم خاڵە بن کە لەچ سەردەمێکدا هونەری زۆرجوانی کانزا بەکارهێنان، بەرجەستەکردنی نەخش و نیگاری روون لەمەیدانەکانی جەنگ، هەڵپەرکێ و سەما، جەژن و ئاهەنگ- هتد لەئێراندا باوبووە. بێگومان لێکۆڵینەوەی ئەم بەرهەمە هونەرییانەو ئەوشتانەی لەناو گەنجینەی ئەرس دایە وێنەیەکی بەرفراوانتر لە کەلتووری هونەری یەك سەردەمی مێژوویی فرە بایەخدار پێشکەشی توێژەران دەکا کە لێرەدا ئێمە خۆمان خەریکی لێکۆڵینەوەی تەنها بەشێ لەم کۆمەڵە کۆکراوە دەکەین کە رێنماییمان دەکا بۆ بارودۆخی فەرهەنگی هونەر لەسەدەکانی هەشتەم و حەوتەمی پێش زاییندا. ئەوەشمان لەیاد نەچێ کەئەم گەنجینە چەند پارچەیەکی پەیوەندیدار بەسەدەی چوارەمی پێش زایینیش دەگرێتە خۆی کە لەرووی داڕشتنی هونەری و جۆری دروستکردنیانەوە جوانترن. ئەم باسە لەمێژووی سەدەی چوارەمی پێش زایین لەلایەن شارەزایان و دێرینناسانەوە پشتگیری لێکراوە. بەتوێژینەوەیەك دەربارەی ئەم بەرهەمە هونەرییانە هەنووکەش دەتوانرێ رێگاو جێگای تەواوی ئەم گەنجینە دیاری بکرێ. گوتار دەربارەی سەرگردێکە لەباختەری دێرین لەلای راستی روباری ئەرس یا(ئاموودەریا) کەبە(تەختی قوباد) یا نشینگەی قوباد ناسراوە.

ئەم گەنجینە دەیەها پارچەو قاپ و میلی ئاڵتوونی تێدایە کە بەکەرەسەی زۆر وردو قایم و نووك تیژ وێنەکانی هەڵکۆڵراون. لەم وێنانەدا نەخش و نیگاری گیانلەبەران و گیا(وەك لقێ یا باقەیەك) هەروەها گوڵ و دەستەگوڵ و

مەرکانەو گۆزەو قاپی زیویان تیا بەدی دەکرێ. ئەم قاپ و سینییە پڕ لەنەخش و نیگارانە لەلایەن خواپەرستانەوە لەپەرستگاکاندا دانراون. خاوەنەکانیان ئەم پارچانەیان بەخودا بەخشیوەو بەرامبەر بەوەداخوازییان لای خودای جۆرەکان پێشکەش کردوە. ژنان بەئومێدی منداڵبوون، ئاژەڵدارەکان بەئومێدی زۆربوون و بەچکە خستنەوەی ئاژەڵەکانیان، وەستایانی گۆزەو گلێنەو زەڕەنگەرەکان کەقاپێ یا گۆزەیەك یا مەرکانەیەکیان پێشکەش کردبێ بەئومێدی سەرکەوتنیان بووە لە کارەکانیاندا. هەروەها سەربازان دیاری لەم جۆرەیان پێشکەش بەخودایان دەکرد بەئومێدی سەرکەوتنیان، لەجەنگدا لەگەڵ دوژمنداو زاڵبوونی چەکەکانی ئەمان بەسەر دوژمنەکانیاندا.

پەیبردن بە بایەخ و چۆنیەتی هونەری ئەم پارچانە بەگەورەو بچووکیەوە لەپەراوێزدایەو ئەوەی گرنگە نرخی ئەو کانزا بەکارهێنراوانەیە لەواندا. ئەو کارگانەی لەتەنیشتی پەرستگاکان یا لەنزیکییان و شوێنە نزیکەکاندابوون ئەوە دەگەیەنن کە ئەم بەرهەمە هونەرییانە هەر لەوجێگەدا ئامادەو ئەنجام دراون و لەقاڵبی جۆراوجۆردا بەرهەم هێنراون و خراونەتە روو، تا هەموو کڕیاران و پەیوەندیداران لەو ناوەدا کۆببنەوە. لەڕاستیدا دەبێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندیداران تەنها نرخی ئاڵتوونیان دەخەملاند نەك گرنگی کار. پێدەچێ کە پەرستگای(سورخ دەم)یش لە لوڕستان، لەم جۆرە کارگانەی هەبووبێ، چونکە پێداویستیەکانی ئەم پەرستگایەش بەدیاری و پارچە بەخشراوەکان دابین کراون. برۆنزی لوڕستان و قاپی ئاڵتوونی ئەم شوێنانە بەتایبەتی بەهۆی سەوداو(مامەڵە)ی ئاسەوارە دێرینەکان و کڕین و فرۆشتنی ئەو شتانەوە دادەنران کە لەڕووی شێوەی ئامادەکردنیانەوە زۆر لەئاسەواری گەنجینەی ئەرس دەچوون. بۆ نموونە دەتوانرێ بۆ چەند

نوێژکەرێ ئامارژە بکرێ کەلەکاتی خواپەرستیدا راوەستاون، دەستیان بەرزکردۆتەوەو خەریکن قاپێ یا گۆزەیەك یا مەقالییەك پێشکەش بەخوایانی جۆر دەکەن. یەك سینی سەردەمی گەنجینەی ئەرس نوێژکەری نیشان دەدا کەچەند لقی گیای لەناو دەستی ڕاستیدایەو هاوکات بەدەستی چەپی پالی داوە بەزیارتگاکەوە. گواستنەوەو بەردەوامی ئەم داڕشتنە هونەرییە لە مادەکانەوە بۆ سەردەمی هەخامەنشییەکان دەتوانرێ لەنەخشێکدا بەدی بکرێ کە باجدەران بەڕێزەوە زۆربەیان بەشێوەی چەند شتێکی بەنرخ و بایەخدارن وەك کەرەسەی راوودەفرەکان....هتد کەلەدەم دەروازەی میللەتاندا لەتەختی جەمشیددا بەرچاو دەکەون.

بێجگە لەمە باجدەرانی دەولەتی هەخامەنشی لەسەر رووی سینییەکی ئالتوونی نەخش کراون کە کلاوی سەریان لەنەخش و نیگاری پەیکەری خوداکان دەچێ کە لەبرۆنزی لوڕستاندا بەرچاو دەکەوێ. ئەمە وەك درێژە پێدانی ئەم جۆرە داڕشتنەیە لەدروستکردنی پاشماوە هونەرییەکان بەوشێوەی لەسەردەمی ئەو جیاوازییانەی کە لەکەلوپەلی باجدەرەکان و کلاوی سەریان بەدی دەکرێن گرنگییەکی تایبەتیان هەیەو زۆر جێگای سەرنج وتوێژینەوەن. ئەم جیاوازییانە لەشێوەی دەرکەوتووی پۆشاکی ئەواندا تەنها نیشانەی پەیوەندی ئەوان بەچینێکی تایبەتەوە نییەوبەس بەلکو نیشاندەری سنووری هۆزو تیرەکانیشن کەهەریەکە لەئەندامانی ئەو تیرەو هۆزانە پۆشاکی تایبەتی خۆیان هەبوە. تەنها یەك قاپی بچکۆلەی ئالتوونی قایم و قوڵ کە لەشێوەیەکی جوانی لوولەییدا دروستکراوەو پاشماوەیەکی بەنرخەو کارێکی زۆری پێویست بووە تا بەدەست هاتووە، بێگومان کەسایەتییەك نیشان دەدا کەخاوەنی پلەوپایەیەکی بەرزە. ئەمە یەك داڕشتنی هونەری مادەکانە کە ئەم کەسایەتییە بەشێوەیەکی روون

بەهۆی ئەو نیشانە دیاریکراوەیەوە لەسەر پشتێنی بادراو بەدەوری جلەکانیدا بەرجەستە دەکا. بەپشتێنەکەیەوە یەك شمشێری کورتی سکایی هەڵواسراوە. لەسەر سەری ئەم پیاوە یەك کڵاو بەشێوەی کاسکێت و لەپێیدا چەکمەیەکی درێژ هەیە. لەسەر رووی چەند پەیکەرێکی دیکە نەخش و نیگاریێ کەزۆر روون و ئاشکرا نییەو شایستەی توێژینەوە نییەو وەك ئەم سینی یە وردەکاری تێدا نەکراوە، جلێکە لەبەر پیاوێکدا کەوەك کراسێ وەهایە رەق و قایم دروستکراوەو دامێنێکی هەیە لەچەرم بۆی کراوە. هیرودۆت کڵاوەکەی سەری لەجۆری خوودە یا کڵاوێ سێ خەتی تێدابێ باس دەکا کەنموونەی ئەوە لەپاشماوەکانی برۆنزی لورستانیشدا دەبینرێ. پتر لەمانە ئەم باجدەرانە کەباجی خۆیان پێشکەش دەکەن کڵاوێکی ئاسایی یان لەسەرکراوە کەلەو کڵاوە دەچێ باجدەرانێ لەسەریان کردوە کەخەریکن باجی تەختی عاج پێشکەش دەکەن کەئەو تەختە هی (ئاسار هادوونی) پادشای ئاشوور، کوڕی سەنخەریب و باوکی ئاشوور بانی پاڵ بووە. هەروەها وێنەو بەڵگەی دیکەمان هەیە لەسەر پەیوەندییەکی بەرتەسکی هونەری نێوان میزۆپۆتامیا وەك ئاشوور لەگەڵ هونەری مادەکانداو درێژەپێدانی ئەو پەیوەندییە لەسەردەمی هەخامەنشییەکاندا بەدی دەکەین. نەخشی ئەسپ لەسەر رووی ئەم سینی و قاپانە وادێتە بەرچاو کە ئارەزووو خواستی یەکێ نیشان بدا کە لەکاتی خواپەرستیدایەو ئارەزوومەندی ئەوخوامێچکەی جۆرەیە کەپارێزەری گەلە ئاژەڵ و چوارپێیە.

لەوانەیە ئەو خوامێچکە(ئاشی)بێ. لێرەدا ئەم مێچکەخوای جۆرە وەك خوایەکی بەتوانا کەپارێزەری هەموو گیانلەبەرانی بەسوودە وەك ئەسپ کەهەڵگری کەرەسەی گرنگی جەنگ و گواستنەوەی ئامێرو عەرەبانەیە،

هەروەها گاو گوێرەکەو تەنانەت حوشتریش کەبۆ پاراستنی ئەوانە ئەو خوایە جێگای پەرستن و نزایە. ئەم مێچکەخوایە پێشینەیەکی لەسەرچاوە ئەفسانەییەکانی ئایینە دێرینەکانی ئێراندا هەیەو لەلای ئارییەکان جێگای پەرستن بووە. لەتەنیشتی ئەم مێچکەخوایەوە چەند خوایەکی دیکەی جۆر هەیە کە هەریەکەیان دەستەلاتداربوون بەسەر سنوورێکی دیاریکراودا لەژیانی مرۆڤ و سروشت بۆیە پەرستوویانن.

دیارە ئەم خاڵە دەبێ رەچاوبکرێ کەبەسەرنجدان لەم زانیارییانەی ئێستا لەبواری توێژینەوەی پاشماوە هونەرییەکانی ئێرانی دێرین بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان هەیە بەسەردەمی مادو هەخامەنشی‌یەوە هەل‌ومەرجێ دێتە پێشەوە کە دەستنیشانکردنی بەجێماوی هونەرێکی مادەکان و جیاکردنەوەی لەبەجێماوی هونەرێکی سەردەمی هەخامەنشی سەخت و دژوار. ئاشکرایە کە پاشماوەکانی هونەری پەیوەندیدار بەکۆتایی سەردەمی مادەکانەوە لەگەڵ هونەری سەردەمی پاشایانی سەرەتای فەرمانڕەوایی هەخامەنشی زۆر لەیەکدەچن. ئەمەش پێویستە رەچاو بکرێ کە گەنجینەی ئەرس بەتێڕامان لەجوگرافیای ئەوسەردەمە لەدەرەوەی ئێران بەدەست هاتووە شوێنێ کە بەئاسانی ناتوانرێ بوترێ ئەوەیە کەمادەکان یا ئێرانییەکانی خۆرهەلات کامیان بەشداری گرنگیان هەبوە لەداهێنانی ئەم ئاسەوارانەداو بەبۆچوونی دێرینناسان و پسپۆرانی مێژووی ئێران مێژووی هونەر چ مادەکان و چ ئێرانییانی خۆرهەلات کە لەدەرەوەی سنووری ئێراندا دەژیانهەردوو خاوەنی دەستڕەنگینی هونەری و چێژو سەلیقەبوونو توانای جوانسازییان هەبوە.

نموونە ئاشکراکانی هونەری مادەکان لەچەند بەجێماوێکی هونەریدا بەرچاوو ئاشکران. لەوانە دەتوانرێ چەند پارچەیەك ناو ببرێن کە

لەساڵی(١٩١٣ن)دا لەلایەن دەستەیەکی دێرینناسی فەرەنسەوی لەهەمەدان دۆزرانەوە. لەناو ئەوانەدا لە هەمووی سەرنج راکێشتر یەك قۆرێیەکە وەك ئەو پارچە وایە لە لورستان بەدەست هێنراوەو لەمۆزەخانەی لۆڤەری پاریس دایان ناوە. تەنها خاڵێ کە دەتوانرێ لەبەراوردکردنی ئەم دووشتەدا بوترێ ئەوەیە کە کاتی دروستکردنی قۆرییە بەدەستهێنراوەکەی هەمەدان، لەو قۆرییەی دۆزراوەتەوە لە لورستان نوێترە، وەلێ هەردووکیان پەیوەندییان بەسەردەمی مادەکانەوە هەیە. پشتیوانی ئەم تیۆرە نیگاری یەك باجدەرە کەیەك قۆری کانزایی بەدەستەوەیەو لەکۆشکی ئاپادانا لەتەختی جەمشید دەبینرێ. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە درێژەپێدانی هونەری ماد لەسەردەمی هەخامەنشیدا یەك پێگەو جێگەی قایمی هەبوە، گەرچی لەنەخشی سەرەودا ئەو باجدەرە لەسەرخاکی ما دابووەو لەسەردەمی هەخامەنشییەکاندا باجی خۆی داوە. جگە لەوە لەگۆڕستانەکانی لورستاندا جۆرێ قاپی برۆنزی بەدەست هاتووە کەچونیەکی زۆر نزیك لەنێوان هونەری مادەکان و برۆنزی لورستان دەسەلمێنێ.

لە بەدواداگەڕانی هەمەداندا پەیکەری(حەوت قۆچ)، (قۆچ مەڕی شاخدارە) دۆزراوەتەوە کە لەگەڵ یەکتردا زۆر لەیەك دەچن و بێگومان لەئاسەواری هونەری مادەکانن. لەم دواییەشدا یەك جامی زێڕین خراوەتە مۆزەخانەی(سین سیناتی) کە بەشێوازی دارشتنی مادەکان(کیمیەری و مادی سکایی) دروستکراوەو لەهونەری بەکارهێنانی نەخش و نیگاری زیندەوەرانی سەردەمی هەخامەنشییەکان دەچێ پێویستە ئەم خاڵە رەچاوبکرێ کە گواستنەوەو بەردەوامبوونی هونەری مادەکان بۆ سەردەمی پارسەکان لەڕاستیدا ئەم دیفاکتۆیە دەردەخا کەدارشتن و دروستکراوی

بەجێماوی هونەری کیمیەری و سکاکان کە لەڕێگای مادەکانەوە بەوان گەیشتووە کاریگەربووە بۆسەر ئاسەواری هونەریی هەخامەنشییەکان.

هەندێ لەشارەزایان مێژووی هونەری ئەو جامەی لەمۆزەخانەی سین سیناتی‌یە بۆ سەردەمی هەخامەنشی دەگەڕێننەوەو هەندێکی دی ئەوە بەیەك پاشماوەی هونەریی تێکەڵی مادو هەخامەنشی دەزانن. گریشمەن لەو باوەڕەدایە کە بەسەرنج لەتایبەتمەندیی هونەری مادو رووی جیاوازی ئەو هونەرە لەهەندێ شوێندا لەگەڵ هونەری هەخامەنشیدا دەتوانرێ سەردەمی ئەم ئاسەوارە بەنێوان سەدەی حەوتەم و سەدەی شەشەمی پێش زایین بخەملێنرێ و بەنیوەی دوەمی تەمەنی ئیمپەراتۆری ماد دابنرێ. لەکاتێکدا ئەم جامە لەهەمەداندا دەست کەوتبێ دەبێ وەهای بۆبچین کە لەکۆشکی پادشایی ئەکباتاندا بووبێ و هەخامەنشییەکان دەستیان بەسەر ئەو کۆشکەدا گرتبێ و هەرچی تیابووبێ لەقاپ و ئامێرە جوانەکان هەموویان بردبێ بۆ خۆیان. وێنەی دارشتنی ئەم جامە کەپەیوەندی بەسەدەی هەشتەم و حەوتەمی پێش زایینەوە هەیە لە لورستان بەدەست هاتووەکە لەمۆزەخانە تایبەتمەندییەکاندا دەپارێزرێ.

هەروەها سەردەمی جامی ناسراو بەجامی(کەلار دەشت) کەنەخشی دووشێری مێ، لەسەر هەردوولای جامەکە دەبینرێ بەسەدەی هەشتەم و حەوتەمی پێش زایین دەزانرێ و لەمۆزەخانەی تاران دەپارێزرێ.

لە(کەلاردەشت)دووبارە چەند قاپێکی ئاڵتوونی دیکە بەدەست هێنراوە کە دەتوانرێ بەخولی پێش تا ناوەڕاستی مادەکان واتە لەنێوان سەدەی نۆهەم تا حەوتەم دابنرێ و بەسەرنجدان لەوەی کە مادەکان لەکۆتایی سەدەی هەشتەمەوە لەپێش زاییندا دەستەڵاتیان وەرگرتووە خەملاندنی ئەو سەردەمە بۆ ئەو ئاسەوارە دەگونجێ.

لەگەڕان بەدوای شوێنەواردا لەناوچەی کەلاردەشت یەك خەنجەری زێڕین دووبارە دۆزراوەتەوە کە نەخشەکانیلەنەخشی خودایان دەچێ کەلەسەر رووی چەکە. بچووکەکانی برۆنزی(پشت کووە) دەبینرێ. ئەم خەنجەرە کە لەسەر شێوەی کێردێکی نووك تیژو لەناو کێلانێکی هێڵدار دایە لە مۆزەخانەی تاران دانراوە.

لەناوچەی ناوەڕاستی کێوەکانی ئەلبورز لەدۆڵێکدا لەناوچەی کەلاردەشت یەك جام لەسەر وێنەی فیلەگێژە کە لەگەڵ دروستکراوە بەدەست هێنراوەکە لەگەڵ ئاسەواری هونەری بەدەستهێنراو لە سیەلك، خوروینو لوڕستاندا کەمێ جیاوازی هەیە. ئەم ئاسەوارەو هەر ئاسەوارێکی دیکەی هونەری کەلەوبچێ پەیوەندن بەسەردەمێکەوە کەنەخشی ئاسکی شاخدار لەسەر قاپ یا دروستکردنی پەیکەری ئاسك باوبووە. لەلایەکی دیکەوە دەبێ ئەوە رەچاو بکرێ کەئەم جامە ئاسك وێنەیەو هەرچی لەو بابەتەیە لەفەرهەنگی سکایاندا چ نەخشێکی گرنگو سەرنجڕاکێشەری لەسەر دروستکراوە!. پرۆفیسۆر گریشمەن لەو باوەڕەدایە کە لەکاتی تاجگوزاری شازادەکانی سکاییدا، خوامێچکەی سکایی بۆ پشتیوانی لەوکەسەی تاج دەخرێتەسەر سەری ئەم جامەی لەباتی تاج بەگونجاو زانیوە. ئەمەش دووبارە نموونەیەکە لەهونەرە هاوبەشەکانی مادو سکایی، بەلام لەسەردەمی مادەکاندا ئەم جۆرە جامە لەباتی تاج بۆ پاشاکان بەکار نەهێنراوە.

## گەنجینەی( زێوێ ) دیارترین گەنجینەی هونەری مادەکان:

پێشینەی مێژوویی گەنجینەی زێوێ بۆ یەکەمجار لەساڵی١٩٤٧ز بەرێکەوت لەلایەن جوتیارانی ئەو دەوروبەرەوە دۆزراوەتەوە. گوندی زێوێ لەنزیك شاری سەقزدایە، لەباشووری دەریاچەی(ورمێ). ئەم دەڤەرە لەسەدەی حەوتەمی پێش زاییندا پەیوەندبوە بەدەوڵەتی ماننائییەکانەوە. دەوڵەتی مانناکان لەگەڵ مادەکان، دژی ئاشوورییەکان یەکیان گرتبووو ئەم دەوڵەتە بەدەستی ئاشوورییەکان شکستیان هێنا. لەساڵەکانی(٦٦٠)یا(٦٥٩پ.ن) ئەم ناوچەیە لەلایەن سکایانەوە دەستی بەسەردا گیراو خرایەسەر سەرزەمینی ئەوان.

سکایان لەدواییدا ناوچەی سەقزیان کرد بەشوێنی سوود وەرگرتن بۆ فەرمانڕەوایی لەسەر مادەکان و لەوێوە هێرشیان دەبرد بۆ سەریان و دزییان دەکرد. بەپێی ئەم بەڵگەیە هەرچەندە سەلماندنی ئەوە ئاسان نایەتە بەرچاو. بەڵام دیارە وشەی سەقز(Sakkes) لەگەڵ کۆی(سکا)دا لەیەکەوە دوورنین. پاشماوەکانی گەنجینەی زێویە ئەوە نیشان دەدەن کە سوارەی سکایی لەم ناوچەدا جێنیشتەبوون، وەلێ ئاسەوارێ لەمەڕ پێکهاتەی رامیاری و کارگەی هونەری بەدەست نەهێنراوە.

خەریك بوون بەمەسەلە مێژوویی و جوگرافییەکانی ئەم ناوچە لەبەر ئەوەیە کە نەخشەو کاریگەری فەرهەنگی هەردوو دەستەڵاتی رکابەری ئاشوورو ئۆرارتۆ لەسەرزەمینی ماد روون بکەینەوەو هونەری ئەوان لەنێو مادەکاندا زۆر جێی سەرنجڕاکێشانە. ئاماژەکردن بۆئەم پەیوەندییە رامیاری و سەربازییە لەو روەوە سەرنج رادەکێشێ کە لەدوای سەرکەوتنی هووخشترە(کیاکسار ٦٣٣-٥٨٤پ.ن) پادشای ماد بەسەر(مادیس) کوڕی(بەرتاتوا)دا سکایان چییان کردو حکوومەتەکەیان چی بەسەرهات؟

ئایا هێنایەوە کە لەوەوپێش بەسەر دەوڵەتی ماننایاندا بەدەستیان هێنابوو؟ بێگومان هەندێ لەسەرچاوەکان بەگومانەوەو هەندێ بەدڵنیاییەوە مێژووی سەرکەوتنی سکاکانیان بەسەر ماننانکاندا بەساڵی ٦٢٥پ.. لەقەڵەم داوە.

هیرودۆت بەروونی بۆچوونی خۆی دەرنابڕێ وەڵێ زۆرتری لەو باوەڕەدایە کە لەدواییدا سکایان بەدەستی مادەکان شکستیان هێناوەو سەرزەمینی ماننانکانیان لەدەست داوە. وەڵامی دروست بۆ ئەم پرسیارەو گەیشتنە ئەنجام بۆ پەیبردن بەکات و سەردەمی ناشتنی فەرمانڕەوایی سکایی لەزیوێ بایەخێکی زۆریان هەیە. وادیارە هەموو سکایانی کۆچکردوو لەڕێگای کێوەکانی قەفقازەوە بۆ ناوچەکانی دیکە نەگەڕاونەتەوە بۆ سەرزەمینی خۆیان.

بەوپێیەی کە لەساڵنامەکانی بابلیدا، دەربارەی ساڵی ٦١٥پ.ز هاتووە، وادێتە بەرچاو کە سکایان وەك هاوپەیمانی مادەکان لەناو سوپای مادەکاندا ڕێ و شوێنیان دیاری بووە. دیارە ئەم یەکگرتنە لەقازانجی سیاسەتی سکایاندا بووە. بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان(بەڵام زۆر بەدڵنیاییەوە نا) ئاشوورییەکان نەیانتوانیوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دۆستایەتی سکاکان لەگەڵ خۆیاندا بپارێزن کەئەمە بەقازانجی مادەکان گەڕایەوە، ئەو مادانەی دەوڵەتی ئاشووریان لەناوبرد. هەندێ، گرنگترین هۆی ئەم لەناوچوونەیان بە درێژە پێنەدانی دۆستایەتی سکایان لەگەڵ ئاشوورییەکاندا لەقەڵەم داوە. شارەزاییەکی تەواو دەربارەی مانەوەی دەوڵەتی سکایان لەدەستدا نییە. وەڵێ ئەم گریمانە لەئارادا هەیە کە دەوڵەتێك بە ناوی دەوڵەتی سکایی یەوە لەباشووری دەریاچەی ورمێ وەك دەوڵەتێکی ڕکابەر لەگەل مادەکاندا، وەك ئەوەوپێش بوونی خۆی پاراستوە.

ئەگەر سەرزەمینی نیشتەجێبوونی سکایان وەك ئاماژەی بۆکرا جێگای جوگرافی ئەو کەباشووری دەریاچەی ئوورمیەبوە، لەکۆتاییدا لەلایەن مادەکانەوە خرابێتە سەرزەمینی مادەکان، دەبێ ئەو رووداوە بەلەپاشی ساڵی ٥٩٠پ.ز دانەنرێ، بەڵکو لەپێش ئەم ساڵەدا دەبێ ناوچەی سکایان خرابێتە سەر سەرزەمینی مادەکان. چونکە لەوکاتەدا مادەکان لەپێناوی سکایاندا جەنگیان دژی دەوڵەتی لیدی. ئەم رووداوە دەبێ بەکۆتایی ساڵەکانی حکوومەتی کیاکسار(هوخشترە) سێیەمین پادشای ماد دابنرێ. هیرودۆت دەڵێ کە لەدەوروبەری کۆتایی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زایینیدا سکایانی(تیزخود Tigra chauda) بەکڵاوی جەنگی نووکتیژەوە لەناو سوپای مادەکاندا هەبوون. لەدوای مادەکان داریوش دووبارە سکایانی تیزخود(تیگرا خاودا) بەناوی رم هاوێژانەوە لەناو سوارەکانی سیستمی خۆی ناودەبا.

مرۆڤ لەدوای لێکۆڵینەوە لەم روەوە بەو ئاکامە دەگا کە گەنجینەی زیوێ بریتی نیە لەتەنها ئەشکەوتێ ئەو شتانەی تێدا شاردرابێتەوە یا بەیەك فەرمانڕەوای تالانکەر ئەوانەی لەتوێی تاوێردا یا لەئەشکەوتێکدا کەلەناو تاوێردا هەڵێکەندبێ هەڵگرتبێ. هەموو توێژینەوەکان لەڕاستییەك دەدوێن کەئەم گەنجینە گۆڕی یەك فەرمانڕەوای سکایی یە کە بەگوێرەی داب و رێ و رەسمی ناشتنی ئەوان بەخاك سپێردرابێ. لاشەی ئەم مردووەیان بە بۆیاخ داپۆشیوەو ئەویان بەعەرەبانە بۆ شوێنێ گواستۆتەوە کە گۆڕستانی فەرمانڕەوایانی سکایی بوەو لەدواییدا ئەویان لەو جێگایەدا بەخاك سپاردوەو لەپێش ناشتنی لاشەی ئەم فەرمانڕەوایەدا چاڵێکیان لەناو تاوێردا هەڵکەندوە یا ژوورێکیان بۆ دروستکردوەو ئەویان لەو

ژوورەدا یا ژووره بچکۆلەکەیدا بەخاك سپاردوه. بەهەرحاڵ ئەویان لەگۆڕێکدا کە لەدواییدا دایان پۆشیوە ناشتووه.

بۆ ناشتنی ئەو، لاشەکەیان لەسەر سەکۆیەك داناوەو لەناو ئەم ژوورەدا یەکێ لەکەنیزەکانی، خۆراك، ئاوی خواردنەوە، چێشتلێنەری تایبەتی خۆی، خزمەتگوزاری ئەسپەکانی، پارێزەری خودی خۆی، راوێژکاری تایبەتی و ئەسپەکانی، ئەوانەیان لەگەڵ لاشەکەیدا بەخاك سپاردوه. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە سکایان بڕوایان بەژیانی دوای مەرگ هەبوە یا بڕوایان بەدرێژە پێدانی ژیان لەدوای کۆچکردن هەبوە، بۆیە ئەو شتانەیان لەگۆڕەکەیدا ناشتوه، چونکە بۆ ژیانی ئەوەو دوا پێویستی پێیان ماوه. لەو شتانەی کەئەو فەرمانڕەوا هەیبووە باشترین و بەنرخترینیان تەنانەت قاپە زێڕینەکانیشیان دەخستە ناو گۆڕەکەیەوە.

هیرودۆت دێرین و پێویستی مرۆڤ لەوجیهانەدا بەخۆراك و ئاوخواردنەوەو هاوسەرو ئەسپ و کەنیزەك و کۆیلەو منداڵی بەردەست و چەکداری پارێزەر کارێکی بنەڕەتی و داب و نەریتی حاشا هەڵنەگربوو. پاشماوەی ناو گۆڕێ ئەوە نیشان دەدا کەئەو گۆڕە هی شازادە یا فەرمانڕەوایەکە. چونکە ئەو شتانەی لەو گۆڕە بەدەست هاتوون زۆربەی لەکانزای بەنرخن وەك ملوانکەو کێلانی شمشێر. وەڵێ شمشێرەکە خۆی هیچی نەماوەو فەوتاوه. پتر لەوانەش پارچەیەکی لەکانزا دروستکراوە لەسەر شێوەی قەڵغان کەلەسەر سنگ دەبەسترێ بۆ پاراستنی ئەوکەسە لەتیر ئەندازی هەروەها ژمارەیەك کورسی دروستکراو لەچەند پارچەیەکی زۆر جوانی عاج(ددانی فیل) کە زۆر بەدەستڕەنگینی بەیەکەوە چەسپێنراون.

هەروەها بڕێ پاشماوەی خشڵ کە بێگومان ژنانەیە وەك چوارنیشان لەئاڵتوون، بیست و یەکی لەزیوو پانزە نیشانی برۆنزی و چوار تابلۆی

ئاڵتوونی و سی و هەشت دانەی زیوین دەست کەوتوون. جیاوازی جۆرو نرخی کانزایی ئەم پارچانە ئەوە دەردەخا کە چەند ژنێ، لەچەند چینێکی کۆمەڵایەتی جودا لەتەك ئەم ژنەدا بەخاك سپێردراون. پارچە زۆر بچووکە پوولەکە ئاساکان لەئاڵتوون کە لەکەل وپەلی ئەم ژنە نێژراوەدا. بەدەست هاتوون نیشانەی پلەو پایەی باڵای ئەم ژنەو پۆستی بەرزی ئەون. هەروەها چەند چەکێ لەتوخمی ئاڵتوون و زیوینیشی هەبوە.

ژمارەی حەوت رمی نووکتیژ لەگۆڕەکەیدا نیشانەی ئەوەیە کەپارێزەرەکانیشی(حیمایە)بوون بەقوربانی و لەگەڵ خۆیدا نێژراون. قاپە زێڕینەکان بۆ خواردن و خواردنەوە کە لەتەك ئەودا نێژراون بەقاپی شاهانە دادەنرێن و لەتەنیشتی ئەوانەوە چەند قاپێکی لەگڵ دروستکراو هەبوە کە نیشانەی ئەوەن خزمەتگوزارە نێژراوەکان لەتەك ئەودا جیاوازییەکی بەرچاویان هەبوە. هەروەها دەتوانرێ ئەوە بخەملێنری کەزیاد لەوانەش ئەسپ و عەرەبانەو جەنگاوەرو ئەوانەی نزیك بوون لێیەوە بەخاك سپێردراون چونکە لەم گۆڕە زەنگۆڵەی برۆنزی و ژمارەیەك قاپی ئالیکی ئەسپ و چەند پارچەیەکی برۆنزی کەبۆ چوارچەرخە(عەرەبانە) دەستیان داوە بەدەست هێنراون.

بەهەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی ئەم شوێنەوارو شتانەی بەدەست هاتوون ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا یەك هونەری تێکەڵاو لەخۆرهەڵاتی کۆندا هەبوەو ئایا نەخشەی ئەو سەرزەمینانەی لەم هونەرەدا بەشداربوون تاچ ئەندازەیەك و هەروڵاتەی چ پشك و پلانێکیان لەم کارە مەزنەدا بەدرێژایی سەدەکان لەئەستۆدا بوە؟ بەسەرنجدان لەم جیاوازی و نەخشەو پلانی لەیەکنەچووی ئەوانە دەتوانرێ بوترێ کەئاشوور، بابل، ئورارتو، ئێران و هونەری مادو کیمیریان و تەنانەت هونەرمەندانی یۆنانیش لەدروستکردنی

ئەم بەرهەمانەدا نەخشەو پشکیان هەبوە. دیارە بەهەند وەرگرتنی ئەم راستی‌یە کە نکوولی لێناکرێ دەبێ هەوڵ بدەین کە هەریەکە لەم توخمکە لە بەجوداو سەربەخۆ بناسین و بیاننرخێنین و وردەکارییان تێدا بکەین.

چارەی ئەم گرفتە تەنها بەهۆی توێژینەوەی وردی شارستانی و فەرهەنگی خۆرهەڵاتی کۆن و هەموو لایەنەکانی ئەم فەرهەنگ و شارستانی‌یە وەك هونەر، نووسین و زمان، ئابووری و سیاسەت، سوپاو توانای داکۆکی و هونەرەکانی جەنگ و چەك و کەرەسەی جەنگی و ئایین و داب و نەریت، پلاندانانی فەرمانڕەوایانی ئەو وڵاتانەو پەیوەندی رامیاری و کولتووری و سەربازی و ئابووری ئەوان لەگەڵ‌وڵاتانی دیکەدا ئاسان دەبێ. گەنجینەی زێوێ لەم بوارەدا راژەیەکی شایستە بەم توێژینەوە پێشکەش دەکا. نیشانە(مەدالیا)ی دراو ئاسا، پەیکەرو ملوانکەو ئاسەوارو شتە بەدەستهاتوەکانی ئەم گەنجینە بەو هەموو مەزنیەوە دەرگای پەیبردن بەداڕشتنی هونەری و زانینی توانای فەرهەنگی هونەری هەر سەرزەمینێ دەخاتە سەرپشت. لەیەکچوونی زۆر ئاشکرای ئارایشی گەنجینەی زێوێ و دانانی شت‌وەك لەوێداو تەختی(ئاسار هادوون)دا هەبوون، نیشانەن لەسەر شێوازی باجدانی مادەکان کەچۆن باجیان داوە بە دەریاری ئاشوورییەکان.

گۆڕانکارییە رامیارییەکان لەخۆرئاوای ئێراندا تووشی ئەو هەموو بەزمە هات تا چواریەکە سەدەیەك دوای ئاسار هادوون ئەمجا فەرمانڕەوایەکی سکایی لەجێگای ئاشوورییەکاندا لەلایەن مادەکانەوە بەرەسمی ناسراو باجیان دەدا بەو.لەنموونەکانی هونەری ئاشووری دەتوانرێ چەند پارچە ئاڵتوونێ یا لەعاج دروستکراو لەقاڵبی بڵندو پاندا، نانبرێ کەڕەنگە پەیوەندییان بەکەلوپەلی ناو دیوەخانەوە بووبێ کەبەشێ‌بووە لە رازاندنەوەی

دەربارەی شا. وێنەگرتنی مەیدانی راو بەئەسپ و چوارچەرخە(عەرەبانە)و وێنەی دوو حەیوانی کێوییەوە کە درەختی لەنێوانیاندایە بەرچاو دەکەون. هەروەها وێنەی گەورەو ئاشکرای شوێن دانیشتنی خاوەن پۆستە بەرزەکان و جەنگاوەران و گۆڕەپانێکی راوەشێرو گاکێوی لەناو ئەوشتانەدایە. یەك نەخشی زێڕین دوو گۆڕەپانی جەنگ و جەنگاوەران نیشان دەدا.

لەم نەخشەدا هەڵەی هونەرمەندێ دەبینرێ کەدەستی راستی جەنگاوەرێکی وەك دەستی چەپ وێنەگرتوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەك کارێکی سروشتی دەیخاتە بەرچاو. لەم وێنەی ئاشوورییەدا راوەستان و وردەکاری لەکەل وپەلی جەنگاوەراندا هەروەك وێنەی گۆڕەپانی جەنگە لەگەنجینەی زێویێ کە لەعاج دروستکراوە. ئەم ئاسەوارە لەمۆزەخانەی(میزۆپۆلیتن) لەنیویۆرك هەڵگیراوە ئەم نموونەیەکی زۆر روونە لەسەر کاریگەریی هونەری کانزایی لەسەر هونەری عاجکاری.

لەئاسەوارو شمەك و وێنەی پەیوەندیدار بەچاخی دوایی ئاشوورییەکان کە لەگەڵ هاوجۆری ئەوانەدا لەگەنجینەی زێویێ جێی باس بێ، یەك وێنەی ئاشوور بانی پاڵ، لەچەند گۆڕەپانێکی راودا دەتوانرێ ناوببرێ.

نموونەیەك کەلەوبچێ دەتوانرێ ناوی گۆڕەپانێکی راوی شێر ببرێ کە لەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێشەرو هونەرمەندانەدا نیشان دراوەو لەهونەری میتانییەکانیش دەچێ، هەرچەندە ناتوانرێ بەوە باوەڕ بهێنرێ کەئەم ئاسەوارە پەیوەندی بەسەدەی حەوتەمی پێش لەدایکبوونی مەسیحەوە هەیە. تەنها دەتوانرێ ئەم باوەڕە بەشێوەیەك بسازێنرێ کە هەخامەنشییەکان لەزۆر شتیاندا چاویان لەهونەری ئاشووری و بابلیەکان کردوە. ئەم کارو چاولێکردنە لەدوای لەناوچوونی دەوڵەتی ئاشوور بەدەستی مادەکان لەکۆتایی سەدەی حەوتەمی پێش زایین هەربەو جۆرە

گەیشتە ناو ئێران و لای مادەکان، دوای ئەوانیش لای هەخامەنشییەکان پارێزراوە.

دەبێ ئەم خاڵەمان لەبیربێ لە بەسەرنجدان لەتەختی جەمشیدو تێڕامانی باجدەرانی دەوڵەتی هەخامەنشی، ئاشوورییەکانیش دووبارە لەراستای جۆراوجۆری ئابووری، هونەری، تەلارسازی و تەنانەت کارگێڕیشدا شان بەشانی عیلامی یەکان و بابلیەکان نەخش و نیگاریان هەبوە. لێرەدا دەبێ باسی نەخشێکی ئاشووری بکەین کە لەعاج دروستکراوە. ئەم نەخشە(ئاسارهادوون)ی پادشای ئاشوور نیشان دەدا کە خەریکە بڕیارێ لەگەڵ فەرمانڕەوایەکی ماددا بەناوی(راماتیا) مۆردەکا کە لەکاتی دروستکردنی کۆشکی نەمرووددا ئەنجام دراوە. لەنێوان ئەم ئاسەوارە هونەرییانەداچەند کارتۆنێکی بچووک و چەند سندووقچەیەك هەن کە لەدارشتنی هونەری فینیقی دەچن. لەناو ئەوانەدا کارتۆنێکی بچکۆلەی تێدایە کە لەپارچەی بچووکی عاج دروستکراوەو کاری هونەرمەندانی فینیقی یەو بەروونی دەتوانرێ دەستنیشان بکرێ. هەروەها لەهونەری ئورارتوەکانیش دەچێ.وێڕای ئەوە خاڵێ کەجێی سەرنجەو شایستەی تێڕامانە نەخش و نیگاری گیانداران و شینایی لەشوێنەوارەکانی مادو ئاشووری و بابلی و سۆمەری و ئۆرارتویی و فینیقی و میسری کۆندا هەیە.

درێژەپێدانی بەکارهێنانی ئەم نیگارە لەتەختی جەمشیدو شووش و هونەرەکانی دیکەی سەر بەهەخامەنشییان بەرچاو دەکەوێ. لێرەدا دەتوانین دەربارەی بڕوایەکی فراوان و وردو لەهەمان کاتدا هاوبەش بدوێین بە بڕوای بڕێ لە توێژەران مێژووی ئایینەکانی خۆرهەڵاتییە کۆنەکانو خۆرهەڵاتناسان بەگشتی هاوپیشەن. رێزلێگرتن و پیرۆزی هەندێ لە زیندەوەران لەمیسر وەك پشیلە، حەرامکردن و بەگوناە ژماردنی راوی

گیانلەبەران لەسۆمەردا، وەك سەگ و گا لەئێراندا، پیرۆزی گاو مار لەهنددا، ئەوانە هەموو باسی هاوئاهەنگی کاریگەر لەنێوانیاندا دێنێتە ئاراوە.

تەنها خاڵێ کەدووبارە شایستەی لێکۆڵینەوە دێتە بەرچاو کاریگەریی زۆری هونەری و فەرهەنگی میزۆپۆتامیایە لەسەر هونەری ئێران. با ئەوەش بوترێ کە نووسینی ئێرانی کۆن دووبارە لەنووسینی ئەم میللەتانە وەرگیراوە. وەك نموونە، هەرچەندە لێرەدا جێی ئەوباسە نییە، نووسینی بزماری باو بووە لای هەخامەنشییەکان. ئەم نووسینە کە بەنووسینی بزماری فارسی کۆن ناسراوە لە نووسینە بزمارییەکانی عیلامی، بابلی و ئەکەدی(ئاکادی) وەرگیراوە. بەشێوەی گونجاویش لەگەڵ پێویستی زمانی فارسی کۆندا لەژمارەی پیتەکانی ئەلف وبێی نووسینی ئەم میللەتانەی سامی و ئارامی رەگەزە کەم کراوەتەوە. ئەم کاریگەرییە دەبێ بە بەرێکی فەرهەنگی دەوڵەمەند دابنرێ کە عیلامی یەکان، بابلی و ئەکەدییەکان(سۆمەرییەکان) هەیان بووە. هەروەك چۆن لەسیستەمی دیوانی ئێراندا لەسەردەمی هەخامەنشیدا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ عیلامی یەکان ژمێریارو پارسەکان چاودێربوون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەخامەنشییەکان لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی گەورەی خۆیاندا پێویستییان بەکارو خزمەت و پسپۆری ئەم میللەتانە هەبوە.

ناوەڕۆکی گەنجینەی زیوێ زۆر لەوە زیاترە کەناوبراو لەدارشتنی هونەری و پێناساندنی سەرچاوەی ئەوشتانە دوایـن. گرنگترین پارچەو شمەك و ئاسەواری لەگەنجینەی زیوێ بەدەست هاتبێ بەگوێرەی وتەی پسپۆران بەڵگەنامەو چەند شتێکی دێرینن کە مۆرکی هونەریی ئۆرارتووییان پێوەیەو چەند نموونەیەکن لە قاپ و قاچاغی گەورەو بچووکی ئاڵتوونی کەهەندێ لەوانە بەدەستی جووتیاران شکێنراون. هەروەها لەنێو

پاشماوه‌کانی ئه‌م ئاسه‌واره‌دا چه‌ند ملوانکه‌یه‌کی کۆنی کانزایی زۆرجوان‌و دڵکه‌شن، که‌له‌سه‌ر شێوه‌ی نیوه خڕۆکه‌ی مانگ‌و له‌نێو قالبی چوارگۆشه‌ییدا له‌سه‌ر وێنه‌ی(له‌بزینه) دروستکراون‌و جه‌نگاوه‌ران ئه‌وانه‌یان له‌سه‌ر سنگی خۆیان به‌ستووه تا له‌کاتی به‌رکه‌وتنی تیردا سنگ‌و به‌رۆکیان بپارێزرن.

ئه‌م کانزایانه له‌رووی نه‌خشه‌وه به‌چه‌ند جۆری دابه‌ش بوون، که له‌سه‌ر رووی هه‌ندێکیان وێنه‌ی گیانداران به‌تێکه‌ڵی، له‌سه‌ر ئه‌و شێوه‌ی که دروستکردنی ده‌درێته‌پاڵ ماده‌کان وه‌ك وێنه‌ی چوارپێ‌و په‌له‌وه‌ری تێکه‌ڵکراو یا وێنه‌ی مرۆڤ‌و گیانداران‌و شتی تری له‌وبابه‌ته، کێشراوه. نه‌خشی گای باڵدار که سه‌رچاوه‌یه‌کی هونه‌ریی ماده‌کانی هه‌یه‌و له‌ته‌نیشت ئه‌وه‌وه نه‌خشی(ئه‌بولهه‌ول) که ده‌ڵێن له‌لایه‌ن ماده‌کانه‌وه کێشراوه‌و ماده‌کان په‌رستوویانن، له‌وانه‌یه ئه‌گه‌ر ئه‌مانه روون بکه‌ینه‌وه بۆ ته‌واوکردنی راده‌ربڕینی دێریننناسان له‌مه‌ڕ هونه‌ری ماده‌کان سوودبه‌خش بن، وه‌ك ئه‌و سووده‌ی که له‌برۆنزی لوڕستان‌و وێنه به‌ده‌ستهاتووه‌کانی گه‌نجینه‌ی زێوێ‌و ئه‌و شتانه‌ی که‌له‌وانه ده‌چن له‌گه‌نجینه‌ی ئه‌رس... هتد به‌ده‌ستده‌هێنرێ. ئه‌م به‌ڵگه‌نامه‌و دۆکیۆمێنتانه ئه‌وه نیشان ده‌ده‌ن که ئایینی خه‌ڵکی سه‌رزه‌وییه‌کانی ماد به‌تایبه‌تی ماده‌کانی خۆرئاوا له‌گه‌ڵ ئایینی حوورییه‌کان‌و ئاشوورییه‌کان له‌یه‌ك چوون‌ووه‌ك ئاماژه‌ی بۆکرا له‌باسی بیروبڕوای ماده‌کاندا زیاتر له‌و روه‌وه ده‌دوێین. وێنه‌کێشانی گیانله‌به‌رانی سه‌رسووڕهێنه‌ر که‌نیوه‌یان مرۆڤ بوه‌و نیوه‌یان چوارپێ، هه‌روه‌ها ئه‌بولهه‌ل له باڵداره‌کان‌و زینده‌وه‌ره سه‌رنجڕاکێشه‌ره‌کان‌و وێنه خه‌یاڵییه‌کان که‌لاشه‌و سه‌ری شێرو باڵی هه‌ڵۆو شینه شاهۆو په‌له‌وه‌ڕی دیکه‌یان بۆ داناون، هه‌روه‌ها په‌یوه‌ندی نێوان موغانی مادو پیاوانی

ئایینی(کاهین) پەرستگاکانی حووری، بابلی، ئاشووری و میللەتانی دیکە کەئەمەش شتێکە جەختی لەسەرکراوە، دیسان رووداوە سیاسی یەکان و پێکادانە سەربازییەکان، ئەوانە لەئاڵوگۆڕی فەرهەنگیی ئەم میللەتانەدا نەخشەیەکی کاریگەریان هەبوە، کەهەر لەبەر ئەوەیە ئایینی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا لەنێوان مادەکاندا دەکەونە بەرچاو.

دەتوانرێ بوترێ کەئەو لەوحانەی لەقاپی کانزایی چوون و چوارکونیان تێدایەو لەکراسی جەنگ دەچن بۆ داکۆکی لەخۆ، لاسایی کردنەوەی شێوازی پیشەی هونەرو کاری هونەرمەندانی سەرکەوتووی میزۆپۆتامیا بن. چونکە بەباشی لەوە ئاگادارین کەماد، بەتایبەتی لەسەردەمی کیاکساری سێیەمین پادشای مادەکاندا نەك تەنها کەرەسەو پێداویستەکانی سەربازی و پۆشاکی جەنگاوەران بەڵکو هەموو کێش و تەرازووی توانای جەنگی ی سوپاکانی مادیان گونجاوو بەرامبەر لەگەڵ هی دوژمنانی ماددا وەك ئاشوورییەکان لێکردبوو کە ئەگەر کەوتنە جەنگەوە لەگەڵیاندا بتوانن داکۆکی لە خۆیان بکەن و زاڵیش ببن بە سەریاندا. ئەو سینە بەندانە(قەڵغان)ی بۆ داکۆکی بەکار دەهێنران، هەروەها هەڵسەنگاندنی لەوحە چوارگۆشەییەکان ئەو راستییە نکوولی لێنەکراوە، دەردەبڕن کە ئەوانە لەگەڵ شێوازی ئاشوورییدا هاوێنەن. جۆرە ئاڵتوونی یەکان ئەم شتانە بێگومان دەبێ بۆ زەرەنگەرانی ئاشووری بگەڕێنرێنەوە کە رەنگە دەستگیرکراوەکانی جەنگاوەری ئاشوورییەکان ئەوانەیان بۆ سەرزەمینی ماد بردبێ. هەندێ ئەم شتانەیان بە بەشێ لە دەستکەوتەکانی جەنگ زانیوە کە لە دوای لەناوچوونی ئاشوور لەلایەن سوپای مادەکانەوە، هێنابێتیانن بۆ سەرخاکی مادەکان. ئەم گومانەش لە ئارادا دەمێنێ کە بە بۆچوونی گیرشمەن ئەم جۆرە پارچانە بەناوی تابلۆی ئاڵتوونی لە جۆرە خشڵێکی

ئۆرارتوویییەکان وەرگیراون کە تەنها بە سەرزەمینەکانی دیکە فرۆشراون و لە دەرەوەی ئۆرارتۆ سوودیان لێوەرگیراوە.

رەنگە هەندێ لەم پارچانە لە چەند کاریگەریەکی تایبەتی ی دروست کرابێتن و هونەرمەندی کارا بە گوێرەی ئامۆژگاری و سەلیقەی کڕیار نەخش و نیگاری وەك نیوە خڕۆکی مانگەشەو و کەروێشك و پشیلە کێوی لەسەر دروستکردبێ. بڕێ لەم نەخش و نیگارە کە وێنەی مرۆڤ بەرجەستە دەکەن و مۆرکی هونەریی سکاییەکانیان پێوەیە ناتوانرێ بۆ کارگەکانی ئۆرارتۆو هونەری ئۆرارتۆیی بگەڕێنرێتەوە، بەڵکو پێویستە لەکاتی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی ئەو کارانەدا بیر لە هونەرمەندانی ماد بکرێتەوە. دروستکردنی ئاسەواری هونەریی لەم جۆرەی کە پەیوەندی بە سنووری سەردەمی نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایینەوە هەیە دەتوانرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ هونەری ئۆرارتوویی، ئاشووری، مانتائیانی خۆماڵی و هونەری ئەیوونی.

لەبەرامبەردا یەك ئامێری لوولەیی کە لە چەند ئەڵقەیەکی ئاڵتوونی دروستکراوە بریتی یە لە ئاسەوارێکی ئۆرارتوویی. وێرای ئەوە چەند ئاسەوارێکی دیکە کە لەو دەچن لە گەنجینەی زێویێ بەدەست هاتوون و ئەم شتانە ئەوە دەگەیەنن کە ئەگەرچی یەکسەر بەدەستی هونەرمەندانی ئۆراتوویی دروست نەکراون،

وەلێ کاریگەریی هونەری ئۆرارتۆ لە دروستکردنی ئەوانەدا نکوولی لێناکرێ. هەروەها بێجگە لەوانە چەند شتێکی دیکەی زۆر بەدەست هاتووە کە کاتێ بمانەوێ سەرچاوەی هونەریی ئەو شتانە بدۆزینەوە ناچار ئەبین کە لەناو کۆمەڵی هونەری سکایاندا بیانناسێنین. لە گەنجینەی زێویێ قاپێکی زیوینی دیکە بەدەست هاتووە کە لە سەر ئەو چەند نەخشێکی

بچووك بە شێوەیەکی بەرجەستەو ئاڵتوونی کە دەبازنەی هەیەو بە هەموویان یەك چەقیان هەیە، لەناوە راستیشدا گوڵێك لە زێر کە دەگەڵای هەیە دروستکراوە. ئەمە لەو وێنانە دەچێ کە لە گۆڕی(گالاسی) لە میللەتانی(ئەتروسکی) بەدەست هاتوە.

دروستکردنی قاپی زێوێ سکاییەو تێدا وێنەی پڵنگ، کەروێشك لە کاتی راکردندا کە سەریان لە سەری پشیلە دەچێ دەبینرێ. وردەکاری لەو شتانەدا هەندێکیان لە کاری هونەریی ئاسایی بچووك‌و هەندێ وەك گومێچکەی پڵنگ بە شێوەی دڵ لە هونەری ئۆرارتۆ دەچێ. برێ لە شێوازی تایبەتداو ئەو دەستنووسانەی لەسەریەتی وەها دەردەخا کە ئەم ئاسەوارە پەیوەندی بە سنووری هونەریی ئێرانی– ئۆرارتوویی‌یەوە هەیەو دەبێ وەك بەڵگەی جۆری یەکەمی هونەرێ کە لەرواڵەتدا لە هونەری سکایی سەدەی حەوتەمی پێش زایین. بچێ بناسرێ. لەسەر شێوەی هونەری ئاسیایی، لە سنووری هونەری سکاییدا، یەك نەخش‌و نیگار بە هێڵ‌و پەراوێزی ئاڵتوونی‌یەوە لەسەر رووی پشتێنێکی ئاڵتوونی داڕێژراوەو پشتێنەکەش بە پارچەیەك چەرمی پانەوە بەستراوەتەوە.

لێرەدا کاریگەریی هونەری سکاییەکان زۆر روون‌و ئاشکرایەو بوونی داڕشتنی هونەریی‌و هونەرمەندانی سکایی، لە دروستکردنی ئەم ئاسەوارەدا لە چەند کاریگەریەکی جیاوازدا نکوولی لێناکرێ. مەزنترین هونەرمەندانی زەرەنگەری کە لەلایەن شازادەکان‌و فەرمەنرەوایانەوە ئامۆژگاری کراون بۆ دروستکردنی ئاسەواری ئاڵتوونی بە شێوەی شریتی نەخشاوو دانەدار، زۆرتری وەهای بۆ دەچن کە لە کارگەکانی زەرەنگەریی‌و ئاڵتوونسازی ئاسیای بچووکدا فێرکرابێتن. نەخش‌و وێنەی گیانداران کەزۆربەی بە شێوەی سەری چوارپێیان لەسەر ئەم پشتێنە ئاڵتوونییانە

دروستکراون، بێگومان لە هونەری نەخشکاری گیاندارانێ دەچن کە لەلای سکایان باوبوەو لەوانەوە سەرچاوەی وەرگرتووە.

یەك ئاسەواری دیکەی لەوان چوو کە گیانلەبەران بە شێوەی خەوتووو پشت دەرپەڕیوو قاچ و کلك نیوە بازنەو گوێ لەسەر شێوەی دڵ دەردەکەوێ، ئەوە نیشان دەدا کە ئەم داڕشتنە هونەرییە دووبارە لای سکایانی دانیشتووی باشووری رووسیەی ئەمڕۆ باو بووە، تەنها ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە هونەرەی دوایی لە نێوان سکایانی باشووری رووسیادا کە گوێی زیندەوەر لەسەر شێوەی دڵ بێ، هیچ نەبینراوە.

لە توێژینەوەی ئاسەواری گەنجینەی زێوێ خالێ هەیە بە تایبەتی سەرنج رادەکێشێ ئەویش جۆراوجۆری هونەرو سازدانی هونەرییە کە لە رازاندنەوەی گۆڕەکاندا بەرچاو دەکەوێ و لە گشتی گرنگتر ئەو شتانەیە کە لەناو گۆڕەکانی سەر بە ناوچەی زێوێ بە دەستهاتوون. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم شتانەی سکایان زۆربە خێرایی و شێوە هونەرییەکانیان بە کۆمەڵ گەیشتووە.

ئەم کارە پەیوەندی بە هێرشی بروسکە ئاسای میللەتی سکایانەوە هەیە کە چوونەتە هەموو سەرزەمینی ئاسیای بچووك و پشێوییان خستبوەوە کە پێویستە لەم هەل و مەرجەدا جۆراوجۆری هونەریی بگەڕێنرێتەوە بۆ هونەری ئێرانی کە لەژێر دەستەڵاتی هەخامەنشییاندا بۆ سەرانسەری ئێران پەلی کوتابوو. خودی ئەم کارە یارمەتی ئێمە دەدا بۆ دیاریکردنی نەخشەی هونەری مادەکان لەسەر زەمینی ماددا کە تاچ ئەندازەیەك لەم کارەدا کاریگەربووەو شێوەیەك لە هونەری سەردەمی مادەکان بێتە بەرچاومان و بزانین ئەم هونەرە لە کۆنترین جۆریدا بە چ شێوەیەك بووە بەسەرنجدان لە زانیارییەکانی ئەمڕۆ کە بەری لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی دێریننااسان و

توێژەرانە لەمەڕ مێژووی هونەری سەردەمی دێرین بەدوور دەزانرێ بیر لەوە بکرێتەوە کە هونەری مادەکان لە هونەری سکایان و کیمریان جیابکرێتەوە. لە لاپەڕەکانی پێشوودا بۆ ئەم بابەتە لەگەڵ هێنانەوەی نموونەی زۆردا ئاماژەیان کرد. خاڵێ کە دووبارە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ ئەوەیە کە لە فەرهەنگی مادی ئەم میللەتانەدا لە یەکچوونێکی زۆر هەیە.

ئەمەش بەهۆی چەند فاکتەرێکی وەك جوگرافی، هەل و مەرجی ناوچەیی، شێوەی بەرهەمهێنان و بژێوی چون یەکی مادەکان و سکایان و کیمریان و میللەتانی دیکەی دراوسێوە پەیدابووە هونەرە جەنگییەکان و شێوەکانی داکۆکی و بەکارهێنانی کەرەستەکانی ناوماڵ و شێوەی مردوو ناشتن، لای ئەم میللەتانە لە یەك دەچن. دێرینناس خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر(ئەرنست هێرتز فێڵد) چەند ساڵ لەمەو پێش وتبووی کە لەوانەیە بەردەوامبوونی ئەم هونەرە هاوبەشانە لە نێوان هەخامەنشییەکاندا لە نەخش و نیگارو دروستکردنی زۆر بینادا وەك تەختی جەمشید دەبێ پەی پێببرێ. هەنووکە لێکۆڵینەوەی دێریننناسی و توێژینەوە لەسەر ئاسەوارە هونەرییەکان بەتایبەتی هونەری تەلار سازی و گۆڕ دروستکردن بە ئەندازەیەك پێشکەوتووە کە بە ڕاشکاوی و پرکێشییەوە دەتوانرێت پشتگیری لە بۆچوونی هیرتز فێڵد بکرێ. لەگەڵ ئاسەوارێ کە لە گەنجینەی زێوی بەدەست هاتووە و چەند بەڵگەیەکی ئاشکراو نووسراو لە هونەری ئاشووری دەتوانرێ چەند بەڵگەیەك بەدەست بهێنرێ هونەرمەندانی ئۆراتوویی بە تایبەتی دەربارەی تەلارسازی و شتومەکی نێو گۆڕەکان. بۆ ئەم کارە زووتر لە دروستکردنی ئاسەواری هونەری هاوبەشی مادەکان، ئاشوورییان و ئۆرارتووییەکاندا ئاماژەمان کرد.

دەبێ ئەو راستی‌یە بسەلمێنین کە لەبەرئەوەی هونەرمەندانی خۆیی لە دروستکردنی زۆر لە ئاسەواری هونەریی ئەو سەردەمەدا بەشداربوون، توانای دەستنیشانکردن و لە یەکترجیاکردنەوەو گەڕانەوەی داڕشتنە هونەرییەکان بۆ تەنها میللەتێ کارێکی سەخت و دژوارە.

ژمارەیەکی زۆری شمەك و ئاسەواری هونەری کە مۆرك و نیشانەی هونەری سکایی پێوەیە لەوەدا گومان ناهێڵێ کە ئێمە لە بوونی سکاییەکان لەناوچەی زێوێ نکۆولی بکەین. ئەم کارە پشتگیری لەو راستی‌یە دەکا کە کاریگەری هونەری کە لە ژێر دەستی فەرمانڕەوایانی سکاییدا بوو لەو ناوچەدا هەبووەو لەم کارگانە بەزۆربەی شمەکی ئاڵتوونی دروست و ئامادەکراون. نەخش و ئامادەکردنی ئەم شمەکە ئاڵتوونییانە نیشانەی پەیوەندییان بە کەسانی خاوەن پلەوپایەو کاریگەری راستەوخۆی سەلیقەی تایبەتی فەرمانڕەوایانی سکایی‌یان پێوە دیارەو جێگای دردۆنگی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئارادا ناهێڵن.

بەهۆی تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئاسەواری گەنجینەی زێوێ ئەو ئەندێشە دێتە ئاراوە کە ئاسەواری هونەریی ناتوانرێ وەك چەند بەڵگەیەك تەماشا بکرێ کە کاریگەریی هێدی هێدی هەبێ بۆ ئەنجامدانی هونەرێکی تەواو، بەڵکو ئەو شوێنەوارانە

رێك‌وپێکی و پێشڕەوی خێرای هونەرو داڕشتنی هونەریی بەئێمە دەناسێنن. بەشێوەیەکی خێراو چاوەڕوان نەکراو کاریگەریی داڕشتنی هونەرە جیاوازەکان لەسەر ئەو ئاسەوارانە دەرکەوتووە. ئەوی لەم روەوە هەستی پێدەکرێ و دەتوانرێ بەراشکاوی باس بکرێ بەم جۆرەیە: میللەت و نەتەوە تازەکان کەلەم دەڤەرانەدا تازە دەستەلاتیان وەرگرتووە یا توانیویانە خۆیان دەربخەن و لەسەر ئەم بنەمادەتوانرێ فەرهەنگ و داڕشتنی هونەریی

تایبەت بدرێتە پاڵیان، دەبێ توخم و نیشانە هونەرییەکانی خۆیان لەسەرزەمینی تازەدا بەکار بهێنن و تێکەڵی دارشتنی هونەریی ئەوانی بکەن، کە لێرەدا مەبەست هونەرو فەرهەنگی دانیشتوانی خۆیی‌یە کە کاریان تێکراوەو ئەم نیشانانەیان وەرگرتوە.

ئاشکرایە کە ناتوانرێ ئەم خاڵە رەچاو نەکرێ کە سکایان هەرچەندە دەستەڵاتی رامیاری و توانای سەربازییان هەبوەو توانیویانە لەهەموو روویەکەوە دەستەڵاتی خۆیان نیشان بدەن بەڵام هێشتا لەوەدا سەرکەوتوونەبوون کە هونەری خۆیان بەگوێرەی داب و نەریتی ئەو سەردەمە، لەئاسیای بچووکدا تێکەڵ بەیەك بکەن تا ئەو ئاسەوارو شتانەی بەدەست گەیشتوون هونەرە تێکەڵاوەکە وەك فەرهەنگێکی تەواوو یەکەیەکی هونەری نیشان بدەن.

بێگومان سکایان بەرهەمی هونەریی تایبەت بەخۆیانەوە هەبوە، وەڵێ ئەندێشەو

هزری جوانسازی ئەوە دەگەیەنێ کەئەم فەرهەنگە هونەرییە بەیەکەوە گرێ نەدراوە، بەتایبەتی کاتێ کە هونەرمەند دەبێ توانای دەسترەنگینی خۆی بەگوێرەی ویست و ئارەزووی ئەوکەسە بخاتەگەڕ کەلەو روەوە ئامۆژگاری دەکا، تا ئەو هونەرەی ئەو بەکاری دەهێنێ و ئەوشتەی ئەو دروستی دەکا جێی پەسەندکردنی ئەوکەسەبێ کەبۆ ئەومەبەستە ئامۆژگاری داوەتێ تا خواست و ئارەزووی جێبەجێ ببێ و ئەمیش کارێکی نوێ بەپێی ئەو تایبەتمەندییانە لە کارگەکەری خۆیدا ئەنجام بدا.

هەروەها لەسەر بنەمای ئەو ئاسەوارەی بەدەستهاتووە، بەتایبەتی لەتوێژینەوەی گۆڕی فەرمانڕەوایەکی سکاییدا چەند شت و ئاسەواری هونەری بەدەستهاتووەکە ئەوە دەگەیەنن چەند میللەتێکی جۆراوجۆر

لەدروستکردنی ئەم ئاسەوارەدا بەشداربوون. لەم خاڵەشدا هیچ گومانێ نییە کەئەو ئاسەوارەی لەگۆڕی ناوبراودا بەدەستهاتووە دەتوانرێ وەك باج یا وەك دیارییەك ناوببرێ کە میللەتان و نەتەوە بچووکەکان کە کەوتوونەتە ژێر دەستەڵاتی سکاییەوە وەك دیاریی بۆ خۆبردنە پێشەوە لای فەرمانڕەوا سکایی‌یەکان یابەوتەیەکی دیکە بەخاوەنی ئەو گۆڕە یان پێشکەش کردوە. وەلای ئەم فەرمانڕەوایە ئەو ئاسەوارە ئەوەندە بەنرخ و بایەخدار بوە کە داوای کردووە لەگەڵ خۆیدا لەگۆڕەکەیدا بەجێ بهێڵرێ و هەنووکە ئەو شتانە جێی لێکۆڵینەوەن. سەردەمی دانانی ئەم شتانە لەو گۆڕەدا یا سەردەمی ناشتنی ئەو فەرمانڕەوا سکاییەی باسکرا، دەتوانرێ بەسەرەتای سەدەکانی گەیشتن بەدەستەڵاتی سکایان لەئاسیای بچووك و سنووری باکووری دەشتەکانی ئێران و باشووری رووسیا دابنرێ. وەلێ نابێ ئەم خاڵە بەدوور بزانرێ کەئەم بۆچوون و بەراوردە مەرجی هەیەو دەبێ بەم واتایە رەچاو بکرێ کە لەوانەیە شایستەی لێبەدەرکردن و جیاکردنەوەبێ، بەلام بەهەرحاڵ دەبێ بەگوێرەی لێکۆڵینەوەو تێڕامان دەربارەی ئەم جۆرە ئاسەوارە ئەنجام بدری. ئەو دەوڵەتە بەدەستەڵاتانەی کەنەخشەو کاریگەریی هونەری ئەوان لەم جۆرە شوێنەوارانەدا بەرچاو دەکەوێ و بۆچوونی ئێمە یەکلایی دەکاتەوە، سکایان و ئاشوورییان و ئۆرارتووییەکانن. کاتی دروستکردنی ئەم ئاسەوارە هونەرییانە دەبێ بەهەڕەتی شکۆی فەرهەنگی و مەزنیی دەرباری فەرمانڕەوایانی ئەم دەوڵەتانە بناسرێ. لەو شێوە بارودۆخەدا دەتوانرێ باس لەپێشینەی سەدەکانی زایینی دەوڵەتەکانی رۆم بکرێ لەژێر دەستەڵاتی سزارەکان(قەیسەرەکان)داو هیند لەژێر دەستەلاتی(کووشانیان) و چین لەژێر فەرمانڕەوایی زنجیرەی(هان) و لەدوای بەراورد هەڵبسەنگێنرێن.

لەســەردەمێکدا گەنجینــەی زێــویێ دۆزرابــوەوەو ئــەم کۆمەڵــە شــتە بەنرخ ووێنە بەدەست هاتبوو دەبێ بیر لەوە بکرێتەوە کە ئاشوور میراتگری هونــەرو فەرهــەنگی هونــەریی میزۆپۆتامیــا بــووەو هــەنگاوێکیش بــۆ ناوجەرگــەی هونــەری ئاســیای بچــووك نــاوەو دەســتی کــردووە بەگەشــەپێکردنی. بــەوجۆرەی کــە لەنەخشــەی جوگرافیــای رامیــاری میزۆپۆتامیــاو ئاسیای دێریــن بەدەســت هــاتوە گەشــەکردنی هونــەر لــەم دەڤەرانەدا نکوولی لێناکرێ و لەگەڵ ئەویشدا پەرەسەندنی کاریگەریی ئەو بلاوبوونەوەی نموونەکانی هونەری ئەم سەرزەمینانە بۆ دەڤەرەکانی دیکە راستــیەکە کــەمێژووو جیــهانی شــوێنەوار ناســان ئــەوەیان بەراشــکاوی سەلماندوە.

لەوکاتــەدا ئورارتــو لەهــەڵدێری رمــاندابووو ئاشــووریش ماوەیــەکی کــەم دوای ئۆرارتــو رمــاو ئەمیش گرفتــاری چارەنووسی ئــەوبوو. رمــانی ئاشــوور لەساڵی(٦١٢پ.ن) یا بەبۆچوونێکی دیکە لــە(٦٠٦پ.ن) لەلایــەن کیاکساری سێیەمین شای مادەوە ئەنجام درا.

لەســەر زەوی وێرانــەی ئاشــوورو ئۆرارتــوو لــەجێگای تــەخت و بارەگــای سیاسی و توانای سەربازی ئەوان چەند دەستەڵاتێکی نویێ هاتنەکایەوە کە لەســەرووی ئەوانــەوە دەبــێ ئیمپەراتۆرییــەتی مــاد ناوبــرێ. مادەکــان ماوەیەکی دوورودرێژ باجگوزاری ئاشوورییەکان بوون.

دیائاکۆ یەکەمین پادشای ماد بەهۆی سارگونی دوەمەوە دەستگیرکراو بردیان و کورەکەی ئەویش(فروتریش) بەدەستی ئاشوور بانیپاڵ لەجەنگدا کــوژرا. لــەدوای مادەکــان و دەســتەڵاتە بچــووك و گــەورەکان ئیمپــەراتۆری بەهێزی پارسیان(هەخامەنشییان) هات و هونەری مەزنی ئەم چاخە لــەدوای بەجێمانی ئاسەواری هونەری دەوڵــەتانی پێــش خــۆی چــەند بینــاو چــەند

ئاســه‌واریێکی زۆری وه‌ك یادگــار به‌جێهێشــتوه كــه لــه‌كاتێکی گونجــاودا به‌ته‌واوی له‌و روه‌وه ده‌دوێین. بائه‌وه‌ش بوترێ كه هونه‌ری هه‌خامه‌نشییان وه‌ك ده‌وڵه‌ته‌كانی دی هونه‌رێکی تێكه‌ڵاوو به‌جێماوه له پێشینانی خۆیه‌وه. سه‌لمێنراوه له‌هه‌موو ئاســه‌واری پێــش ســه‌ده‌ی شه‌شــه‌می پێــش زایــین- دامــه‌زراندنی ده‌وڵــه‌تی پارســییان لــه‌(٥٥٩پ.ز)دابــوه- له‌بــه‌رترو زیــاتر بــه به‌رچاوه‌وه‌بوه.

توانای به‌راورد له‌مرۆژه‌یشــدا، لــه‌دوای تێپــه‌ڕبوونی نزیكــه‌ی ســێ‌هه‌زار ســاڵ هێشتا گونجاوه. شوێنه‌واره‌كانی هونــه‌ریی هه‌خامه‌نشــییان ئــه‌وه‌نده پایه‌دارو خاوه‌نی پشتیوانی هونه‌ری بووه كه هه‌رچه‌نده چه‌ند رووداوێكی فراوانی مێژوویی له‌گه‌ڵ زیانێكی زۆردا به‌خۆیــه‌وه دیوه، وه‌لێ هــه‌روا قــایم له‌شوێنی خۆیدا مایه‌وه كه راست‌و دروستی بی‌وێنه‌ی داڕشتنی هونه‌ریی‌و نه‌خشه دانان‌و به‌كارهێنانی ده‌زگای ئاوه‌دان كردنه‌وه‌و توانای ته‌لارسازی ئه‌و سه‌رده‌مه نیشان ده‌دا. ئه‌م هونه‌ره ئه‌گه‌ر به‌راورد بكرێ ده‌گه‌ڵ هونــه‌ری ســكاكان ده‌بــێ ئــه‌م خاڵــه ده‌ربــاره‌ی هونــه‌ری پارســه‌كان(هه‌خامه‌نشــییان) بوترێ كه هونــه‌رێكی به‌هێزو بــێ ركابــه‌ربووه‌و ئاوێتــه‌بوونی هونــه‌ری مــادو ســكایی‌و هونــه‌ری ئاســیای دێریــن یــا میللــه‌تانی ئاســیایی دێریــن كه‌جێنیشته‌ی ئێران بوون به‌جۆرێ بوه كه پاشماوه‌كانی نه‌خش‌و نیگارو ئاسه‌واری ئێرانی- ئۆرارتوویــی به‌ڵگــه‌ن له‌ســه‌ر یــه‌كگرتن‌و هاوكارییــه‌كی هونه‌رمه‌ندانه‌ی باش له‌نێوان هونه‌رمه‌ندانداندا.

ئــه‌م یه‌كگرتنــه هونــه‌ری هه‌خامه‌نشــییه‌كانیش ده‌گرێتــه‌وه. پــه‌یوه‌ندی هونه‌ری له‌ئاسه‌واری هونه‌ریی هه‌خامه‌نشیدا هه‌رده‌م پارێزراوه. ئه‌گه‌رچی هونه‌ری سكایی له‌ده‌ڤه‌ره‌كانی باكوورو خۆرئاوادا له‌ژێر ده‌سته‌ڵاتی هونه‌ری یۆنانیدابووه‌و شێوه‌یه‌كی تازه‌ی وه‌رگرتبوو، بــه‌ڵام نموونه‌ی هونــه‌ری ئــه‌و

سکاییانه له دەڤەری(پۆنت) دەتوانرێ بەدەست بهێنرێ. که ئەوەش پشتگیری لەو بۆچوونه دەکا. ئەگەر چوونی ئێرانییەکان بۆ بانی ئێران، بەو شێوەی کەزۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان پشتگیری لێدەکەن لەسەرەتای یەکەمین هەزارەی پێش زایین بووبێ، پێویسته که هونەری ئێرانییەکانیش لەگەڵ هونەری میللەتانی خۆیی و خۆماڵیشدا بسەلمێنین.

هونەری(سیلك)و ئەوەش پەیوەندی بەوەوە هەیه وەك هونەری(خوروین)، هونەری(حەسەن لوو)و(ئاملش) چەند بەشێ لەشارستانی و فەرهەنگی ناوخۆ پێکدێنێ که هونەری شار دروستکردن، دامەزراندنی گوندەکان و دروستکردنی دەفر(قاپ) وەك مەرکانەی گڵێن و کارکردن له کانزاکاندا، چەند بەشێکی گرنگی ئەوبوون. برۆنزی لورستان مەزنترین و ئاشکارترین نموونەی ئەوە.

لەسنووری سەدەی هەشتەمی پێش زایین مادەکان که لەگەڵ کیمریان و سکایاندا یەکیان گرتبوو، بۆ جڵەوگرتنی هێرشی ئاشوورییان و پێشڕەوی سوپاکەیان ئەکباتانیان دروستکرد. بەم شێوه چەند بەڵگەیەکی هاوبەش مادو سکایی و کیمیری کەهاته ئاراوە لەتێکەڵبوونی عیلامی- کاسپی بەشێوەیەك سەرچاوەی وەرگرتووە که هونەری پێش هەخامەنشیش دەگرێتەوە. نموونەی ئەوە گۆڕە بەردینەکانی مادە. بەم کۆمەڵە مەزنە کاریگەریی هونەری ئاشووری، بابلی ئۆرارتوویی و تەنانەت یۆنانی بەتواناو خێراییەکی جیاوازەوە پەرەیان سەند که لەگەنجی زیوی دەبینرێ.

# پاشکۆ
# نویشک و ئەنجامگیری مێژووی ئاریاییەکان

ئاریا بەواتای(دۆست، ئازاد، میواندۆست) ناوی رەگەزی زۆر لە خەڵکان، تیرەو میللەتانێکە کە لەمێژووی نەتەوەناسی و رەگەزناسیدا ناوبراون. لەنێو ئەم خەڵکانەدا دەتوانرێ ئێرانییەکان، هیندییەکان، یۆنانییەکان، میللەتانی ئیتاڵی، سەلت(سەلتییەکان)، ئەڵمانیەکان هتد ناوببرێن. تەخارییان پەیوەندییان بەلکی خۆرئاواوە هەیە.

لەدیدی زمانناسییەوە زمانەکانی هیندی و ئێرانی هەمیشە لەبواری زانستی زمانناسیدا بەزمانەکانی ئاریایی ناسراون. لەزانستی مێژوو، رەگەزناسی و نەتەوەناسیدا دوو توخمی زمان و نەژاد هەمیشە یەکتر دەناسێنن. لەگەڵ گۆڕان و دەستکاریکردنێ کە لەماوەی هەزاران ساڵی مێژووی خەڵکانی ئاریایی نەژاددا کە لەزمانیاندا روویداوە، دەتوانرێ لەرووی زانستی چاوگ دۆزینەوەوە(ئەتیمۆلۆژی) پەی ببرێ بەفرە وشەی هاوبەش و ناوی چون یەک و هاورەگ لەزمان و فەرهەنگی ئەو میللەتانەی ناوبران و بەم جۆرە ریشە یا بەوتەیەکی دیکە کۆنترین شێوەی وشەو ناوەکان بناسرێ.

پێشینەی خەڵکانی ئاریایی بەم جۆرە دەتوانرێ لەرووی کاتەوە لەسەردەمی دوایی بەرددا یا چاخی بەردینی نوێدا(نئوولیتیک) بزانرێ، وەلێ هەمان خەڵك کانزا(فلز)شیان ناسیوە، چونکە زووتر وتمان کە ئارییەکان لەکۆچکردنیاندا لەگەڵ خۆیاندا ئەسپ و درشکە(چوارچەرخە)یان پێبوو کەبۆ هەڵگرتنی بارو گواستنەوەو داکۆکی و راوو زۆرشتی دی سوودیان

لێوەردەگرت. ئەمڕۆش لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی فراوان لەمەڕ نیشتمانی ئارییەکان، وشیارییەکی تەواو بەپێویست دەزانرێ و هەر لەبەر ئەوەشە بیرو بڕواو بۆچوون لەم توێژینەوانەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا جیاوازن و توێژەران بەتایبەتی ڕەگەزناسان و شوێنەوار ناسان لەم بوارە دژوارەدا هەر لەسەرەتاوە پشتیان بەوەرگێڕانی دەقە کۆنەکانی نێوان ئێرانی و هیندی بەستوە. ئەم خاڵەش دەبێ بوترێ کە بەکۆمەکی زمانی هیندیەکان وەك زمانی سانسکریت وەرگێڕانی دەقە ئایینی‌یەکانی ئێرانی دێرین ئاسان بووە.

لەسەر بنەمای وەرگێڕانی دەقە ئایینی‌یە هیندییەکان لەزمانی سانسکریتەوە کەزمانی(ودا)کانە ئاسیا بەنیشتمانی ئارییاییەکان زانراوە، وەلێ بەپێی توێژینەوەی کۆمەڵناسان، نەتەوەناسان و ڕەگەزناسان کە لەدواییدا واتە لەسەدەکانی دوایی و نزیکی سەردەمی ئێمە دەستی پێکراوە، ئەوروپا کە لەوێشدا دەڤەرە کوێستانەکانی(تۆرینگن) لەئەڵمان و لەئەسکەندەناڤیدا وەك چەند شوێنێکی دیاریکراو بۆ گەڕان و توێژینەوە لەڕێگای پەیبردن بەنیشتمانی ئارییەکان سەرنجی توێژەرانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. ئەم جیاوازییە لەبۆچوونی توێژەراندا ئەوەندەی‌تر کاری لێکۆڵینەوەی دژوارکردوە.

توێژینەوەی ئەم دواییەو تاڕادەیەك نوێ کە لەلایەن خۆرهەڵاتناسانەوە وەك پاوڵ تیمە(paulThieme) زانای ئەڵمانی‌یەوە ئەنجام دراوە پشتگیری لەبۆچوونی ئەم دوایی‌یە دەکاو ئەمەش لەم دواییەدا لەناو کۆڕی توێژەراندا باسەکەی ورووژاندووە.

سەردەمی کۆچی ئارییەکانیان، لەچەند جارێکدا بە نێوان هەزارەی چوارەم و یەکەمی پێش زایین زانراوە. بەگەیشتنی‌ئارییەکان بۆ بان ئێران

لـەلای خۆرھـەڵات و خۆرئـاوای ئێرانـەوە بوونـی میللـەتانی خۆیـی وەك حووریـیـان، گۆتی‌یـەکان، لۆلۆیـی، کـادۆس، سـۆباری...ھتـد بەتـەواوی جـەختی لەسـەرکراوەو لـەبوونی ئـەواندا لـەم سـەرزەمینەدا ھـەتا نیـوەی یەکەمی ھـەزارەی یەکەمی پێش زایـین ھیـچ جـۆرە گومـانێکی تێـدا نییـە.
لەھـەمان ماوەدا بوونـی ئیمپراتۆری میتـانی(Mittnni- Riech) ھاوکـات لەگـەل کاسـی‌یاندا(Kassitten)کـەپتر لەیـەك سـەدە لـەمیزۆپۆتامیادا فـەرمانڕەوای بـابل بـوون جـەختی لەسـەرکراوەو لەچـەند سـەرچاوەیەکی گرنگەوە پشتگیری لێکراوە.

میللەتانیٚ کەناویان برا ماوەیەکی دوورودرێژ لەپێش کۆچی میللـەتانی سامی و ھینـدۆ ئەڵمانیدا، لەم ناوچانە جێنیشتەبوون. لەھـەمان سـنووری جوگرافیـدا لەدەوروبـەری ھـەزارەی یەکـەمی پێـش زایـین یەکـەمین گرۆھـی ئاریـایی جێگـیربوون. ئـەم گرۆھـە ھـەر ئەوکەسـانەبوون کـە لەدەشـتە بەربلاوەکانی تورکستانەوە بەرەو خۆرئاوا پێشڕەوییان کردوە. بەگوێرەی ھەمان لێکۆڵینەوە لەمەڕ ھەمان خەڵکانی نێوان سەدەکانی حەڤدەو دوازدەی پێش زایـین لـەبابلدا کاسـییان و میتانییـان ھـەر بـەوناوەوە واتـە زنجـیرەی کاسی‌یەکان و میتانی‌یەکان، لەباکووری میزۆپۆتامیادا دامـەزرابوون. کاتی دامـەزراندنی ئـەم زنجیرەیان بەسـەدەکانی پـانزە تـا سـیانزەی پێـش زایـین نووسیوە.

بەڵام دەربارەی ئارياکان دووشت واتە ئەسپ وعەرەبانە بەناوی نیشانەی ئاشکرای ئارياکانی ھیندۆ ئێرانی‌یەوە بەھۆی ھەمان لێکۆڵینەوەوە جەختی لەسەرکراوە. خـەڵکانی ئاریـایی لـەو سەردەمەدا خاوەنی یاساو سیسـتمی بەڕێوەبردنی کاروباری تیرەو ھۆزەکانی خۆیان بوون.

تایبەتمەندی ئەم خەڵکانە، بەتایبەتی توێژی فەرمانڕەواو دەستەڵاتداران لەنێوان ئارییەکاندا هەموو گومانێ دەربارەی پێشینەی ئەوان و ئاشناییان لەگەڵ کانزاو ئاژەڵداری و یاساکانی بەرگریدا دەڕەوێنێتەوە. با ئەوەش بوترێ کە ئارییەکان بەپشت بەستن بەلێکۆڵینەوەی سەرەوە وەك سەرمەشق و نموونە بۆ میللەتان و نەتەوەکانی دیکە لەمێژوودا ناویان هاتووەو ئەمە بەو واتانییە کە ئارییەکان تەنها ئەزموون و زانیارییەکانی خۆیان بەمیللەتانی دیکە ڕەوا بینیوەو فێریان کردوون، بەڵکو لەمیللەتان و خەڵکانی دانیشتووی بان ئێران لەچەند بوارێکی جۆراوجۆردا وەك هونەری گڵێن(گڵ سوورکردنەوە) بەهرەیان وەرگرتووەو خۆشکردنی سەرزەوی ئێران بۆ کشتوکاڵ فێربوون.

لکی خۆرهەڵاتی ئاریایی هیندی و ئێرانی کە هاوبەشییەکی فراوانیان لەنێواندا هەبوەو ئێستاش هەیانە، لەدەڤەری خۆرهەڵاتی بان ئێران و بەشێوەیەکی دیاریکراو لەباکووری ئێران و ڕێڕەوەکانی ئەفغانستان ولاپاڵی کێوەکانی هیندوکوش و بلوچستان هەتا شیوی سەندیان بۆ خۆیان تەرخان کردبووو لەو دەڤەرەدا چەند نیشانەیەکیان لەبواری شارستانییەتیدا خستۆتە پاڵ نیشانەکانی شارستانیی پێش خۆیان. توێژەران هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایین بەدەوروبەری چوونی لکی ئارییەکانی خۆرئاوا بۆ لاپاڵەکانی کێوانی زاگرۆس(Zagros)و ناوەندی ئێران دەزانن. لەدوای تێپەڕبوونی دوو سەدە لەهەزارەی یەکەمی پێش زایین دەوڵەتی ئاریایی ماد لەخۆرئاوای ئێراندا دەمەزرا. لەچڕکردنەوەی ئەم زانیارییانەدا دەتوانرێ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی مێژوونووسان و توێژەران لەم بوارەدا بەم جۆرە پوختە بکرێ:

ئێرانییەکان، هیندییان و خەڵکانێ کە بەوان هیندۆ ئەڵمانی یا هیندۆ ئاریایی کەبەلکی ئاریایی خۆرهەڵاتی ناودەبرێ پەیوەندییان بەم لکەوەیە. لەهەمان لێکۆڵینەوەدا بۆ خاڵێ ئاماژەکرا کەزووتر تەنها ئەو ئاماژەمان بەس زانیبوو، ئەو خاڵەش ئەمەیە کەسەردەمی پێکەوەژیانی ئارییەکان و لەیەك جیابوونەوەیان بەتەواوی نەزانراوە، وەلێ دەڤەرەکانی باکووری هیندوکوش لەهەر شوێنێکی دیکە بۆ ئەم مەبەستە نزیکترە لەڕاستییەوە. لکی خۆرهەڵاتی ئارییەکان کەبەرەو باشوور درێژەیان بەپێشڕەوی خۆیان داوە، ئەگەری ئەوە هەیە کە لەهەزارەی دووەمی پێش زایینیدا لەجێگایەکدا جێنیشتەی یەکجاری بووبێت کەئەمڕۆ هندستانەو بەشێکی دیکە یا لکێکی دیکە کەبۆ دەڤەرەکانی خۆرئاوا کۆچیان کردبوو گەیشتوونەتە سەرزەمینێ و لەوێدا ژیاون کە لەمێژوودا بەسەرزەمینی ئارییاکان یا ئێران(Land Arier) ناسراوە.

توێژەران یەم لکەی خۆرئاواو بەتایبەتی ئەوانەی لەباکووری ئێراندا دەژیان هەر لەمێژەوە پەروەردەکردنی هەنگ و، لەبەشی خۆرهەڵاتیناشتنی خەشخاش و بەرهەمەکانی دیکەیان خستۆتەپاڵیان. ئەم کارە لەسەرچاوە ئایینییە ئێرانییەکانی کۆنیشدا پشتگیری لێکراوە. دەبێ ئەوەش بوترێ کە لەدەشتە بەربلاوەکانی رووسیادا پەروەردەکردنی هەنگ بەهۆی لەبارنەبوونی هەلومەرج و بارودۆخی ناوچەییەوە کارێکی ئاسان نەبوە.

لەمەڕ سیستەمی ژیان و کۆمەلایەتی و تەنانەت حکوومەتی ئاریاکانیشەوە وەك زووتر بەدرێژی باسکرا ئاشکراترین نیشانەی سەربەخۆیی داواکردن و ستەمدیدەیی خەڵکانی ئاری دامەزراندنی دەوڵەتی مادبووە لەکۆتایی ساڵەکانی سەدەی هەشتەمی پێش زایینیدا لەخۆرئاوای ئێران. ئەو دەوڵەتە بەداخوازییەکی زۆرەوە لە حکوومەتەکانی پێشوو

لەناوچەکەدا بەتایبەتی ئاشوورییەکان چووە گۆڕەپانی خەباتەوەو ئەم خەباتەی درێژەپێدا هەتا ئیمپەراتۆری ئاشووری لەکۆتایی ساڵەکانی سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا لەناو بردو ناوی سڕییەوە، تێشکانی نەینەوا(Ninive)لەساڵی ٦١٢ی پێش زایین و لەناوچوونی ئاشوور لەساڵی ٦٠٦ی پێش زایین روویانداوە.

لەناوبردنی ئەو حکوومەتانەی دەستەڵاتخوازبوون تەنها لەلایەن مادەکانەوە ئەنجام نەدراوە، بەڵکو دوای ئەوانیش بەدامەزراندنی زنجیرەی هەخامەنشییەکان بەسنوورێکی فراوان و فەرمانڕەوایانێکی بێوێنەوە لەمێژووی ئێرانی کۆندا، کردن بەیاسای نامەی ئارییەکان، یاسا دانان بۆ کۆمەڵگا یا باشتروایە بڵێین کۆمەڵگاکان، یەکگرتن و خەبات دژی دەستەڵاتە ستەمکارەکان، پێدانی ئازادی کەلتووری و ئایینی بەمیللەتانێ کە کەوتبوونە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە، بەشێوەیەکی رێك و مێژووساز، لەسەدەکانی شەشەم تا چوارەمی پێش زایین هاتۆتە ئاراوەو ئەنجام دراوە، توێژەران ئاریاکانیان بەخاوەنی ئامادەبوونێکی رامیاری تەواوو توانای جەنگی بێوێنەو توانای بنیادنان لەبوارەکانی ئابووری و سەربازی و رامیاری و فەرهەنگیدا ناوبردووە بەگوێرەی ئەم توێژینەوەو لەسەر ئەم بنەمایە لەپەیوەندی و توانای لەڕەبەدەریان لەبواری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و هەروەها دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بۆ ئاڵ‌وگۆڕکردنی شمەك و زانیارییەکان لەزۆر بواردا بەهرەداربوون. هەروەها یۆنان دانیان بەوەدا ناوە کەئێرانی‌یەکان خاوەنی هەل‌ومەرج بوون بۆ پێشکەوتن لەهەموو بوارێکداو هەمیشە توانای جوانسازییان هەبووە. رێزگرتن لەیاساو مافە کۆمەڵایەتی‌یەکان لای ئێرانییەکان بەپێی وتەی مێژوونووسان و فەیلەسووفەکانی یۆنانی کارێکی ئاسایی‌بووە لەکۆمەڵگاکانی ئێرانیداو

هەمیشە خەڵکی دیکە چاویان لەمان کردووە. پریکلس وتاربێژی کارامەو فەرماندارى دەريـايى ئـاتن(ئـەثینا) بەشـانو بـاهۆی ڕێزگرتـن لەیاسـا، لەکۆمەڵگای ئێرانیدا لەلایەن بەرپرسانی دەوڵەتو فەرماندەکانی سوپاوە، هەڵداوە نویشکو ئەنجامگیری مێژووی مادەکان.

هەرچەندە لەمەوپێش گرنگترین مەسەلەو مەبەست دەربارەی مێژووی مادەکان بەشێوەیەکی پوختە دواین بەڵام دیسان بۆ هەندێ خاڵی گرنگ لەم کورتەباسەدا ئامـاژە دەکـەین. مادەکـان کـە سـەرزەمینی ئـەوان لـەزمانی ئاشووریدا بەئامادای(Amadai)و لەزمانی فارسی کۆنـدا بـەمادا(Mada) ناوبراون، خـەڵکانێکی ئێرانین کە زۆرتـری لەوەدەچێ لەسنووری هـەزارەی دوەمو یەکـەمی پێـش زاییـنـدا بـۆ خۆرئـاوای ئـێران کۆچیـان کردبـێ. سەلمانسـەری سـێیەم (Salmanssari) پادشـای سـەردەمی ناوەڕاسـتی ئاشـووری(٩٠٠تـا ٧٢٥پ.ز) سـاڵنامەی شـەڕەکانی خۆیـدا کـە بەسـاڵی(٨٣٥پ.ز)وەپـەیوەندی هەیـە لـەنێوان ئـەو بیسـتو حـەوت سـەرزەمینەدا کـەباجی لێسـەندوون، بـۆ سـەرزەمینەکانی ئامـادایو پارسوماش(Parsumaš) بەتایبەتی ئاماژەی کردوەو باسی ئەوەی کردووە لـە دانیشـتوانو فـەرمانڕەوایانی ئـەم ناوچانـە کەلـەژێر بـاڵی دەسـتەڵاتی ئەودابوون باجی لێوەردەگرتن. بەشێوەیەکی گشتی لەزمانی ئاشووریدا ئەم ناونیشـانانە بـۆ مادەکـان بـەکارهێنراون: ئامـادای، ماتـای(Matai) کـە مادای(Madai) دەوترێ. مادەکان لە سەردەمی کۆنـی ئاشـووردا(١٥٠٠-٩٠٠پ.ز) بـەپێی یاداشـتی تیگـلات پیلسـری یەکـەم(Tiglat Pisserl) بەشـێبوون لـەو چـلودوو میللەتـەی کـەباجیان بـەتیگلات داوە. هەرلـەم یاداشـتەدا هـاتوە کـە تیگـلات تـا باشـووری دەریاچـەی ورمـێ پێشـڕەوی کـردوەو دوای ئـەوەی خـەڵکێکی زۆری خسـتۆتە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوە کـە

ژمارەیانی بە چل‌ودوو ناوبردوە باجی لێسەندوون. لەبەڵگەنامەکانی ئاشووریدا سەرزەمینێ بەناوی ئەمان ماندا(Umman- Manda)وە ناوبراوە کە سەرتاسەری باکووری خۆرئاوای ئێرانی گرتۆتەوە.

بەپێی باسکردنی سەرچاوەکانی مێژووی یۆنان و بەتایبەتی مێژووی هیرۆدۆت یەکی بەناوی دیوکس(Deioces)ەوە هۆزو تیرەکانی ئێرانی(ئاریایی) یەك پێکرتوەو دەوڵەتێکی دروست کردووە. لەساڵی ٦١٢ی پێش زایینـدا بابلیەکان و مادەکان پێکەوە پایتەختی مەزنی ئاشووریان داگیر کردووەو ئیمپەراتۆری بەهێزی ئاشووریان لەناوبردووە. هیرودۆت مادەکان بەخەڵکانی سەربەخۆیی خوازو ئازادیخواز ناودەباو لەو باوەڕەدایە کە مادەکان لەبەرگری و خەباتدا دژی دوژمنان و ئەوانەی باجیان لێداواکردوون بە ئاسانی و بەگیانی خۆبەختکردنەوە بەرەوروویان بوونەتەوە.

لەبەرئەوەی بەڵگەنامەکانی جەنگی و سەربازی ئاشوورییەکان ناتەواوبوون، بە دواهاتنی پاشایانی ماد لەو بەڵگەنامانەدا بە دروستی باس نەکراوە. سەرچاوە یۆنانییەکان لەم رووەوە لە راستیەوە نزیکترە. هیرودۆت چوار کەس لە پاشایانی ماد بەم شێوە دەناسێنێ:١-دیۆکس(Deioces) کە سەردەمی دەستەڵاتی ئەو لە(٧٠١ بۆ ٦٥٥)ی پێش زایین بووە. ئەمە (دیائکۆ) بووە. ٢- فرائەرتس(Froartes) کە ئێمە پێی دەڵێین فرورتیش(Feavaritš) کە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو لە سەرمادەکان لە(٦٥٥ تا ٦٣٣ پ. ز) بووە.

٣- کیاکسارس(Kyaxares) کە لە(٦٣٣ تا ٥٨٤ پ. ز) پاشای مادەکان بووەو بە کیاکسار یا هووخشترە ناسراوە. چوارەم و دوا پادشای ماد لە نەخشەی هیرودۆتدا ئاستیاگس(Astyages)ی ناوبوە کە ٥٨٤ تا ٥٥٤

پێش زانین بە سەردەمی دەستەڵاتی ئەو زانراوە. ئەوەش بوترێ کە ئەم کەسە لەسەرچاوە بابلیەکاندا بە(ئیختوویگۆ) ناسراوەو پێشی وتراوە ئازیدهاگ یا ئاژیدهاك(ئەژدەهاك).

لە نەخشەیەکی دیکەدا کە لەلایەن پزیشکێکی یۆنانییەوە بەناوی کتزیاس(Ktesias)ەوە دانراوە، لە دەقی نوسراوەکەیدا ژمارەی پاشایانی مادو ناوەکانیان بە تەواوی لەگەڵ نەخشەکەی هیرودۆتدا جیاوازە. ئەم پزیشکە مێژوونووسە ژمارەی ئەوان بە دەکەس و درێژە پێدانی دەستەڵاتیان بە لەنێوان(٣١٥ تا ٤٤٠) ساڵ دەزانێ. دیودورسیسیلی Diodordasizillieu/2/32) لە دەربڕینی ئەو هەواڵانەی دەربارەی داریووشی دووەم و کوڕە جێنشینیەکەی ئەردەشیری دووەمدا وەك دیل ژیانی بەسەربردووە، بێدەنگ بووە.

وەها باس کراوە کە لەدوای گرتنی سەرزەمینی مادەکان لەلایەن پارسەکانەوە، بینای دیواری ماد(مەبەست پێ دیوارەکانی ئەکباتانە) لەلایەن بخت النصر(Nebukadnassar)ەوە دەستی پێکراوەو رادەوەستێ، لە دواییدا هەخامەنشیەکان تەواویان کردوە. دەوڵەتی ماد کە لە سەدەی هەشتەمی پێش زاییندا دامەزراوە وەك دەوڵەتی پارت کە لە ساڵی(٢٥٠پ. ز) هاتۆتە سەرکار، بە دەوڵەتی پاشایانی تیرەکان(ملوك الطوائف Foderativ) زانیوە کە لە لێکۆڵینەوە یۆنانییەکانیشدا دووبارە پشتگیری لەم بۆچوونەکراوە.

دەوڵەتی ماد وەك دەوڵەتی ئەشکانی چەند فەرمانڕوایەکی زۆری هەبووەو لە سەرەتادا هیچکام لەم دوو دەوڵەتە ناوبراوە وەك حکومەتێکی ناوەندی نەهاتوونەتە تەکایەوە. ئەوە داریووشی یەکەم(گەورە ٥٥٢- ٤٨٦ پ.ن) بووە کە رابەریی دەوڵەتێکی ناوەندی کردووە.

دەربارەی ڕێکخستنی کارگێڕی و سیستمی دیوانی دەوڵەتی ماد یەکلایی نەبۆتەوە. هەتا ئەکباتان(Ekbatana)ی ناوەندی دەستەڵاتی مادەکان بەڵگەنامەو ئاسەواری مادەکان لە دەروونی خۆیدا بشارێتەوە، ئەم گیروگرفتە هەر بەم شێوە دەمێنێتەوە.

بەشێکی زۆر لە ئاسەواری مادەکان وەك بیناو نیشانەی بیناسازی نیشانەی دی، بەمە بۆچوونی شوێنەوار ناسان لە ژێر شارەکەدا ماوەتەوە، و تا هەنووکە بە دوایدا نەگەڕاون و لێی نەکۆڵیونەتەوە.

مادەکان کە هیرودۆت موغان(Magier) بە یەکێ لە تیرە بە هێزەکانی ئەوان دەزانێ لە چەند تیرەیەکی زۆر دروست بوون. هیرودۆت پارسەکان لە رووی نەتەوایەتی و رەگەزەوە، لەرووی رەفتارو کولتوورەوە زۆر بە نزیك لە مادەکانەوە دەزانێ و هەر لەبەرئەوەشەو کە ماوەیەکی زۆر لە دوای تێشکانی مادەکان و گواستنەوەی دەستەڵات بۆ هەخامەنشییەکان هێشتا یۆنانییەکان بە حکوومەتی نوێی ئەمانیان وتووە حکوومەتی مەدیك(Medic) یا مادی. بە هۆی ئەم کەسایەتیەوە مادەکان لە حکومەتی پارسەکاندا چەند تایبەتمەندییەکیان هەبووە وەك لێخۆشبوون لە کۆکردنەوەی باج و ئەو جۆرە شتانە. هەر لەبەر ئەم هاورەگەزییەش بووە مادەکان لە حکوومەتی پارسەکاندا، شان بە شانی هەخامەنشییەکان لە کاروباری سەربازی و حکوومی و هەستیاردا بەشداربوون. لەو کارانە ئەندامێتی سەربازانی بەرەگەز ماد لە سوپای دەهەزار کەسی نەمردا بووە. زووتر وتمان کە بوونی مادەکان لە خۆرئاوای ئێراندا لە دوای بوونی میللەتانی پێش ئاریایی وەك حووریان، گۆتییان، لۆلۆبییان، کادۆسییان، میتانی و ئۆرارتوویییەکان بووەو میللەتانی ناوبراو ماوەیەکی دوورودرێژ لە پێش کۆچی ئاریاییەکاندا بۆ ئێران جێنیشتەی سەرزەمینەکانی باکوورو

باکووری خۆرئاوای ئێران بوون. ئەو شوێنەی کە لە دواییدا بەسەرزەمینی مادەکان لە خۆرئاواو باکووری خۆرئاوای ئێراندا ناسراوە، ئەم خەڵکانەیشی تێدابووە. بە هەرحاڵ کە تەماشای بۆچوونەکانی هیرۆدۆت بکرێ لە ئەکباتاناو سەرزەمینەکانی دیکەدا تێکڕا دەپارێزگا(٤٥٠ تالان زیویان) دەبەخشی بە دەوڵەتی هەخامەنشی.

## -تالانی زیو ٥٦٠٠ فرانکە-

کەل‌وپەل‌و چەکی مادەکان کە بەهۆی چاولێکەری هەخامەنشییەکانەوە لە ئارادابوون، تەنانەت پارسەکانیش هەندێ هونەری جەنگی‌و شێوازەکانی بەرگرییان لە خودی مادەکان وەرگرتبوو، ئەو شتانە لە لایەن هەمان مێژوو نووسەوە باسکرابوون. دیارە لە نەخش‌ونیگارەکانی تەختی جەمشیددا ، بە ئاشکراو بەروونی پشتگیری لە بۆچوونەکانی هیرۆدۆت دەکرێ. تەماشاکە: خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر ویلهەم ئیلرز(prof. W. Eilers)ی ئەڵمانیی ئێرانناس دەڵێ: زمانی باوی نێومادەکان لە زمانی ئێرانییانی کۆنەوە(Allpersisch) نزیکترە هەتا زمانەکانی دیکە.

بڵاوبوونەوەی زمانی مادەکان لە سنووری فەرمانڕەوایی ئەواندا دەتوانرێ بپێورێ کە بریتییە لە چەند بەشێ لە کرمانشاە، ئەسفەهان، هەمەدان، سەرانسەری کوردستان‌و بەشێ لە ئازربایجان، لوڕستان‌و تاران(رەی). شەقامەرێی بابل- ئەکباتان(بەغداد- هەمەدان) ڕێرەوێکی پڕ لە هاتووچۆو لە شەقامە گرنگەکانی سەردەمی کۆن بووە. سنووری مادەکانی لە باکووری ئاتووڕپاتکان(Athur- patakan)و لە باشووری بەشی مادی باشوورییەوە دەستنیشان کردووە. بە مادی باکووریی(ئاتروپاتن) دەوترا. بە وتەی ئیلرز شەقامەرێی بابل- ئەکباتان لە جوگرافیای سەردەمی ئەشکانی‌و ساسانیەکاندا دووبارە ناسراوەو جێگای سوود لێوەرگرتن

بووە. چەند ڕێگایەکی گەورەو بچووك لەگەڵ دژواریی تێپەڕبوون لەو ناوچە کوێستانییانەدا لە سەرانسەری سنووری مادەکاندا هەبووەو لەسەر ئەم کاروانە ڕێیانەدا ئاسایش و سەلامەتی کاروانەکان دابین کراوە.

سەرزەمینی مادەکان لە نووسراوەکانی مێژوونووس و جوگرافیا زانانی ئیسلامیدا بە ناوچەی چیاکان و لای هەندێ لە جوگرافیا زانانی عەرەب بە چیاکان(Algibal) واتە کێوو ناوچە کوێستانی یەکان، یاخود بە عێراقی عەجەم(Lraq- Agam) ناو براون و لەسەرچاوە ئایینی یەکانی ئێرانی کۆندا دەریاچەی ورمێ بە دەریاچەی چیچست(Cicest) ناسراوە.

بە تێکڕایی وادەردەکەوێ کە بەهۆی نەبوونی هەواڵ و بەڵگەنامەو دوکیۆمێنتی راستەوخۆوە، مێژووی مادەکان تا ئێستاش تاڕادەیەك تاریك و ونە، بەڵام ئەوە ئاشکراو بەڵگە نەویستەکە مادەکان بەناوی بەشێ لە خەڵکانی هیندۆ ئەڵمانی(Indogermanen) لە سنووری سەرەتای یەکەمین هەزارەی پێش زایینەوە گەیشتوونەتە بەرزاییەکانی خۆرئاواو باکووری خۆرئاوای ئێران و کەوتوونەتە ژێر رکێفی فەرمانڕەوایانی بە هێزی ناوچەیی و خۆیی ئەو شوێنانەو لە باجدەرانی ئەوان ژمێردراون و ئاژەڵ و دانەوێڵەو کشت و کاڵیان وەك باج پێشکەش کردوون، تا هێدی هێدی تواناو بڕشتیان پەیدا کردووەو خۆییەکانیان لەو ناوە راوناوە یا گوێڕایەڵی خۆیانکردوون و دەستیان بەسەریاندا رۆییووە.

هەروەك ئاماژەی بۆکرا سەلمانسەری سێیەم ئێمپەراتۆری سەردەمی ئاشووری لە ساڵی ٨٣٦ پ.ز هێرشی کرد بۆ سەرزەمینی مادو گرتی و لە ساڵی ٨٣٥ پ.ز لە نەخشەی سەرزەوییە گرتووەکانی خۆیدا دایناوە.

ئەتوانین بڵێین هەموو پاشاکانی ئاشوور بێ جیاوازی هێرشیان کردووە بۆ سەرزەمینی مادو مادەکانیان بە خەڵکانێکی یاخی ناسیون و ئەم

هێرشانەی ئاشووری تا گرتنی نەینەوا لە ساڵی(٦١٢ پ.ن) دا دەرێژەی کێشاوە. سارگونی دووەم(SargonII) کە لە ساڵی(٧٢٢- ٧٠٥ پ.ن) پاشای ئاشوورییەکان بووەو جەنگی حەڤدە ساڵەی بەهەموو توانایەکەوە لەگەڵ عیلامی‌یەکاندا رابەری کردوو، دیوکس(دیاکۆ)ی رابەری مادەکانی، کە پێدەچێ لەو سەردەمەدا یەکێ لە ئەندامانی گرنگ و بیرومەندە مەزنەکان بووبێ لە یەکگرتنی ماننا کاندا(Manna- Allianz) دەستگیردەکاو بۆ سووریا(شام) دووری دەخاتەوە. وەك لە هەواڵی یۆنانییەکاندا هاتووە، بەهۆی تکاکردن و داخوازی سەرانی تیرەکانی مادەوە دیائکۆ لەگەڵ بەڵێندان لەلایەن سارگونەوە لە دیلی ئازاد دەکرێ و درێژە بە رابەریی مادەکان دەدا.

دیائاکۆ لە یەکیەتی ماننا کاندا ئەندامێکی کاریگەربووەو لەگەڵ ئۆرارتوویی‌یەکان و میللەتانی دیکەی بەرهەڵستی ئاشووریەکی گرتبوو. هەندێ ئەو بە بیرمەندی سەربازیی لەم یەکیەتییەدا دەزانن. ئەو دامەزرێنەری دەوڵەتی مادە.

کوڕەکەی ئەو فرورتیش(Khšathrit- phyaortes)بەکۆمەکی یەکگرتوانی خۆی واتە پارسییان و کیمیریان، چەند ناوچەیەکی لە سنووری ئاشوورییەکان ئابلۆوقەدا، وەلێ لەلایەن سکایانەوە(skythen) کە دەگەڵ ئاشوورییەکاندا یەکیان گرتبوو بە سەختی تێکشکا. پارسیان و کیمیریان کە چەند ناوچەیەکیان لە سنووری ئاشوورییەکان ئابلۆوقەدابوو، ئەمانیش بە هاوپەیمانی مادو دوژمنانی ئاشوور ناسران.

دیارە ئاشوورییەکانیش لە پێشڕەوی سکایانی هێرشبەر لە نیوەکانی یەکەم و دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لە سنووری خۆیاندا بە پارێزراوی نەماونەوە.

لەساڵی(٦٣٣ پ.ز)دا فرورتیشی دووەمی پاشای ماد لەلایەن ئاشووربانی پاڵەوە، لە جەنگێکی سامناکدا دەستگیر دەکرێ و دەکوژرێ و کوڕەکەی هووخشترە(Huvakhšthra) یا کیاکسار(Kyaxares) بە نوێکردنەوەی بنیادی سوپای مادو وەرگرتنی هونەرە جەنگییەکانی نوێ و راهێنانی تیرهاوێژان و سوارەی سوپا لەسەر بنچینەی شێوەی باو لای سکاکان هەڵدەسێ و لەگەڵ نەبوپۆلاسار(Nebupolassar) فەرمانڕەوای کلدانی رەگەزی بابل دۆستایەتی دەکەوێتە نێوانیانەوە و دژی دەوڵەتی بە توانای ئاشوور یەکدەگرن.

لەنێوان ساڵانی(٦١٦ تا ٦٠٨)ی پێش زایین سوپای بە هێزو تائەو کاتە شکست نەخواردووی ئاشوور بە هۆی چەند هێرشێکی سەرسەختانەی سوپای لێهاتووی مادەوە کە لەلایەن بابلیەکانەوە کۆمەکی دارایی دەکران لەناوچوو(بڕوانە دەقەکان- باسی سیاسەتی سوپایی پاشایانی ماد) شای سەرکەوتووی ماد لە دوای ئەم سەرکەوتنە مەزنە کە هەموو هاوکێشەکانی رامیاری و سەربازی لە سەدەی حەوتی پێش زایین لەناوچەکەدا گۆڕی، ئەمجارەیان روویکردە خۆرئاوای سەرزەمینی مادو باکووری خۆرئاوای ئێران و لەگەڵ ئالیات(Allyattes)ی پاشای لیدی کەسەر زەمینێکی دەوڵەمەندی باکووری خۆرئاوای ئێران بوو کەوتە جەنگەوە، لەئەنجامی ئەم جەنگە بێهوودەدا خۆرگیرانێ (Sonnen Finsternis) روویدا کەتالس (Thalis)ی فەیلەسووف و بیرکاریزان و ئەستێرەناس و ئەندازیاری سوپایی سەدەی حەوتەمی پێش زایین، کەلە خزمەتی پاشای لیدیدا بو، ئەو خۆرگرتنەی وەك بۆچونی پیاوانی ئایینی پەرستگاکانی لیدی بەئەنجامی تووڕەبوونی خودایان زانی و لەساڵی (٥٨٥)ی پێش زایین بەهۆی ناوبژی بابیللەکانەوە کۆتاییان بەم جەنگە بێهودەو بێ ئاکامە هێناو روباری هالیس

(Halys) بەناوی سنووری هاوبەش دەوڵەتی مادو سەرزەمینی لیدی دیاریکراوەو بەهۆی مێردکردنی ئارینیس (Ariyenis)ی کچی ئالیات بە ئاستیاگی کوڕی کیاکساری پاشای ماد کەلەو کاتەدا جێنشینی تەختی پاشایی بووە، هەروەها بەهۆی خواستنی ئامی تیس (Amytis) کچی کیاکساری شای ماد لەلایەن نەبووکەدنەسر (بخت النصر)ی جێنشینی تەختی بابلەوە، ئەم پەیمانی ئاشتییە بەهێز بوو، بەپێی ئەو باسانەی کە زۆربەیان سەرچاوەیەکی یۆنانییان هەیە نەبوونید (Nebonid)ی شای بابل لەپەرەسەندنی دەستەڵاتی مادەکان ترسا و ئەو دەوڵەتەی کەلەسەردەمێکدا بەدیارترین هاوپەیمانی بابلیەکان دەژمێردرا، بوو بەنیشانەی تیر هاویشتن و پلانەکانی نەبوونید.

نەبوونید لەکوروشی دووەمی شازادەی ئێران (٥٥٩-٥٢٩پ.ن) کەلەو سەردەمەدا پاشای هەخامەنیشی بوە، داوای کۆمەکی کردوەو کوروش دوای داگیرکردنی سەرزەمینی مادەکان لەساڵی (٥٥٩)ی پێش زاییندا، لەساڵی (٥٣٩)ی پێش زاییندا سەرزەمینی بابلیش دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. وتراوەکە لەو ماوەدا، واتە لەتێشکانی دەوڵەتی مادو دەستگرتن بەسەر ئیمپەراتۆری بابلدا، کورشی مەزن لەساڵی (٥٤٦)ی پێش زایندا بەزاڵبوون بەسەر کروزویس (Kroisos)ی شای لیدیدا کەکوڕو جێنشینی ئالیات بوە، ئەو سەرزەمینە دەوڵەمەندەی کەوتە ژێر دەست و بوو بەپاشکۆی ئێمپەراتۆرییەتی ئەو.

کوروش گەنجینەکانی شاری (سارد) کەپایتەختی لیدی بووە دەخاتە ژێر دەستی خۆیەوە(١)و ئەوەی لەم جەنگەدا لەسامان و دەستکەوتەکانی جەنگ کەوتە ژێر دەستی بۆ گرتنی بابل بەکاری هێنا، وتراوە کە کوروش نیازی گرتنی میسریشی هەبووە، وەڵێ لەساڵێ (٥٢٩)ی پێش زاییندا

بەدەستی ماساژستەکان (Massagestten) کەتیرەیەك لەسکاکان بوو، لەجەنگێکی سامناکدا کوژراو (کەمبووجیە)ی دووەم کورو جێنشینی کوروش بەهەمان کەرەسە ئامادەییەوە میسری داگیر کرد.

# راڤەی چەند وشەیەك بە پێنووسی وەرگێر

١. ئــاری (ئاریــا): گرنگــترین لکــی رەگــەزی ســپی پێســـتن. میللــەتێکن کەلەســـەرەتاوە بەشــێوە ژیــانی دەشـــتەکی لـــەباکووری دەشـــتە بـــەربلاوو بـــەرزەکانی ئـــێراندا لـــەهاتووچۆدابوون، ســێ هـــەزار ســـاڵ پێـــش زایـــین روویانکردۆتە باشوور، برێ لەو ئارییانە بەرەو هیند ملیان ناوەو برێکی دیکەیان هەر لەدەشتەکانی ئێراندا جێگیربوون.

ژمارەیەکیشیان بەرەو یۆنان و ئەوروپای باشوورو سەرزەمینی ئەڵمان و ئەوروپای باکوور رێیان گرتۆتە بەر، ئەوانە بە باوە گەورەی ئێرانییەکان، هیندی و یۆنانی و رۆمی و زۆربەی نەتەوەکانی ئەوروپا و ئەمەریکای ئەمرۆ دەژمێردرێن.

ئەو زمانانەی کە لەزمانی ئارییەوە وەرگیراون، بریتیین لە ئاوێستا سەنسکریت، پەهلەوی، فارسی، کوردی، یۆنانی، لاتینی، ئەڵمانی، سلاڤی.

هەموو شێوە زمانەکانی ئەوروپا بێجگە لە فنلاندی و مەجەری و تورکی هەر هەموویان لەخانەوادەی ئارياییین (بروانە فەرهەنگی عەمیدی فارسی).

٢. بان ئێران ( پشتەی ئێران ) وەرگێردراوی وشەی (فەلات)ەکە بەواتای بیابان، دەشتی بەرفراوان لەشوێنە بەرزەکاندا هاتووە.

٣. جەیحوون: ئەموو دەریا (Amou- daria) روبارێکە لەچیاکانی پامیر لەهیند هەڵدەقوڵێ و بەئاسیای سۆڤێتیدا تێدەپەرێ و دەرژێتە دەریای ئاراڵەوە، درێژییەکەی ٢٥٤٠ کم دەبێ، لەمێژدا ئۆکسووس بوە.

٤. هیندوکوش: چەند بەرزاییەکە لەئاسیای ناوەراست، لەباکووری ئەفغانستاندا کەپەیوەستن بەکێوەکانی پامیرەوە.

٥. **پەنجاب ( پێنج ئاو )**: ویلایەتێکە لەئاسیادا کە هیندو پاکستاو لەنێو خۆیاندا بەشیان کردووە.

٦. **سیند ( هیندۆس )**: روبارێکە لەتبت هەڵدەقوڵێ‌و بە هیندو پاکستاندا تێدەپەڕێ‌و دەڕژێتە دەریای عومانەوە.

شارستانییەکی گەورە لەسەر کەنارەکانی ئەم رووبارە لەهەزارەی سێیەم‌و دووەمی پێش زاییندا هەبووە.

٧. **هیرو دۆت ( هیرودۆتس** Hreodotos-٢٤٨٤-٢٤٢٥پ.ن) مێژوو نووس‌و گەڕیدەیەکی یۆنانییە، نازناوی (باوکی مێژوو)ی پێدراوە، جیهانی ئەو سەردەمە گەڕاوە، بەتایبەتی عیراق‌و فینیقیا‌و میسر، ئەوەی ئەو لەمێژوودا نووسیویەتی گرنگترین سەرچاوەیە بۆ زانینی باس‌و هەواڵی نەتەوە دێرینەکان‌و ئەفسانەکانیان.

*تێبینی:* سەرچاوەی راڤەکردنی ئەم چەند خاڵەی دوایی (المنجد فی الاعلام)ە.

وەرگێڕ

# پەراوێزەکان

١. هندی یا(Inder)ناونیشانێکە کەسەرچاوە هاوبەشەکانی یۆنانی-ڕۆمی و ئێرانی بۆ هیندییەکانیان بەکارهێناوە.

٢. ودا(Vada ) بەواتای زانست و ئاگابوونە.

٣. ناوی حووریان لەحوور کە بەواتای خۆرە وەرگیراوە.

٤. کەمبوجیە لەساڵی ٥٢٥پ.ز میسری گرتوە.

٥. پەیوەندی ئابووری و فەرهەنگی لەنێوان سۆمەرو میسردا هەبوە.

٦. بە یۆنانی(Magoy)لە ریشەی (ماگوس) بەواتای جادووگەر وەرگیراوە.

٧. ناوی کۆنی(ئەکەد) Agada ئاگا دەبوە.

٨. مەبەست لە خوراسیانی کۆن چەند میللەتێکە کە ماساگتەنیش (Massagetten) دەگرێتەوە.

# سەرچاوەكان


*Randa A.(Hrsg) Wb.d . Weltgeschichte, Bd.S. :274.*
*Brandnstein,W.:A.a.o.S.114,88.*
*Wolff. Fr. Avesta.S.317.*
*Barr.k: A.a.o.S.265,273,*

خدادیان ١. اعتقادات آریائیهای باستان، ص١٠٤

*5. Reichelt, H,:Aw.Eb,S. 6,7.*
*6. Wolff, F.: A.a.o.317+ Freyer, H.: Wg. Europas+ S.26,29, siehe:*
*7. Ploetz: A.a.o.804,79.*
*8. Lullubu. S.ploetz, k: A.a.o.104.*
*9. Duchesne Guillimin, a.a.o.10 + Barr, a.a.o.274.*
*10. Talisman*

خدادیان: اعتقادات آریائیها ص ١٠٩، ١١٠، ١١١

ص ،بساتک نامه :اینیربا٦٥ ص مکب دلج نادلبلا مجعم یوحه توقای زا لقنهب ٧١٤

مسعودی مروج الذهب جلد بکم ص٥.

*RGG. Lll, 877.*

ص .یلعنیسح زا ناطباسمهاب ملایع طباور خیرات هب یرظن٢

عومجم ،ناتساب ناریا :نسح ،اینیربة جیبی جلد بکم. تاریخ مشرق قدیم، ص ٨٥١.

یرشمن: ایران از اغازتا اسلام، ص ٧٤و٨٤.

نگاه کنید به دیاکونف ماد، ص ٢١٠تا٣١٠ +

*Ghirschman. R. Iran. 1.(Protoiranier, Meder+ Achamediden) S48-85.*

ونف، تاریخ ماد، ل٢٤١-٤٤١ .

